# دەرمانخانەی ئەفلاتون










جاك دريدا

لەعەرەبییەوە: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل

Platos




لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی فێربوون
ژمارە (١٦)

ناوی کتێب: دەرمانخانەی ئەفلاتون
ناوی کتێب بەفەڕەنسی: La Pharmacie de Platon
ناوی کتێب بەعەرەبی: صيدلية افلاطون
ناوی نووسەر: جاك دريدا
وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: كاظم جهاد
وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل
تایپ: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل
نەخشەسازی و بەرگ: جمعە صديق كاكە
چاپخانە:
تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٧٢٠)ی ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە.

## پێشەکی

دەرمانخانەی ئەفلاتون، شۆڕبوونەوەیە بەنێو قووڵایی مێژووی هزرو فەلسەفەی یۆنانی، خوێندنەوەیەکی تازەیە بۆ فەلسەفەو تێزێکی فەلسەفی کۆن کە زیاتر لەدوو هەزارو پێنج سەد ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە. بەرهەمهێنانی تێگەیشتنێکی تازەیە بۆ کۆمەڵێك بۆچوونی ئەفلاتونی لەبارەی کێشەی نێوان نووسین و ئاخافتن، بەرز ڕاگرتنی ئاخافتن و بەکەم سەیرکردنی نووسین و نووسەران.

بەبۆچوونی خۆیشم وەکو وەرگێڕی ئەم کتێبە بۆ سەر زمانی خۆشەویست و شیرینی کوردی، بەشێکی زۆری گرنگی ئەم کتێبە، لەم گەڕانەوەو خوێندنەوە تازەیەیە بۆ میتۆلۆژیاکانی میسری کۆنی، بەتایبەتیش میتۆلۆژیای تووت لەبارەی داهێنان و بەرهەمهێنانی یەکەمین پیت و شێوازی نووسینی هیرۆگلیفی میسری و، چۆنییەتی ڕوانینی ئەفلاتون بۆ ئەم داهێنانەو شێوازی گێڕانەوەو پێشکەشکردنی لەنێو هزرو فەلسەفەی یۆنانی کۆندا.

پێم وابێت، ئەم کتێبە، جگە لەوەی شایانی خوێندنەوەو تێڕامانە، لەوەش زیاتر، شایانی توێژینەوەی زۆر زیاترە لەلایەن ئێمەوە، تاوەکو لەلایەك لەشێوازو میکانیزمی هەڵوەشاندنەوەی دریدایی تێبگەین، لەلایەکی تریش بۆ ئەوەی بتوانین سوود لەم میتۆدو ڕێبازە فەلسەفی و ئەدەبییانە وەربگرین کە لەسەرتاسەری جیهاندا بڵاوبوونەتەوەو ئێمەش بەهۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای سەردەم، بووینەتە بەشێك لێیان.

بەم کتێبەی بەردەستمان، ئەوە پێنجەمین کتێبە لەبارەی جاك دریداو ستراتیژییەتی هەڵوەشاندنەوە کە لەماوەی (١٥) ساڵی ڕابردوودا کارم لەسەر کردبێت و تەواوم کردبێت. سێ لەم کتێبانە وەرگێڕان بوون، ئەوەی ئێستاشی هاتە سەر، یەکێکیش لەم کتێبانە نووسین بوو. بێگومان هێشتا چەند کتێبێکی تریش ماون، بەتایبەتیش یەکێك لەم کتێبانەی کەنووسینن و توێژینەوەیەکی درێژەو تەواویش بووە، تایبەتە بەخوێندنەوەی دریدا بۆ ئێستاتیکای کانت. بەو مانایەی دەمەوێت ڕۆشنگەری و هەڵوەشاندنەوە بەکاربێنم بۆ بەرهەمهێنانی ڕوانگەی تازە بۆ خۆم، وەکو چۆن دریدا گەڕایەوە بۆ یۆنان و ئەفلاتون تاوەکو بتوانێت چرکەساتێکی مێژوویی گرنگ دەسگیر بکات. دیارە ئەوە کۆتایی کتێبەکانم نییە لەبارەی هەڵوەشاندنەوەو جاك دریدا بەگشتی، چونکە هێشتا توێژینەوەی ترم ماوەو کارم لەسەر کردوون، یا ئەوەتا دەرفەتم نییە بەچاپیان بگەیەنم، یانیش هێشتا لێیان ڕازی نیم و بەتەواویان نابینم تاوەکو چاپیان بکەم، بەڵام بێگومان کتێبی زۆرو، کاری زۆرم ماوە لەم بوارەدا، هیوادارم لەدواجاردا بتوانم خزمەتێکی بچووکم بەڕۆشنبیری کوردی کردبێت و، ئەوەش دەزانم خوێنەری کورد وەکو هەر خوێنەرێکی تر، شایانی دەقی جوان و گرنگن.

ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل

٢٠١٥/٨/١١ کۆلن، ئەڵمانیا

# بەشی یەکەم

## جاك دریدا، ژیان و فەلسەفە[1]

---

1) ئەم بەشەم بۆ کتێبەکە زیاد کردووە لەبەر گرنگی ناسینی جاك دریدا، ئەگینا خۆی لەنێو دەقی ئەسڵی کتێبەکەدا نییە.

جاك دریدا بەڕەگەز فەڕەنسییەو، لەخێزانێکی جوولەکە لەساڵی (١٩٣٠) لەشاری (بیار)ی جەزائیری لەدایکبووە. ماوەی منداڵی و لاوێتی لەو وڵاتەدا بەسەر بردووەو، بۆ یەکەمجار لەسەر خاکی جەزائیردا هەستی بەخۆی کردووەو وشیارییەکەی سەری هەڵداوەو هاتۆتە بوون.

سەرەڕای نا ئامادەگی ڕەچەڵەکە جەزائیرییەکەی کە ئەو بەردەوام وەکو فەلسەفەکارێکی فەڕەنسی دەرکەوتووە، بەڵام هەر پێی وابووە جەزائیر بەشێکی گرنگ لەناسنامەی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی ئەو پێکدێنێت، چونکە شوێنی لەدایکبوونی بووە.[1] لەم ماوەیەی ژیانیدا لەقوتابخانەی سەرەتایی، دریدا کێشەی زۆری هەبووەو خۆیشی لەدیداریکدا کە لەگەڵ بێرنارد فرانس ئەجامیداوەو لەساڵی (١٩٨٩) دا لەپاریس بڵاوکراوەتەوە لەژێر ناوی (دەفتەرە بێداگۆجییەکان)، بەڕوونی ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە قوتابخانە لەم قۆناغەدا بۆ ئەم، وەکو جەهەننەمێك وابووەو قوتابییەکی زۆر پەشۆکاوو بێ هیوا بووەو کێشەی زۆری هەبووە لەنێو قوتابخانەدا، ئەگەرچی وەکو کەس خۆی قوتابییەکی زیرەك و بەتواناش بووە.[2] ئەوەی وایکردووە دریدا ئەوەندە پەشۆکاوبێت، ئەو هەموو



---

[1] جاك دریدا، وتووێژ، لەعەرەبییەوە: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، دەزگای موکریانی، هەولێر، چاپی یەکەم، ٢٠١١، ل١٢.

[2] http://www.alefyaa.com/?p=15996.

توندوتیژییە بووە کە لەنێو قوتابخانەو کۆمەڵگەی جەزائیری ئەم کاتدا هەبوو، کۆمەڵگەیەك سەرتاپای ڕق و قینەو توندوتیژی کۆمەڵایەتی و مەزهەبی و ئایینی و سیاسی بوو لەژێر دەسەڵاتی فەرەنسیدا.

دوای بەدەستهێنانی بڕوانامەی سەرەتایی لەشاری بیار، دریدا دووچاری کێشەیەکەی تر دێت کە پێوەندی بەناسنامەی ئایینییەوە هەیە وەکو منداڵێکی یەهودی، کاتێك حکومەتی جەزائیری ــ فەرەنسی لەجەزائیر، ڕێگای پێنادەن بچێتەوە بەرخوێندن لەقوتابخانەی ناوەندی، بەو سیفەتەی کە یەهودییە، ئەوەش دووچاری شۆکێکی تری دەکات لەبارەی هەستکردن بەناسنامەو ژیان لەوڵاتێك کە لەیەك کاتدا هەمو وڵاتی خۆیەتی، هەمیش وڵاتێکە لەلایەن وڵاتەکەی خۆیەوە داگیرکراوە.[1] بەڵام دواتر بەهەر شێوەیەك بێت ئەم قەدەغەیەی لەسەر لادەبرێت و هەر لەشاری بیار، چۆتە قوتابخانەیەکی ناوەندی و هەر لەو شارەدا ئەویشی تەواو کردووە لەنێو بارودۆخی ئەو کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا فێری زۆر شت بوو، چونکە ئەو کاتەش هێشتا جەزائیر وەکو کۆلۆنیالییەکی فەرەنسی بە بەشێك لەفەرەنسا دادەنرا.

لەساڵی (١٩٤٨)دا بڕوانامەی بەکالۆریۆس بەدەست دێنێت، دوای ئەوەی بەهۆی تەمبەڵی و نەخوێندن و سەرکێشی گەنجێتی ساڵێك لەقوتابخانە دەرکراو، لەساڵی یەکەمی بەکالۆریاشدا سەرکەتوو نەبوو. لەو کاتانەشدا وەکو هەر گەنجێکی تر زۆرتر خولیای شیعرو ئەدەبیات بووەو، هەندێك بەرهەمی شیعری

١) http://www.aldohamagazine.com/article

لەسەر لاپەڕەی گۆڤارو ڕۆژنامەکانی مەغریبی عەرەبیدا، بەزمانی فەڕەنسی بڵاوکردۆتەوە.[1]

ئەو لەکاتێکدا کە خۆی بۆ پێشبرکێی قوتابخانەی باڵا ئامادە دەکرد تاوەکو درێژە بەخوێندن بدات، هاتە سەر کتێبە هزرییەکانی ئەو کاتەی دونیاو، کامۆو ڤالێری و ئەندرێ جیدو نیچەو ڕۆسۆی دەخوێندەوە، دواتریش کاتێك بەقووڵی ڕۆچووە نێو خوێندنەوەی فەلسەفە، بایەخێکی تایبەتی بەخوێندنەوەی کیرکیگاردا.

دریدا بۆ تەواوکردنی خوێندن لەپاریس، لەساڵی (١٩٤٩) جەزائیر جێدەهێڵێت و لەقوتابخانەی باڵای لویس لۆگراند خوێندنی ئەکادیمی تەواو دەکات، هەر لەوێشدا ئاشنایەتی لەگەڵ پییر بۆردیۆو مۆنۆری و زۆرێك لەڕۆشنبیرانی ئەو کاتی فەڕەنسا پەیدا دەکات و باشتر دێتە نێو کولتووری ڕۆشنبیری فەڕەنسییەوە. لەساڵی (١٩٥٣) بڕوانامەی لیسانسی ئەدەب و لیسانسی فەلسەفە لەزانکۆی سۆربۆن بەدەست دێنێت. هەروەها بڕوانامەیەکی تریش لەئەتنۆلۆژیا بەدەست دێنێت، ئەوە جگە لەدبلۆمی خوێندنی باڵا کە توێژینەوەکەی لەبارەی کێشەی پێشڤەچوونی فەلسەفەیە لەلای هۆسرل و، دوای دەرچوونی سەرقاڵی گوتنەوەی وانەی فەلسەفە دەبێت.

دوای تەواوکردنی خوێندنی باڵا، ئاشنایەتی لەگەڵ ئەلتۆسێر پەیدا دەکات کە ئەویش هەر لەجەزائیر لەدایکبووەو دەبێتە ئەندامی کۆمەڵەیەکی توندڕەوی

---

[1] ) جاك دریداو هەڵوەشاندنەوە، ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، ٢٠١٠، ل١٢.

چەپی گەنجانە بەناوی تێل کێل و دەبێتە هاوڕێی پۆل ڕیکۆر.[1]

لەساڵی (١٩٥٦)دا بەشداری پێشبڕکێی ئەگریگاسیۆن دەکات لەفەڕەنساو پێشبڕکێیەکە دەباتەوەو یارمەتییەکی ماددی لەلایەن زانکۆی هارڤاردی ئەمریکی پێدەدرێت بۆ ئەوەی بتوانێت درێژە بەخوێندنی ئەکادیمی بدات لەئەمریکا، هەر ئەو ساڵەش خاتوو مارگرێت ئۆکتێر وەکو هاوسەری ژیانی دەستنیشان دەکات.

لەنێوانی ساڵانی (١٩٥٧ ـ ١٩٥٩)دا جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ جەزائیر، بەڵام ئەوجارەیان بەجلی سەربازییەوە تاوەکو خزمەتی سەربازی لەوێدا تەواو بکات، بەهۆی بڕوانامەکەشییەوە وەکو سەربازێك وانەی ئینگلیزی و فەڕەنسی لەهەندێك قوتابخانەی جەزائیریدا گووتوەتەوەو، ئەو جارەیان زۆرتر لەواقیعی جەزائیری نزیك دەکەوێتەوەو، لەو سیاستە کۆلۆنیالییەی فەڕەنسا تێدەگات کە لەجەزائیردا پێڕەو دەکرێت، ئەوەش کاریگەری زۆری دەبێت لەسەری، بۆیە دواتر لەپاڵ کۆمەڵێك ڕۆشنبیری فەڕەنسی داوا لەحکومەتەکەیان دەکەن دەست لەجەزائیر هەڵبگرێت و پاڵپشتی لەسەربەخۆیی جەزائیر دەکات.[2]

---

١) تیل کێل ـ Tel Quel گرووپێکی ئەدەبی و هزری و ڕەخنەیی فەڕەنسی بوو، سەرەتا گۆڤارێك بوو لەساڵی (١٩٦٠) لەفەڕنسا لەسەردەستی فیلیپ سۆلێرس دامەزراو بانگەشەی بۆ ڕەخنەی نوێ دەکرد کە لەماوەی نێوان ساڵانی (١٩٦٨ ـ ١٩٦٩) دا گەیشتە لووتکەی کاریگەری و ناوداری خۆی، ئەوەش لەمیانەی بڵاوکردنەوەی دوو بڵاوکەرەوەی کاریگەری خۆیان بەناوی (تیۆری کۆمەڵ) کە لەلایەن هەریەك لە (میشێل فوکۆو ڕۆلان بارت و جاك دریداو فیلیپ سۆلێرس و جولیا کریستیڤا) نووسرابوو. بڵاوکراوەی دووەمیان لەلایەن جولیا کریستیڤا بڵاوکرایەوە بەناوی (سیمیۆتکیا).

٢) جاك دریداو هەڵوەشاندنەوە، ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، ٢٠١٠، ل١٢.

دریدا لەساڵی (١٩٥٩)دا کاتێك تەمەنی دەگاتە (٢٩) ساڵ دوای تەواوکردنی خزمەتی سەربازی لەجەزائیر، دەگەڕێتەوە بۆ فەڕەنساو دەست بەخوێندن دەکاتەوەو لەساڵی (١٩٦٢) خەلاتی جان کافیێ بەدەست دێنێت بەلێکۆڵینەوەیەك لەبارەی بنەچەی ئەندازە لەلای هۆسرل کە دواتر وەکو کتێب بلاوی دەکاتەوە.

لەساڵی (١٩٦٧) بڕوانامەی دکتۆرای ئەلقەی سێیەم لەفەلسەفە بەدەست دێنێت و، لەو ڕۆژە بەدواوە جیێ پەنجەی خۆی دەخاتە سەر ڕەوت و بیرکردنەوەو ژیانی کۆمەڵگەی فەڕەنسی شەیدا بەمۆدێلی هزرو فەلسەفەی نویێ.[1] لەگەڵ ئەوەشدا دووچاری ناکۆکی و دژایەتی زۆر دەبێتەوە لەنێوەندی ئەکادیمی و زانکۆییدا، بۆیە ڕوو دەکاتە ئەمریکاو لەوێدا بۆچوون و تێزەکانی خۆی بلاودەکاتەوەو سەرنجی کۆمەڵگەی ئەمریکی بۆ خۆی ڕادەکێشێت.

جاك دریدا کتێبی زۆری نووسیوەو وانەی زۆریشی لەزانکۆکانی ئەورووپاو ئەمریکا پێشکەشکردووەو، پلەو پایەی مەعنەوی زۆریشی پێدراوەو، (١٣) جاریش دکتۆرای فەخری پێدراوە لەلایەن زانکۆکانی جیهان. هەروەها یەکێك بووە لەو کەسانەی ڕۆڵی سەرەکی هەبووە لەبەڕێوەبردنی توێژینەوەکانی نێو پەیمانگای فەلسەفەو زانستە کۆمەلایەتییەکانی پاریس لەساڵی (١٩٨٧)دا. هەروەها چەندین مەدالیای خەلاتی شانازی پێدراوە بەناوی سوارچاك و سێرجێنت و ڕابەر لەنێو

---

١) دریدا، فەلسەفەکاری هەڵوەشاندنەوەگەرایی، ڕێبین ڕەسول ئیسماعیل، برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (١٨١).

بـواری هـزرو ئـەدەب و هونـەردا.[1] تەنانـەت كاتێـك زانكـۆی زانكـۆی كـامبردیجی بـەریتانی ویسـتی لەسـاڵی (١٩٩٢) بڕوانامـەی دكتـۆرای فـەخری پـێ ببەخشـێت، كێشەیەك و دەنگۆی زۆری نایەوە چەندین پرۆفیسۆرو نووسەر داوایان لەم زانكۆیە كرد ئەم خەڵاتە ڕبگرێت و پێی نەبەخشێت، چونكە پێیـان وابـوو تێزەكـانی دریـدا بۆتە هۆی لەباربردنی ئەفسانەی لۆگۆسێنتڕالیزمی ئەوروپی، بۆیە دەبینین د. دۆنز مامۆستای ئەم زانكۆیە كە ئەم پێشنیارەی خستبووە بەردەم سەرۆكایەتی زانكـۆ، بەناچاری پەنای بردە بەر پەرلەمانی بەریتانی تاوەكو ئەمان بڕیـار بـدەن كـە ئایـا دریدا شایانی ئەم خەڵاتەیە، ئان شایانی نییەو دەنگـی لەسـەر بـدەن لـەنێو هـۆڵی پەرلەماندا.[2]

دریدا یەكەم كتێبـی خـۆی لـەژێر نـاوی (بنەچـەی ئەنـدازە) لەسـاڵی (١٩٦٢)دا بڵاوكردۆتــەوەو نزیكــەی (١٧٠) لاپەڕەیــەو تایبەتــە بەبنەچــەی ئەنــدازە لــەلای فەلسەفەكاری ئەڵمانی ئەدمۆند هۆسرل و لەپێشـبركێیەكی فەلسـەفیدا لەفەڕەنسـا پلەی یەكەمی بەدەستهێناوە.[3] لەسـاڵی (١٩٦٣) دریـدا لێكۆڵینەوەیـەكی بـەناوی (هێزو دەلالەت) بڵاوكـردەوە، ئـەو لێكۆڵینەوەیـە تایبـەت بـوو بەڕەخنـەگرتن لـەو بونیادگەرییەی كە جاك ڕۆسێ بانگەشەی بۆ دەكرد، دواتر وەكو بەشـێك لـەكتێبی (نووســین و جیــاوازی) بڵاوكرایــەوە. لەهــەمان ســاڵدا، دریــدا لەكۆنگرەیــەكی

---

١) جاك دریداو هەڵوەشاندنەوە، ڕێبین ڕەسـوڵ ئیسـماعیل، چـاپ و بڵاوكردنـەوەی سـلێمانی، وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەكەم، ٢٠١٠، لـ١٤.

٢) http://www.alketaba.com

٣) البنيوية وما بعدها، جون ستروك، ترجمة: محمد عصفور، الكويت، ١٩٩٦، ص٢١٠.

فەلسـەفیدا لێکۆڵینەوەیـەکی خوێنـدەوە بـەناوی (کۆجیتـۆو میتـۆدی شـێتی) دواتـریش لـەگۆڤاری کرنۆلۆژیـای میتـافیزیکی و ئـەخلاقی ژمـارە (٣) دا ئـەو توێژینەوەیەی بڵاوکردەوە.

لەساڵی (١٩٦٦) جاك دریدا لێکۆڵینەوە هەرە ناودارەکەی خۆی بڵاوکردەوە کە بەناوی (بونیـاد، هێمـا، وازیکـردن لـەنێو گوتـاری زانسـتە مرۆڤایەتییـەکان) بـوو، ئەوەش لەنێو کۆنگرەیەکی فەلسەفی کە زانکۆی جۆن هۆپکنزی ئـەمریکی سـازی کردبـوو و تایبـەت بـوو بـەزمانی ڕەخنـەو زانسـتە مرۆڤایەتییـەکان، بەتایبـەتیش ڕەخنـەگرتن لـەو بونیادگەرییـەی کلـۆد لیڤـی شـتراوس بانگەشـەی بـۆ دەکـردو، دواتریش وەکو بەشێك لەنێو کتێبی (نووسین و جیاوای)دا بڵاوکرایەوە.[1]

لەسـاڵی (١٩٦٧) جـاك دریـدا بـەهێزێکی زۆرەوە هاتـە سـەر گۆڕەپـانی هـزری فەڕەنسی و ئەوروپی و ئەمریکی و بەیـەکجار سـێ کتێبی بڵاوکـردەوە، یەکـەمیان یەکێکـە لەکتێبـە هـەرە بەناوبانگـەکانی و بەڕایـەڵی سـەرەکی سـتراتیژییەتی هەڵوەشاندنەوە دادەنرێت کە بەناوی (گراماتۆلۆژیا) یە، کتێبی دووەمیـان بـەناوی (نووسین و جیاوازی) بوو کـە تـاوەکو ئێسـتاش یەکێکـە لەکتێبـە گرنگـەکانی ئـەو سـەردەمەو بـەبێ تێگەیشـتن لـەو کتێبـە، ناکرێـت لەدریـداو سـتراتیژییەتی هەڵوەشاندنەوەکەی تێبگەین، کتێبی سێیەمیان بەناوی (دەنگ و دیـاردە) بـوو.[2]
کتێبـی نووسـین و جیـاوازی بەیـەکێك لەکتێبـە هـەرە ناودارەکـانی جـاك دریـدا، تەنانـەت دەتـوانین بڵـێین یەکێکـە لەکتێبـە هـەرە ناودارەکـانی نیـوەی دووەمـی

---

١) النقد الكراماتلوجي للعمليات اليمولوجية، علي بدر، مجلة الأقلام، عدد (٥ ـ ٦)، ص٥١.
٢) البنيوية وما بعدها، جون ستروك، ترجمة: محمد عصفور، الكويت، ١٩٩٦، ص٢١٢.

سەدەی بیستەم و تا ئێستاش بەهاو بایەخی خۆی هەیە.[1]

لەساڵی (١٩٧٢) کتێبی (هەڵوێست)ی بڵاوکردەوە کە بریتی بوو لەڕەخنەیەکی توند لەسیمیۆلۆژیاو ئەوەی تێدا ڕاگەیان کە سیمیۆلۆژیا ڕۆڵی خۆی لەدەستداوەو چیتر ناتوانێت ئەو ڕۆڵە بگێڕێت کە سۆسێر پێیدا بوو، بۆیە لەوە بەدواوە گراماتۆلۆژیا ڕۆڵی سیمۆلۆژیا دەگێڕێت، ئەو بۆچوونەی خۆیشی لەمیانەی دیالۆگێکی وەهمیدا لەگەڵ خاتوو جولیا کریستیڤادا خستە ڕوو دواتریش لەنێو کتێبی (شوێنگەکان) دا بڵاوی کردەوە کە بریتی بوو لەکۆمەڵێك دیداری فەلسەفی.[2]

هەر لەهەمان ساڵدا، جاك دریدا کتێبی (پەراوێزەکانی فەلسەفە) ی بڵاوکردەوە، لەو کتێبەشدا ڕەخنە لەچەمکە زمانەوانییەکانی هەریەك لەڕۆسۆو کۆندیاك و سۆسێر دەگرێت و ستراتیژییەتێکی تازەی ڕەخنەی زمانەوانی ڕادەگەیەنێت. ئەو کتێبە لەیازدە وتار پێکدێت لەنێویاندا وتارێکی نیمچە درێژ هەیە لەژێر ناوی (میتۆلۆژیای سپی) کە لەبنەڕەتدا لەساڵی (١٩٧١) دا نووسراوەو تێیدا قسە لەبارەی شوێنگەخوازی دەکات لەنێو گوتاری فەلسەفیدا.[3]

هەر لەو ساڵەشدا، جاك دریدا کتێبێکی تری بڵاوکردەوە لەژێر ناوی (بڵاوبوونەوە) کە سێ وتار لەخۆ دەگرێت و هەر وتارێك لەسەد لاپەڕە زیاترەو،

---

[1]) نووسین و جیاوازی، جاك دریدا، لەعەرەبییەوە: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، چاپ و بڵاوکردنەوەی هەولێر، وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، ٢٠١٣، لـ٤.

٢) المواقع، حوارات مع جاك دريدا، ترجمة: فريد الزاهي، المغرب، ١٩٩٢، ص٢١.

٣) نيتشة فرويد ليفيناس، حول اخلاقيات التفكيك، كريستوفر نوريس، ترجمة: حسام نايل، مجلة نزوى، عدد (٢٦).

زۆرتــر ڕۆچــووەتە نێــو زمانــەوانی و ئــەدەب. هــەر لەهــەمان ساڵیشــدا کتێبــی (دەرمانخانەی ئەفلاتون) ی نووسی کە بەیەکێك لەشاکارە فەلسەفییەکانی جاك دریدا دادەنرێت و تایبەتە بەڕۆچوونە نێو ئەسڵی نووسین و ئاخافتن و، لەمیانەی خستنەڕووی بۆچوونی ئەفلاتونییانەوە دەچێتەوە نێو میتۆلۆژیای میسری فیرعەونی.[1] لەم کتێبەدا جاك دریدا دوای بیست و پێنج سەدە، دەگەڕێتەوە سەر یەکێك لەدیالۆگەکانی ئەفلاتون و دێت شرۆڤەو خوێندنەوەیەکی تازە بۆ دیالۆگی (فیدرۆس) دەخاتە ڕوو، بەجۆرێك سەرتاپای تێگەیشتنی (٢٥٠٠) ساڵی مرۆڤایەتی بۆ تێگەیشتن لەم دەقە سەراوژێر دەکات. ئەو دیالۆگەی ئەفلاتون تایبەتە بەقسەکردن لەبارەی پرۆسەی نووسین و، جێکەوت و، سەرهەڵدانی خەتی هیرۆگلیفی میسری. ئینجا دریدا دێت شرۆڤەی بۆچوونەکانی سوقرات دەکات لەبارەی پێوەندی نێوان نووسین و، ژەهرو دەرمان، نووسین وەکو ژەهرنۆشین و دەرمانخواردن و، هەموو ئەو چەمکە ئاڵۆزانەی میتافیزیکای خۆرئاوایی بەرهەمی هێناون، چەمکی وەکو لۆگۆس و میتۆس و، کاری لەسەر کردوون.[2]

لەساڵی (١٩٧٤) دا جاك دریدا کتێبی (زەنگەکان) ی بڵاوکردەوە، لەو کتێبەشدا کار لەسەر چەمکی خێزان دەکات لەلای هێگل، ئەوە لەپاڵ کارکردنی لەسەر کارەکانی جان جینێ. هەر لەهەمان ساڵدا کتێبی (مالارمێ) ی بڵاوکردەوە.

---

١) صيدلية افلاطون، جاك دريدا، ترجمة: كاظم جهاد، تونس، ١٩٨٨، ص٢١.

٢) جاك دریداو هەڵوەشاندنەوە، ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، ٢٠١٠، ل٢٤٨.

لەسـالّی (١٩٧٥) یشـدا، لێکۆڵینەوەیـەکی بـەناوی (ناوبـژیوان و حەقیقـەت) بڵاودەکاتەوەو تێیدا ڕەخنە لەبونیادگەری جاك لاکان دەگرێت.[١]

لەسـالّی (١٩٨٠) کتێبـی (کـارت پۆسـتالّ لەسـوقراتەوە بـۆ فرۆیـد) بڵاودەکاتـەوە.[٢] لەسالّی (١٩٨٣) شـدا، کتێبـی (بـەیادی بـۆل دی مـان) بەچاپ دەگەیـەنێت، ئـەو کتێبـەش پـڕە لەیادگارییـەکانی لەگـەڵ بـۆل دی مـانی گـەورە هزرڤانی هەڵوەشاندنەوەگەرایی ئەمریکی کە ئەو کاتە ماوەیەك بـوو کۆچـی دوایـی کردبوو.[٣] یەکێك لەو کێشانەی کە دریدا لەسالّی (١٩٨١) دووچار هـات، پێوەنـدی هـەبوو بەسـەفەرکردنی بـۆ شـاری بـراگ لەچیکوسـلۆڤاکیا کـە ئـەو کاتـە لـەژێر دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکاندا بوو. ئەم سەردانەی دریدا بەشێوەیەکی نـاڕەسمی بـوو تاوەکو لەوێدا باسی هەڵوەشاندنەوە بکـات و سـیمینارێك پێشکەشبکات. لـەکاتی گەڕانەوەی لەفڕۆکەخانەی براگ پۆلیسی چیکوسلۆڤاکیا دریدا دەسگیر دەکەن بەو تۆمەتەی کە بڕێك مادەی هۆشبەری لەنێو جانتاکەیدا بـووە. ئـەم دەسـگیرکردنەی دریدا لەبراگ، دەنگۆیەکی زۆری نایەوەو حکومـەتی چیکوسـلۆڤاکیا، جگـە لـەوەی کـە زوو ئازادیـانکرد، ئـەو ئەفسـەری پۆلیسەشـیان سـزادا کـە ئـەم بـڕە مـاددە هۆشبەرەی خستبووە نێو جانتاکەی تاوەکو دەسگیری بکات.[٤]

---

١) البنيوية وما بعدها، جون ستروك، ترجمة: محمد عصفور، الكويت، ١٩٩٦، ص٢١٤.

٢) النقد الكراماتلوجي للعمليات اليمولوجية، علي بدر، مجلة الأقلام، عدد (٥ ـ ٦)، ص٥١.

٣) ئیپۆکی پاش بنەماخوازی لەمیانەی خستنەڕووی بیری جـاك دریـدا، ئـازاد حەمـە، گۆڤـاری ڕامان ژمارە (٥٢).

٤) http://www.aldohamagazine.com/article

لەساڵی (١٩٨٨) دا کتێبی (ئۆلیس گرامافۆن)ی نووسیوەو، لەساڵی (١٩٩٥) یشدا لەنێو کۆنگرەیەکی فەلسەفی تایبەت بەهزرو فەلسەفەی مارکسیزم، دوای ڕووخانی بلۆکی سۆسیالیستی بۆ ماوەی دوو ڕۆژ لەسەر یەك لەزانکۆی کالیفۆرنیای ئەمریکی، لێکۆڵینەوەی (تارماییەکانی مارکس) ی پێشکەشکرد، لەهەمان ساڵیشدا لەشێوەی کتێبێکی گەورەدا بڵاویکردەوە.[1]

لەو کتێبەدا جاك دریدا پێمان دەڵێت بەبێ خوێندنەوەی مارکس هیچ ئایندەیەك لەبەردەم کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا نییەو، کۆمەڵێك ڕەخنەی زۆر ئاڕاستەی ڕەوتی جیهانگیری دەکات و ناوی دەنێت کارەساتەکانی سیستەمی نوێی جیهان و، قسە لەبارەی شێوازی نوێی بێکاری و، بەلاوەنانی ئەو هاوڵاتیانە دەکات کە شوێن و جێگایان نییە لەپرۆسەی بەشداری سیاسی و، فروانبوونی ململانێی ئابووری و، کۆنترۆڵ نەکردنی بازاڕی ئازادون زۆربوونی ڕێژەی قەرزی وڵاتە هەژارەکان و، بێ توانایی ئەو وڵاتانە لەدانەوەیان و، فراوانبوونی بازاڕی چەکی جیهانی و، ململانێی ئەتۆمی و، ململانێیە نێو خۆییەکانی وڵاتان لەبارەی ناسنامەو ڕەگەزو ڕەنگەوە. هەروەها قسە دەکات لەبارەی مەترسی سەرهەڵدانی ئیمپراتۆرییەتی مافیای بڵاوبوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان و، ڕاڤەکردنە تازەکانی چۆنییەتی جێبەجێکردنی یاسا نێو دەوڵەتییەکان.

دریدا لەئاست مەسەلەی یادەوەری و ئینتیما کێشەی زۆری هەبوو، ئەو کێشانەی خۆیشی نەشاردۆتەوە، چونکە ئەو لەیەك کاتدا جەزائیری و فەڕەنسی بووە، جەزائیرییەك فێری زمانی جەزائیری نەبووە، لەبەرئەوەی سیاسەتی

١) اطیاف مارکس، جاك دریدا، ترجمة: د. منذر عیاشي، سوریة، ١٩٩٦، ص١١.

كۆلۆنیالیزمی فەڕەنسی هەموو قوتابخانەكانی جەزائیری بەفەڕەنسی كردبوو. بۆیە كاتێك شاكر نوری نووسەری عەرەبی بەڕەگەز كورد، پرسیاری لێ دەكات ئایا ئەو لەئاست ئینتیما بۆ فەڕەنسا هەست بەچی دەكات، جاك دریدا بەو شێوەیە وەڵامی دەداتەوە:" بەردەوام وا هەست دەكەم لەئاست كولتووری فەڕەنسیدا پەراوێزم، هەست دەكەم من لەیەك كاتدا لەناو ئەو كولتوورەدام و، لەدەرەوەی ئەو كولتوورەشم، لەبەرئەوەی لەوڵاتێكی بێگانەدا ژیاوم، دواتریش لەتەمەنێكی درەنگتردا هاتووم بۆ ئەوەی لەفەڕەنسا بژیم. بەلای منەوە، كولتووری فەڕەنسی نموونەیەكی سەپێنراوە لەلایەن قوتابخانەوە، لەو حاڵەتەشدا خودی كولتووری فەڕەنسیش تاڕادەیەك وەكو كولتوورێكی بێگانە دەمێنێتەوە، واتا لەیەك كاتدا خۆشەویستەو خۆشەویستیش نییە". [1]

دریدا لەكاتێكی زوودا لەجەزائیر، تێگەیشت ئەو ناتوانێت خاوەنداریێتی ناسنامەیەكی هێمن بەخش بێت و یادەوەری بۆ دروستبكات، چونكە ئەو تاوەكو نەچووە فەڕەنسا ڕەگەزنامەی فەڕەنسی پێنەدرا، بۆیە دەڵێت:" من یەهودییەكی نا یەهودیم، جەزائیرییەكی نا جەزائیریم، یەهودییەكی جەزائیریم، من لەكۆتاییدا فەڕەنسیم".

ئەوەی لەنێو ئەو كولتوورە فەڕەنسییەدا زۆرتر سەرنجی جاك دریدا ڕادەكێشێت، ئەوەیە كە ئەو سەرەتا نەیتوانیوە جێگای خۆی لەنێو ئەو كولتوورو كۆمەڵگەیەدا بكاتەوە، چونكە محەمەد بنیسی نووسەری مەغریبی و هاوڕێی جاك

---

[1]) جاك دریدا، وتووێژ، لەعەرەبییەوە: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، دەزگای موكریانی، هەولێر، چاپی یەكەم، ٢٠١١، ل٩١.

دریدا دەگێڕێتەوە کە دریدا چەندجارێك لەلای ئەو سەرسوڕمانی خۆی لەو ڕەوشنە کولتوورییەی فەڕەنسا پیشانداوەو دەڵێت:" پێی گوتم کە نامۆیە بەفەڕەنساو، کاتێکی زۆری ژیانی لەدەرەوەی فەڕەنسا بەسەر بردووە. ئەو کاتەی لەفەڕەنسا بووەو لەوێدا دەینووسی و کتێبی بڵاودەکردەوە، کەچی فەڕەنسییەکان دانیان پێدا نەدەهێناو گوێیان بەنووسین و کتێبەکانی نەدەدا، بگرە لەوەش زیاتر ئیهمالیان دەکرد. ئەوە ئەمریکییەکانن کە منیان دۆزییەوەو دواتریش ئەڵمانییەکان بوون، ئەو کاتە گەڕامەوە فەڕەنسا کە لەئەمریکاو ئەڵمانیا ناسراو بووم و کارەکانم قسەیان لەبارەوە دەکرا".(١)

جاك دریدا یەکێك بوو لەوفەلسەفەکارانەی پرسی ژیانی تازەی ڕاڤە دەکردوو، بەرگری لەمافی گەلانی بەشخوراو دەکردوو، بەردەوام لەدژی کۆلۆنیالیزمدا بووە، بۆیە زۆرجار لەنێو ئاپۆرای عەرەب و فەلەستینییەکاندا دەبینراو بەرگری لەمەسەلەی فەلەستینی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی فەلەستینی سەربەخۆی دوور لەدەسەڵاتی ئیسرائیلی دەکرد، بۆیە ئەو یەهودییەکی توندڕەو نەبووەو لەدوای (١١) ی سێپتەمبەریشدا بەردەوام داوای دیالۆگی شارستانی نێوان هزرو فەلسەفەو ئایینەکانی دەکرد.

ئەو بەتووندی بەرگری لەنیلسۆن ماندیلاو لێژنەی ئاشتەوایی و ئاشتی باشووری ئەفریقیای دەکرد، هەروەها بەرگری لەمافی ئەو کرێکارە عەرەبانە کردووە کە لەفەڕەنسا لەنێو ژیانێکی سەخت و دژواردا دەژیان و، مافی ئیقامەو ژیانیان

١) لقاءات مع جاك دريدا، محمد بنيس، من الأنترنت.

پێنەدرابوو. هەروەها لەدەسپێشخەرییەکی گەورەی خۆیدا هەڵسا بەدامەزراندنی پەرلەمانی نێو دەوڵەتی نووسەران بۆ بەرگریکردن لەئازادی ڕادەربڕین و نووسین.

جاك دریدا لەڕۆژی شەممەی (٢٠٠٤/١٠/٩) دوای ململانێیەکی زۆری چەندین ساڵە لەگەڵ نەخۆشیدا، لەیەکێك لەنەخۆشخانەکانی پاریس لەتەمەنی (٧٤) ساڵیدا کۆچی دواییکردوو، لەدوای خۆیدا نزیکەی (٨١) کتێب و نامیلکەی جێهێشتووە.[1]

[1]) جاك دریداو هەڵوەشاندنەوە، ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، ٢٠١٠، لـ٢٠.

## دەسپێك

Kolaphos، لێدانی شەقە زللەیەك لەڕوومەت، شەقێك ... (kolapto).
Kolapto:

١) دەست دەكات بە .... شتێك، بەتایبەتی لەزمانی باڵندەدا: هەڵدەكۆڵێت، لێرەدا شتێك دەكرێتەوە لەمیانەی لێدانی بەردەوام و لەدوای یەك لەڕێگای دەنووكەوەو .... بەهاوشێوە، لەكاتی قسەكردن لەبارەی ئەسپێك كە بەپاژنەكانی زەوی دەكووتێت.

٢) ئەگەر بەردەوام بێن، دەنەخشێنێت، gramma eis aigeiron (داری لاولاو). Kata phloiou (توێكڵ)، نووسین لەسەر داری لاولاو، یا لەسەر توێكڵ. (بڕوانە: ڕەگی وشەی Klaph، و ڕەگی وشەی Gluph، هەڵكۆڵین، خووراندن).

هیچ دەقێك بەدەق حیساب ناكرێت، ئەگەر لەیەكەم ڕوانیندا، لەبەردەم یەكەم كەس كە دێتە سەری، یاسای نووسین و یاسای گەمەی خۆی نەشارێتەوە. ئینجا هەر دەقێك بەردەوام تا كۆتایی هەوڵدەدات لەسێبەرو لەپەناو لەشاراوەییدا بمێنێتەوە. ئەم كارەش، مانای وا نییە یاساو بنەماكەی خۆیان لەپەنای نهێنی شاراوەدا دەشارنەوە، بەڵكو زۆر بەسادەیی، هەر ئەوەیە كە لەئێستادا خۆیان نادەنە دەست هیچ شتێك، كە دەشێت زۆر بەوردی ناوبنرێت (ئیدراك). ئەوەش بەردەوام لەمیانەی سەركێشی (واتا لەلایەن دەقەوە) بەهۆی جەوهەرو ناوەڕۆكی خۆی و، بەم شێوەیە لەمیانەی ونبوونی كۆتاییدا. كێ ئاگاداری ئەم جۆرە ونبوونە

کۆتاییە دەبێت؟

بەهەرحاڵ، دەشێت نهێنی ڕستن و چنین لەکاتی هەڵوەشاندنەوەو دۆزینەوەو کردنەوەیدا، چەندین سەدە بخایەنێت. چنین، چنین لەخۆیەوە دەگرێت. چەندین سەدە بۆ کردنەوەی چنینێك. بەم شێوەیە بەردەوام وەکو جەستەیەکی زیندوو خۆی بونیا دەنێتەوە. چنینەکەی خۆی هەرچەندە کۆن دەبێت، بەڵام بەبێ کۆتایی خۆی لەپەنای ئەم جێکەوتەدا دەشارێتەوە کە بڕیاری هەموو خوێندنەوەیەکە. بەردەوام، بەبێ کۆتایی بەرەنگاری هەموو هەوڵێك دەبێتەوە بۆ کردنەوەو فیزیۆلۆجیای هەر ڕەخنەیەك کە لەوەهمی ئەوەدایە، گوایە کۆنترۆڵی یارییەکەی ئەمی کردووەو، هەموو داوەکانی خستۆتە دەستی خۆی. بەم شێوەیە ڕەخنەش خۆی فریو دەدات، کاتێك لەدەقێك ڕادەمێنێت، بەبێ ئەوەی دەسکاری بکات و دەستی بخاتە سەر هیچ شتێك و، سەرکێشی بکات ـــ ئەوەش تاکە دەرفەتی چوونە نێو یارییە ـ داوێکی تازە بدۆزێتەوە تاوەکو پەنجەیەکی خۆی تێدا گیربکات.

لێرەدا، زیادکردن و خستنەسەر، هیچ شتێك و هیچ مانایەك نابەخشن، تەنیا کردنەوەی دەرفەتی خوێندنەوەی دەق نەبێت. بۆیە دەبێت وا ڕەفتار بکەین بەجۆرێك بتوانین بیر لەمەی داهاتوو بکەینەوە: پرسەکە پێوەندی بەچنین و درووماونەوە نییە، مەگەر ئەم کاتە نەبێت کە پێمان وابێت زانینی چنین و دروومانیش بریتییە لەوەی ئێمە بتوانین بەردەوام بەدوای ئەم داوە درێژە بکەوین. واتا، ئەگەر پێتان خۆشبوو بەدوایدا بچن، داوە ونەکە. خۆ ئەگەر هیچ یەکێتییەکی کردەیی هەبێت بۆ هەردوو (فرمانی) خوێندنەوەو نووسین، وەکو ئەوەی ئیمڕۆ بەئاسانی ئەم بڕوایە باوە، ئەگەر خوێندنەوە خۆی نووسین بێت، ئەوە ئەم

یەکێتییە هەرگیز ئاماژە نییە بۆ ئەم تێکەڵاوییەی کە ناکرێت پێی لەیەکتریان جیا بکەینەوە، هەرگیزیش ئاماژەیەك نییە لەسەر ئەم هاوشێوەییە ئاسانە. پێویستە لەسەر کردەی کەینوونە کە لێرەدا وا دەکات نووسین بێت خوێندنەوە بەسەر بکاتەوە، خۆڕاگربێت.[1]

کەواتە، پێویست دەکات نووسین و خوێندنەوە یەك بزاڤ پێکبێنن، وەکو ئەوەی شتێکی دووانەو جووت بن. هەر کەسێك لەناکاو پێی وابێت ڕێگای پێدراوە زێدەڕۆیی بکات لەزیادە ـ le supplement[2] خستنەسەر، ئەوە هیچ لەم یارییە

---

[1]) دریدا لێرەدا وشەی خۆڕاگرتن بەرانبەر بەشتێك بەکاردێنێت، لەبەردەم شتێکدا کە دێت دەیهەژێنێت و هەڵیدەوەشێنێتەوە ـ en decoudre ـ کە لەڕیشەدا دەگەڕێتەوە بۆ فرمانی ـــ decoudre ـــ دووریییەوە، بەستایەوە، گرێدایەوە. کەواتە ئەم دەستەواژەیەش هەر بەشێکە لەزنجیرەی داوو درووومان و چنین و ڕستن کە لەسەرەتادا دەستپێکردووە. لێرەدا وا پیشانی دەدات وەکو ئەوەی شتێك زۆر بەپتەوی و بەهێزی خۆی ڕاگرتووەو لەسەر لێواری تەقینەوەدایەو گوێ بەو شتانە نادات کە بەسەریدا دەسەپێنرێن.

٢) زیادە ـ le supplement، هەندێکجار بە مانای پاشکۆ، پاشبەند، وەردەگێڕدرێت. یەکێکە لەم زاراوەو چەمکانە دریدا بەگشتی کاری زۆریان لەسەر دەکات. دریدا ئەم چەمکە لەلای ڕۆسۆ دەسگیر دەکات، لەمیانەی ئەم چەمکەشەوە دەیەوێت بزاڤێکی سەرەکی نووسین دەسگیر بکات. ڕۆسۆ کاتێك ئەم چەمکەی بەکارهێنا، ویستی خۆی لەناوەڕۆکی میتافیزیکانە بێنێتە دەرەوە، بۆیە (زاراوە ـــ بزاڤ) دەخاتە ڕوو کە بەشێك نییە لەدوالیزمی میتافیزیکایی، بەڵکو لەناوەخۆیدا هەم کارێك و هەمیش دژەکەی لەخۆ دەگرێت. زیادە خۆی گریمانی ئەوە دەکات کە شتێك ناتەواوە، دێت زیادی دەکات و تەواوی دەکات، لەم کاتەدا کە دێت شتەکە تەواو بکات، بۆی دەردەکەوێت تەواو نییەو ناتەواوە، بۆیە ئەم زیادەیە پێویستە. کەلێنێك و درزێك هەیە پێویستی بەپڕ کردنەوەیە. لێرەدا ئەم چەمکە وەکو زیادەیەك دێت کۆی گشتی شتەکە دادەپۆشێت و دەبێتە

نازانێت، ئینجا ئەم زیادەیە بەهەر جۆرو شێوەیەك بێت. هیچ شتێکی بۆ زیاد ناکات، چنینەکە خۆی دەتەقێتەوەو دەدرێت. لەبەرانبەریشدا، هەر کەسێك گوێ بداتە بەربەستە میتۆدییەکان و پێوەرە بابەتییەکان و، بەربەستەکانی مەعریفە،[1] ئەوە ناتوانێت تەنانەت کردەی خوێندنەوەش ئەنجام بدات. ئەمە هەمان گەمژەیی و، هەمان نەدارییە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کەسێکی هەڵپەرست و کەسێکی زۆر جددی لەیەکتری جیا بکاتەوە. پێویستە زیادە خستنەسەر خوێندنەوە، یا نووسین شتێکی ڕاسپێردراو بێت، بەڵام بۆ پێویستی یاریکردن ــ گەمە. هێمایەکە دەبێت تەواوی توانای سیستەمی بۆ بخرێتە گەڕ.

---

نوێنەری شتە ئەسڵییەکە لەبری ئەوەی وەکو زیادەیەك تەماشا بکرێت. دێت نوێنەرایەتی ــ la suppleance ئەم دەکات، بەناوی ئەم قسە دەکات. لێرەدا کۆی گشتی پرۆسەکە بریتییە لەوەی کە ئەم خۆی زیادەیە، زیادەیەك بەزۆری سەپێنراوە، مشەخۆرە. وەکو دواتریش دەبینین دریدا پێوەندی نێوان نووسین و ئاخافتن بەراورد دەکات بەپێوەندی زیادە لەگەڵ شتە ئەسڵییەکەو دەبێتە زیادەگەرایی ــ la supplementarita، ئەوەیە لۆژیکی زیادە. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی چەمکی زیادە، پاشکۆ، پاشبەند، بگەڕێوە بۆ بەشی شەشەمی کتێبی (جاك دریداو هەڵوەشاندنەوە، نووسینی: ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، بەڕیوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپی یەکەم، ٢٠١٠). (وەرگێڕی کوردی)

[1]) دەستەواژەی بەکارهێنراو لەنێو دەقی فەرەنسیدا بریتییە لە (بەربەستی ڕێگری ــ garde-fous) کە بە بەربەستی شێتان ناسراوە لەزمانی فەرەنسیداو، مەبەست لێی ئەو ڕێگری و بەربەستانەیە کە لەسەر لێواری پلیکانەو تەلارو سەر کەشتییەکان دروست دەکرێن، تاوەکو مرۆڤی شێت و بەهەڵەداچوو، لێی نەکەونە خوارەوە. بەکارهێنانی دەستەواژەی بەربەستی مەعریفە تەنیا بۆ دەلالەتکردنە لەم مانایە.

(١)

پێش کەمێك هەموو ئەم شتانەمان گوت کە دەمانویست، تەنیا شتێکی کەم ماوە دەشێت بگوترێن. بێگومان فەرهەنگەکەشمان زۆر دوور نییە لەوەی تەواو بێت و، چیمان پێ نەمێنێت. ئەگەر زیادە خستنە سەرێکی کەم نەبێت، ئەوە ئێمە هیچمان لەبەردەم پرسیارەکانماندا نەماوە، تەنیا ئەوە نەبێت چنینی دەق و، خوێندنەوەو نووسین و، کۆنترۆڵ و یاری و، موفارەقەی زیادە خستنە سەر،[١] یا پێوەندی هێلکای نێوان زیندوو و مردوو، ناوبنێت و دەستنیشانی بکات. ئەوەش لەنێو دەقدا، لەنێو چنین[٢] و ڕستن و چنینکاریدا، لەنێوان خواستنی چنین و — Istos ـ پرسیار لەبارەی ـ چنینی ـ خوازە.

مادام ئێمە پێش کەمێك هەموو شتێکمان گوت، ئەوە پێویست بە بەرگەگرتن دەکات ئەگەر کەمێکی تریش بەردەوام بین. ئەگەر لەم قسانەماندا بەهۆی پاڵنەری هێزی یارییەوە بەردەوام بین. کەواتە، ئەوە ئێمە ئەگەر کەمێك لەبارەی ئەفلاتون بنووسین کاتێك لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا دەڵێت نووسین بەردەوام خۆی دووبارە دەکاتەوەو دووبارە دەبێتەوە، ئەوە "بەردەوام دەلالەت — Smainei لەهەمان شت دەکاتەوە" و کینایەتە لەیاری ـ گەمەکردن Paidia.

---

١) زیادە خستنە سەر ـ supplementarite: مەبەست لەزیادەیە — supplement وەکو ئەوەی پێشتر شرۆڤەمان کرد. (وەرگێڕی کوردی)

٢) هەر یەك لەوشەی چنین — texture — و دەق — texte — سەر بەیەك ڕیشەی زمانەوانین، بەوەش دریدا دەتوانێت ئەم داوانە لەنێو چنینێکی زمانەوانی — چەمکگەرای یەکگرتوودا بەکاربێنێت.

# بەشی سێیەم

## فارماسیٚ[1]

---

١) فارماسیٚ واتا ئامادەکردنی کەش و هەوای فارماکۆن، پێش ئەوەی هەر کەسێك فارماکۆن نۆش بکات، پێویستە پێشتر ئەو کەسە ئامادە بکرێت، کەش و هەوای تایبەتی ئامادە بکرێت، ئەو کەش و هەوایەش ناودەبرێت بەفارماسیٚ. (وەرگێڕی کوردی)

با دەسپێبکەینەوە. کەواتە، ئەو کەسەی سەرداوێك و چنینێك دەشارێتەوە، پێویستی بەچەندین سەدەیە تاوەکو کەسێکی تر بێت بیدۆزێتەوە. مادام مەسەلەکە پێوەندی بە ئەفلاتون هەیە، ئەوە دەبێت بزانین ئەم نموونەیەی لێرەدا دەیخەمە ڕوو دیالۆگی "سیاسەتمەدار ـ Le Politique" نییە، چونکە بەردەوام لەباسی ئەفلاتوندا، سەرەتا زەینی مرۆ بەرەو ئەم دیالۆگە دەڕوات، ئەوەش بێگومان بەهۆی نموونەی[1] ئەو تەونکەرەوەیەی کە چنیویەتی، بەتایبەتیش بەهۆی ئەو نموونەیەی ڕاستەوخۆی پێشووتر، ئەویش نموونەی نووسینە.[2]

---

١) بەم شێوەیە زاراوەی paradigme وەردەگێڕدرێت، بەیۆنانیش وا دەنووسرێت paradigma: بەمانای نموونە دێت.

٢) "پیاوە بێگانەکە: ئەی هاوڕێی ئازیزم، زەحمەتە ئەگەر نموونەیەك ـ paradigm ـ وەرنەگرین و لەمیانەیدا بەشێوەیەکی باش بابەتێکی ئاوا گرنگ چارەسەر نەکەین. دەشێت بتوانین بڵێین ئێمە هەردووکمان هەموو شتێك دەزانین، وەکو ئەوەی لەخەوندا هەیە، ئینجا کاتێك بەئاگا دێینەوە، دەبینین هیچ شتێك نازانین.

سوقراتی لاو: مەبەستت چییە؟

پیاوە بێگانەکە: پێدەچێت ئەوە سازانێکی سەیر بێت کە لەسایەیەوە من دەتوانم ئەو دیاردەیە بناسم کە زانست لەنێوماندا بەرهەمی دێنێت.

سوقراتی لاو: مەبەستت چییە؟

پیاوە بێگانەکە: بۆ نموونە، بەڵێ ئەی کوڕی باش، ئێستا پێویستم بەنموونەیەك هەیە تاوەکو هەمان نموونەی پێشووتری خۆم شرۆڤە بکەم.

ئێمە دوای بازدان و گەڕانەوەیەکی دوورو درێژی مێژووییەوە، جارێکی تر دەگەڕێینەوە بۆ سەر ئەم دیالۆگە. ئێمە لێرەدا باسی دیالۆگی (فیدرۆس — Phedre) دەکەین.[1] باسی ئەم فیدرۆسە دەکەین کە دوای بیست و پێنج سەدە، ئینجا لەکۆتاییدا، واز لەوە دێنین وەکو دیالۆگێکی خراپ دروستکراو تەماشای بکەین.

یەکەمجار، بڕوا وابوو گوایە ئەفلاتون ئەو کاتە، هێشتا گەنج و لاو بووە، بۆیە نەیتوانیوە بەباشی کارەکەی خۆی بەجێبگەیەنێت و، نەیتوانیوە شتێکی جوان

---

سوقراتی لاو: باشە، با قسە بکەین بەبێ ئەوەی لەبەردەممدا پێویست بەوە بکات ئاوا دوودڵ بیت. باشە قسە دەکەم، مادام تۆ ئامادەی گوێم لێبگریت، چونکە وەکو ئەوەی ئێمە دەزانین منداڵ کاتێك دەست دەکەن نووسین دەناسن ......". ئینجا سوقرات بەردەوام دەبێت باسی گرێچن دەکات لەنێو نووسیندا، تا دەگاتە پێویستی گەڕانەوە بۆ ئایدیا لەنێو ئەزموونی سێنتاکس و زماندا، تاوەکو هێدی هێدی دەگاتە بەکارهێنانی ئەم میتۆدەو نموونەی ڕستن و چنین.

١) دیالۆگی فیدرۆس _ phedre یەکێکە لەدیالۆگەکانی ئەفلاتون. یەکێکە لەم دیالۆگانەی کە پێدەچێت ئەفلاتون لەدوای دیالۆگی کۆمار نووسیبێتی، چونکە لەنێو ئەم دیالۆگەدا باسی دەکات. بەپێی کاراکتەرو کەسەکانی نێو ئەم دیالۆگە بێت، ئەوە پێدەچێت ئەفلاتون ئەم دیالۆگەی لەماوەی نێوان ساڵانی (٤٢٠ _ ٤١٠) ی پێش زایینی نووسیبێت. ئەم دیالۆگە بەگشتی، لەبارەی بەهای گوتارو نووسینە لەنێو فەلسەفەو فێرکردندا. باکگراوند، چوارچێوەی سەرەکی چەمکەکان، سیستەمی ڕاستەقینە بۆ گەیشتن بەمەعریفەو چۆنییەتی بڵاوکردنەوە، گرنگی نووسین و ئاخافتن، باڵادەستی ئاخافتن بەسەر نووسین و ئیدانەکردنی ئەم پرۆسەیە لەلایەن ئەفلاتونەوە. فیدرۆس گەنجێکی ئەسینایەو حەز بەهونەری گوتاربێژی دەکات، سوقرات دەباتە دەرەوەی شار، تاوەکو گوتارێکی نووسراوی لیسیاسی نیشان بدات کە پێی وایە گرنگە بۆ فێربوونی تەکنیکەکانی گوتارنووسین و گوتاربێژی. (وەرگێڕی کوردی)

دابهێنێت. دیۆجینس لایرتیۆس ـ Diogene Laerce ئەو چیرۆکانە دەگوازێتەوە ـ Logos Legetai ـ کە ئەو کاتە بڕوا وابووە وتووێژی فیدرۆس، یەکەم هەوڵی ئەفلاتون بووەو، کۆمەڵێك بۆچوونی منداڵانەی تێدایە ـ meirakiodes ti.[١]

شلێرماخر ـــ Schleiermacher یش وەهمی کۆمەڵێك شتی تر دەکات لەبارەی توانای پاڵپشتیکردنی ئەو میتۆلۆژیایە، لەمیانەی کۆمەڵێك پاساوی لاوازەوەو، دەڵێت: نووسەرێکی پیری بەتەمەن، هەرگیز ئاوا ئیدانەی نووسینی نەدەکرد، وەکو ئەوەی ئەفلاتون لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا کردوویەتی. ئەو هەنجەت و پاساوە، نەوەکو هەر بەتەنیا جێگای گومانە، بەڵکو خۆی لەخۆیدا پاڵپشتی لەو میتۆلۆژیایە دەکات لەمیانەی میتۆلۆژیایەکی تردا.

لەڕاستیدا هەر تەنیا خوێندنەوەیەکی کوێرانە، یا گەمژانە، دەتوانێت بگاتە ئەو بڕوایەی ئەفلاتون ئاوا بەسادەیی ئیدانەی چالاکییەکانی نووسەر دەکات. هیچ شتێك لێرەدا ئاوا بەیەکجارەکی و سادەیی نەخراوەتە ڕوو، تەنانەت دیالۆگی فیدرۆس خۆیشی لەمیانەی نووسینیدا، هەوڵدەدات نووسین ڕزگار بکات ـ ئەوەش مانای وایە دەفەوتێت ـــ بەو سیفەتەی کە گەمەیەکی باشترو چاکترە. ئێمە لەشوێنێکی تردا، بەدوای ڕێچکەو مەودای تایبەتی ئەو گەمەیەدا دەڕۆین کە ئەفلاتون بەخۆی دەبەخشێت.

---

[١]) لەبارەی مێژووی شرۆڤەکردنی (دیالۆگی فیدرۆس) و کێشەی نووسینی، خوێنەر دەتوانێت شتێکی دەوڵەمەندی لەبارەیەوە ببینێت لەنێو دەقی (تیۆری ئەفلاتونیزم بۆ خۆشەویستی) کە لەلایەن (لـ. ڕوبان) نووسراوە، هەروەها لەو پێشەکییەشدا کە هەر هەمان نووسەر بۆ بڵاوکراوەی بودێ ـ Bude نووسیویەتی لەبارەی هەمان وتووێژ.

لەساڵی (١٩٠٥)دا کولتووری دیۆجینۆس لایبرتیۆس سەراوژێر بۆوە، بۆ ئەوەنا کە دان بەوە دابنرێت گوایە دیالۆگی فیدرۆس، کارێکی جوانە، بەڵکو تاوەکو کەموکوڕییەکانی بگێڕدرێتەوە بۆ نووسەرە پیرەکە، بۆیە وا تەماشاکرا گوایە دیالۆگی فیدرۆس، نووسینێکی خراپە. ئەو کەموکوڕییەش زۆر سەرنجڕاکێشە، بەتایبەتیش کە سوقرات تێیدا جێکەوت و کاری هونەری وەکو بوونەوەری زیندوو وەسف دەکات، بەڵام نەداری ئەم پیاوە لەجێبەجێکردنی ئەو شتەی کە زۆر جوان وێنای کردووە، بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر پیری.

ئێمەش لەئێستادا چیتر خاوەندارێتی ئەم جۆرە ڕوانینە ناکەین. بێگومان ئەو گریمانەیەی پێی وایە دیالۆگی فیدرۆس شێوە بوونێکی توونددو جوان و دڵنیاکەرانەی تێدایە، ئێستا زۆر بەپیتترە. ئەم بۆچوونە دێت هەماهەنگی نوێ دەدۆزێتەوەو، لەنێو یەکانگیرییەکی وردو ڕێکخراودا بەدیان دەکات، شێوە ڕێکخستنێکی شاراوەی بابەت و ناوو وشەکان. ئینجا دێت تێکەڵاوی و ئاڵۆزی گرێچنی تەواوی پرسەکە دەکاتەوەو، بەوردی پەنجە دەخاتە سەر بەڵگەکان. لەمیانەی ئەم کارەشدا، لەیەک کاتدا، توانای جوانی بەڵگەکان بەنەرمی و نهێنی و گاڵتەجاڕییەوە، هەم دەردەکەوێت، هەمیش دەسڕێتەوە.

ئێمەش بەتایبەتی دەست بەو داوە زیادەیەوە دەگرین، چونکە بەشی دوایی هەر هەمووی وەکو ئەوەی زانراوە، تایبەت کراوە بۆ بنەچەی نووسین و مێژووەکەی و بەهاکەی، هەموو ئەو دادگاییەی بۆ نووسین ئەنجامدراوە. دەبێت ڕۆژێک بێت، واز لەوە بێنین وا تەماشای بکەین وەکو ئەوەی خەیاڵێکی میتۆلۆژییانەیەو، دەکرێت دەسبەرداری هەموو ئەو بەشانەی نێو دیالۆگەکە بین،

بەبێ ئەوەی هیچ زیانێك بەو دیالۆگە بگات. لەڕاستیدا، ئەم بەشە، هێزێکی زۆری هەیە لەنێو فیدرۆسداو لەسەرتای دیالۆگەکەوە تا کۆتایی پێیەوە پەیوەستە.

هەمیشە بەگاڵتەوە، بەڵام لێرەدا ئەم گاڵتەیە چ مانایەك دەبەخشێت و ئاماژە گەورەکانی چین؟ ئەم دیالۆگە دوو تاکە میتۆلۆژیای ڕەسەنی ئەفلاتونی لەخۆیەوە دەگرێت، بەڕاستی ئەو دوو میتۆلۆژیایەی ئەفلاتون، تاکە میتۆلۆژیای ڕەسەنی ئەون: میتۆلۆژیایی حەشەڕاتی زیزان لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا، و میتۆلۆژیای تووت ـ Theut لەنێو هەمان دیالۆگدا.

بەهەرحاڵ، یەکەم وشەکانی سوقرات لەسەرەتای ئەم دیالۆگە، ئاڕاستەکراوە بۆ بەلاوەنانی هەموو توخمە میتۆلۆژییەکان. ئەوە بۆ ئیدانەکردنی میتۆلۆژیا نییە، بەڵکو بۆ ئازادکردنییەتی، چونکە ئەو دێت سەرفیان دەکات و بەلاوەیان دەنێت،[1] ئەوەش کارێکە لەلایەك سادەییەکی زۆر قورسەو، لەلایەکی تریشەوە زۆر جدییە، سادەیی فیزیاناسە عەقڵانییەکان، لەهەمان کاتیشدا تاوەکو خۆی لێیان ڕزگارو ئازاد بکات، لەپێوەندی نێوان خۆی و لەگەڵ خۆی و مەعریفەی خۆیدا.

سەرفکردنی میتۆلۆژیاکان، ماڵئاوایی لێکردنیان، مۆڵەتدانیان، لەکارخستنیان و پەکخستنیان: ئەم یەکلاییکردنەوەیە جوانە ـ Khairein (فرمانکردن بەڕۆیشتن بەرەو گەشت و پیاسە). هەموو ئەوانە لەیەك کاتدا، ئاماژەن لەسەر ئەوەی کە

---

[1]) ئەم گوزارشتەی بۆ سەرفکردنی میتۆلۆژیاکان بەکاردێت بریتییە لە ( envoyer promener) بەمانای ئەوە دێت کەسێك سەرف بکەیت و، وەڵامی داواکەی نەدەیتەوە. لێرەدا دریدا بەدەلالەتە حەرفییەکەی بەکاری دێنێت و تێکەڵاوی دەکات بەحاڵەتی مرۆڤانەی سەرفکردن، واتا زیندووکردنەوەی ئەفسانەکان و، ناردنیان بۆ ئەوەی پیاسەیەك بکەن، ئازاد بکرێن و هەوایەکی ئازاد هەڵمژن.

دووجار دووچاری بڕین دێت، بۆ پێشوازیکردن لەو دوو تاکە میتۆلۆژیایەی کە "بەڕاستی ڕەسەنن". بەهەرحاڵ، هەردوو میتۆلۆژیا، لەسەرتاوە پرسیار لەبارەی شتی نووسراو دەوروژێنن. بێگومان کارەکە ئەوەندە ناهێنێت ــ ئەریٚ کەس تێبینی ئەوەی کردووە؟ ـ لەحاڵەتی چیرۆکی حەشەراتی زیزانەکاندا، ئەگەرچی ئەویش زۆر جێگای بڕوایە. هەردوو میتۆلۆژیا بەدوای هەمان پرسیاردا دەڕۆن، زۆریش لەیەکتری جیا نابنەوە، مەگەر بۆ مەودایەکی کەم و ماوەیەکی کورت نەبێت. ئەوەی یەکەمیان وەڵامی پرسیارەکە ناداتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە هەڵیدەپەسێرێت و، ئاماژە بەو هەڵپەساردنەوەیەش دەکات و، پاڵمان پێوە دەنێت تاوەکو لەگەڵ میتۆلۆژیای دووەمدا دەسپێبکاتەوە.

با بخوێنینەوە. لەناوەڕاستی دیالۆگەکەدا ــ دەتوانین ڕستەکان بژمێرین بۆ ئەوەی دڵنیابین کە بەڕاستی ناوەڕاستی دیالۆگەکەیە ـ لەوێدا ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە: " ئەی چی لەبارەی لۆگۆگرافیا ــ نووسین؟". فیدرۆس ئەوەمان بیر دەخاتەوە کە "هاوڵاتی بەهێزو خاوەن کەرامەت، پیاوی ئازاد، هەست بەشەرمەزاری ـــ aiskhumontai دەکەن لەنووسینی گوتاردا، هەست بەشەرمەزاری دەکەن ئەگەر لەدوای خۆیاندا شتی نووسراو ــ sungrammata جێبێڵن. ئەوانە لەبڕیاری نەوەکانی داهاتوو دەترسێن، نەوەکو بەخەڵکی سۆفیست ناویان ببەن".[١]

---

[١]) سۆفیست، یا سۆفیستەکان، ڕێبازێکی فەلسەفی بوو لەکۆتایی سەدەی شەشەم و سەرەتای سەدەی پێنجەمی پێش زایینی لەیۆنانی کۆن سەریان هەڵداوە. ئەم ڕێبازەو لایەنگرەکانیان و پێڕەوکارانیان، لەم کاتەوە تاوەکو چەند سەدەیەك پێش ئێستا،

لۆگۆگراف ـ نووسەری بواری گشتی،[1] وتاریان بۆ خەڵك دەنووسی تاوەکو ـەبەردەم دادگاو فەرمانگەکانی میریدا بیانخوێننەوە، ئەو وتارانەی بۆ خەڵکیان دەنووسی، بۆ خۆیان نەدەنووسی و پێوەندی بەکەسایەتی خۆیانەوە نەبوو، شتێکیان دەنووسی کە خۆیان دەری نابڕن و نایلێن، بگرە هەرگیز بیریشی لێناکەنەوە کە بیلێن، بۆیە ئەو نووسینانە لەنا ئامادەگی کەسایەتی نووسەری ڕاستەقینەدا کاری خۆیان دەکرد. کەواتە، شتێك دەنووسێت کە خۆی نایخوێنێتەوەو گوزارشتی لێناکات، بگرە هەرگیز بەڕاستیش بیر لەوەش ناکاتەوە کە بۆ خۆی بینووسێت، نووسەری وتار دێت وەکو سوفیستێك خۆی لەنێو وتاری نووسراودا جێنشین دەکات. بۆیە ئەو دەبێتە پیاوی نا ـ ئامادە و نا ـ حەقیقەت. کەواتە، نووسین پێشتر بریتی بووە لەڕێکخستنی دیمەنەکان. ناکۆکی و دژکاری نووسراوو حەقیش، لەو چرکەساتەوە دەسپێدەکات کە تێیدا سوقرات ئەوە دەگێڕێتەوە کە چۆن مرۆڤ لەمیانەی چێژەوە، فڕیدەدرێنە دەرەوەی خودی

بەردەوام لەژێر کاریگەری گوتاری سوقراتی و ئەفلاتونیدا هێرشی توونديان کراوەتە سەر، چونکە بڕوا وابووە لەمیانەی سەفسەتەوە پارە پەیدا دەکەن. یەکەمجار ئەم سیفەتەی سۆفیست وەکو شتێکی باش و بۆ شانازیکردن بەکاردەهات، تاوکەو دواتر ماناکەی گۆڕاو بوو بەکارێکی عەیبدارو سووکایەتیان پێدەکرا، گوایە مانای زاراوەی سەفسەتە بریتییە لە قسە فرۆشتن و قسەی زۆری ناوەڕۆك بەتاڵ بۆ شاردنەوەو جوانکردنی حەقیقەت. ناودارترین سۆفیستەکان پرۆتاگۆراس بووە. (وەرگێڕی کوردی)

١) مەبەستی دریدا لەنووسەری بواری گشتی، ئەو جۆرە نووسەرانەیە کە ئیمڕۆ ئێمە ناویان دەنێین عەریزە نووس و وتار بۆ خەڵك دەنووسن لەبارەی وەزع و گوزەران و ژیانیان. (وەرگێڕی کوردی)

خۆیان تاوەکو لەخودی خۆیان ون بن و، خودی خۆیان بیر بچێتەوەو، لەنێو چێژو خۆشی گۆرانیدا بمرن.

بەلام کۆتاییەکە دواخراوەو، سوقراتیش هێشتا هەر بێلایەنی خۆی پیشاندەدات: نووسین بۆ خۆی وەکو پرۆسەیەك کارێکی ئابڕووبەرو، شەرمەزارکەرانە نییە، مایەی سەرشۆڕی ـ aiskhron نییە. بەڵکو ئەوەی جێگای سەرشۆڕی و ئابڕووچوونە، ئەوەیە کە مرۆڤ بەشێوەیەکی ئابڕووبەرو سەرشۆڕانە بنووسێت. بەلام مەبەست لەنووسینی ئابڕووبەرانە چییە؟ وەکو ئەوەی فیدرۆسیش دەپرسێت: ئەدی نووسینی باش ـ kalos چییە؟ ئەم پرسیارە، وێنەی خاڵی سەرەکی و بنچینەیی هەرە گەورە دەکێشێت و، دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم دیالۆگە دابەشبکات لەنێوان ئەم پرسیارەو، ئەو وەلامەی کە لەبەشی کۆتاییدا خۆی نمایش دەکات:" زانینی ئەوەی ئەگەر نووسین بەڕاستی کارێکی شیاوە، یا کارێکی نەشیاوە؟ ئەو مەرجانە چین کە دەبنە هۆی ئەوەی ئەم کارە شیاو بێت؟ یا نەشیاو بێت؟ ئەم پرسیارە بەردەوام دەخرێتە بەردەممان". ئەی وانییە؟ ئێمەش دەڵێین (لەنێوان پرسیارو وەلامدا) بەردەوام هێڵێکی ڕێکخەری بەهێز هەیە، ئەوە ئەگەر نەڵێین بەچاویش دیارە لەمیانەی میتۆلۆژیای زیزان و، بابەتەکانی پسیکاگۆجیاو[1] وتووێژو گوتاربێژیدا.

بۆیە، سوقرات دێت "میتۆلۆژیاکان سەرف دەکات"، کاتێکیش دێت لەبەردەم نووسیندا دەوەستێت، ئەوە دێت دوو میتۆلۆژیا دادەهێنێت، تێبینی ئەوەش

---

[1] ) پسیکاگۆجیا، بریتییە لەهونەری یاریکردن بەدەروون و ڕوحەکان کە ئەفلاتون سۆفیستەکانی پێ تۆمەتبار دەکرد گوایە مومارەسەی ئەم جۆرە کارانە دەکەن.

-ەکەین کە هەر لەخۆیەوە لـەگۆتره داياننارێژێتـەوە، بـەڵکو بەشـێوەیەکی ئـازادو خۆرسکانەیە، زیاتر لەوەی لەکارەکانی خۆیدا هەیە، دایاندەرێژێتەوە. بەهـەرحاڵ، فرمانکردن بە (سەرفکردنی میتۆلۆژیاکان) لەسەرەتای دیالۆگی فیدرۆسدا، بـەناوی حەقیقەتەوە ئەنجام دەدرێت. بۆیە دەبێـت بـیر لەحەقیقـەتی ئـەوە بکرێتـەوە کـە میتۆلۆژیاکان لەچرکەساتی نووسیندا، بەناوی نووسینەوە دەگەڕێنەوە.

بەناوی حەقیقەت فرمان دەردەکرێت: بـەناوی مەعریفـەتی نووسـینەوە، ئەگـەر وردتریش بڵێم، بـەناوی حەقیقـەتی مەعریفـەی مـرۆڤ بـەخودی خۆیـەوە. سـوقرات بـەجوانی ئەمـە ڕوون دەکاتـەوە. بـەڵام ئـەم ناچـارکردنە بـەوەی مـرۆڤ دەبێـت حەقیقەتی خودی خۆی بزانێت، شـتێکی هەسـتپێکراو نییـە، هـەروەها بەشـێکیش نییە لـەئامادەگی ڕاسـتەوخۆو ڕوون لـەنێو خـوددا. شـتێکی ئیـدراك پێکـراو نییـە، بەڵکو ڕاڤەکراوە، خوێنراوەیە، جێگیرە.

ڕاڤەکاری پێویستی بەحەدس هەیە، نووسینیش، وەکو نووسـینەکەی دیلفـی ـــ delphikon gramma هیچ شتێکی تر نییە، تەنیا تەلەفۆنێکی خواییانە نـەبێت، لەمیانـەی هێمـای بێدەنگـەوە دەخرێتـە ڕوو و ئاڕاسـتەی ـــ وەکـو چـۆن کەسـێك فرمانێك ئاڕاستە بکات ـ هەریەك لەبینینی خودو مەعریفەی خود دەکرێـت، بیـنین و مەعریفەیەك کە سوقرات پێی وایە، دەکرێت بخرێنە بەرانبەر سەرکێشی یەکـەمی ڕاڤەکردنی میتۆلۆژیاکان، کە لەلایەنی خۆیەوە بۆ سۆفیستەکان جێی هێشتبوو.

فرمـانکردن بـەناوی حەقیقـەت، دێـت شـوێنگەیەك بـۆ خـۆی داگـیر دەکـات. بابەتـەکانی ئـەم دیالۆگـەش، لـەم لایەنـەوە بێهـوودە نـین. بابەتـەکان، یـا ئـەو شوێنگانەی کە مانا بەگوتارەکەو وشـەکان دەبەخشـن، هـەمووجارێك زۆر بـەوردی

دەستنیشان و دیاریکراون و، خراونەتە نێو کۆمەڵێك شوێنگەی دەلالەتبەخش. لەنێو دیمەنێکدا ڕێکخراون، لەنێو پانتایی ئەم شانۆیەدا یەکێتی شوێن بەرسڤی حیساب و پێداویستی دەداتەوە، بەجۆرێك هیچ هەڵەیەك قبووڵناکات. بۆ نموونە، میتۆلۆژیای زیزان ڕووی نەدەداو نەدەگێڕدرایەوە، سوقراتیش تاقەتی نەدەبوو بیگێڕێتەوە، ئەگەر گەرماو کەش و هەوای لەبار نەبووایە کە ئەو دوو هاوڕێیەی بردە دەرەوەی شار بەرەو لادێ، بردیانییە نزیك ڕووباری ئیلیسۆس.

بەرلەوەی ڕەگوڕیشەی نەسەبی "نەتەوەی" زیزان بخاتە ڕوو،[1] سوقرات باسی هەماهەنگی و جوانی هاوینی دەکرد کە وەکو دەنگدانەوەی تیپی مۆسیقای زیزان وابوو. بەڵام هەر ئەوە بەتەنیا تاکە جێکەوتی تیباقی ــ en contrepoint نییە کە کەش و هەوای ئەو دیالۆگە دەیخوازێت. میتۆلۆژیاکە خۆی کە هۆکاری فرمانکردن دابین دەکات بەسەرفکردن و، جەختکردنە سەر وێنەی خود، ناکرێت لەیەکەم هەنگاوی ئەم پیاسەیەدا لەسەر دیمەنی ئیلیسۆسدا سەرهەڵ نەدات. فیدرۆس لێرەدا پرسیاری ئەوە دەکات کە مەگەر بۆریاس هەڵنەستاوە بەڕفاندنی ئۆریتیس، وەکو ئەوەی پێشینەکان دەیگێڕنەوە، ئەی ئەم کارە لەهەمان ئەم

[1] حەشەرەی زیزان، جۆرە حەشەراتێکە زیزەزیر دەکات و دەنگی گەورەیە بەراورد بەشێوەو فۆرمی، زۆرتر لەسەرەتای هاویندا دەردەکەوێت لەکاتی دروێنەوەی گەنم و جۆ، بۆیە لەزۆر وڵات پێی دەڵێن حەشەرەی دروێنە. ناوی زانستی ــ cicada یە، لەهەموو وڵاتانی دونیادا هەیە، بەڵام زیاتر لەناوچەی وشك بڵاوە. دوو جۆرن، جۆرێکیان تەمەنیان لەنێوان (٢ ــ ٥) ساڵە، جۆرەکەی تریان تەمەنی درێژترەو دەگاتە نێوان (١٣ ــ ١٧) ساڵ. لەشێکی قەڵەوو چوار باڵی هەیە، بەگشتی ڕەنگیان تۆخەو زۆرتریش ڕەشن، درێژییەکەی لەنێوان (٢ ــ ٥) سەنتیمەتر دەبێت. (وەرگێڕی کوردی)

شوێنەدا نەبووە؟

دیارە ئەم سەرلێوارە، ئەم قەراغ ڕووبارە، ئەم پاکی و جوانییەی ئاوەکە پێشوازییان کردووە لەکچەکان تاوەکو ئەفسوونێك ڕایانبکێشن، یا پاڵیان پێوەبنێن بۆ وازی و گەمەکردن. ئەو کاتە سوقرات وەکو گاڵتەیەك و تەهەکومێك پێشنیار دەکات ڕاڤەکردنێك بخرێتە ڕوو بۆ ئەو میتۆلۆژیایە کە ڕێکەوتنی لەبارەیەوە کرابێت لەمیانەی بەڵگەو شێوازی عەقڵانی و فیزیایی تایبەت بەسۆفیستەکان: لەم چرکەساتەدا کە ئۆریتیس گەمە لەگەڵ فارماسیێ دەکات ــ sun Pharmakeia paizousan بای باکوور ـ pneuma Boreou دێت پاڵی پێوە دەنێت بەرەو خوارەوەو "دەکەوێتە سەر گاشە بەردەکانی خوارەوە".[١]

"بەهۆی ئەم بارودۆخەی مەرگییەوە، میتۆلۆژیای ڕفاندنی لەسەر دەستی بۆریاس[٢] سەرهەڵدەدات. ئەی فیدرۆس، پێم وایە ئەم جۆرە ڕاڤەکردنانە سەرنجڕاکێشن، بەڵام پێویستی بەبلیمەتی زۆرو، لێکۆڵینەوەی بەردەوام هەیە، لەم کارەشدا کەس ناتوانێت بەتەواوی سەرکەوتوو بێت".

ئایا ئەو ئاماژەیە کورتە بۆ فارماسیێ لەسەرەتای دەسپێکی فیدرۆسدا، بەشێوەیەکی ڕێکەوت بووە؟ ڕێگاخۆشکەر بووە بۆ کارەکە؟[٣] ڕۆبان باسی ئەوە

---

١) لێرەدا باسی یەکێك لەمیتۆلۆژیا کۆنەکانی یۆنان دەکرێت، کە بڕوا وایە لەنزیك ئەم شوێنەی ئەوان لێی دانیشتوون ڕوویداوە. (وەرگێڕی کوردی)

٢) بۆریاس خواوەندی بای باکوورە لەلای یۆنانییەکان.

٣) دریدا لێرە ئەم زاراوە لێکدراوە بەکاردێنێت (hors-doeuvre) کە لەزمانی مەتبەخدا بەو زەڵاتەو موقەبیلاتانە دەگوترێت پێش خواردن پێشکەش دەکرێن. بەشی یەکەمی بڕگەکە (hors) مانای (دەرەوە) یە، بەشی دووەمیش (oeuvre) مانای کارو شتی

دەکات کە نافوورەیەك هەبووە "ڕەنگە شیفابەخش بوو بێت"، تایبەت بووە بۆ فارماسیێ لەنزیك ئیلیسۆس. بەهەرحاڵ، با دەست بەحەقیقەتێکی بچووکەوە بگرین لەنێو گرێچنی چنراودا کە لەباگراوندی تابلۆکەدایەو، بەدرێژایی ئەو دیالۆگەو، دیمەنی ئەو کچە بوونی هەیە کە پاڵی پێوەنراوەو کەوتۆتە خوارەوە، مەرگ لەناکاو بۆ خۆی بردووە لەکاتێکدا خەریکی یاریکردن بووە لەگەڵ فارماسیدا.

فارماسیێ لەزمانی یۆنانیدا ــ Pharmakeia ناوێکی باوە بۆ دەلالەتکردن لەسەر پێشکەشکردنی فارماکۆن، یا دەرمان: چارەسەر، یا ژەهر.(١)

---

کردەیی دێت. کەواتە کۆی گشتی برگەکە دەبێتە شتێك لەدەرەوەی کارەکە، یا پێشەکی و دەسپێك کە دەشێت دەسبەرداری بین بەبێ ئەوەی هیچ زیانێك بەکارە سەرەکییەکە بگەیەنین.

١) فارماکۆن ـ pharmakon، فارماکۆن لەیەك کاتدا بەدوو مانا دێت، مانای یەکەمی فارماکۆن بریتییە لەو ژەهرەی کەسێکی حوکمدراوو تاوانبار نۆشی دەکات لەکاتی لەسێدارەداندا، تاوەکو زوو بەبێ ئێش و ئازار بمرێت. لەهەمان کاتیشدا فارماکۆن بەمانای عەقار، یا دەرمان دێت، ئەو دەرمانەی کەسێکی نەخۆش نۆشی دەکات، تاوەکو چاك ببێتەوە. کەواتە فارماکۆن هەم دەرمانەو، هەم ژەهرە. لەیەك کاتدا، هەم چارەسەرییەو هەم کۆتایی و لەناو بردنی ژیانیشە. ئەو دووانەیەی مانای فارماکۆن لەنێوان ژەهرو دەرماندا، بەرەو مانای جیاوازیمان ڕادەکێشێت، جیاوازی ئەوەی دەشێت یەك زاراوەو چەمك، چەندین مانای جیاوازو، تەنانەت دژ یەکیش لەخۆیەوە بگرێت، بۆیە فارماکۆن هەم دەرمانەو هەم ژەهریشە. لەلایەك ژەهرە، چەنکە ئەو کەسانەی پێ لەناو دەبرێت کە ملکەچی یاساکانی شار ناکەن، ئەوەشمان بیر نەچێت سوقرات خۆی یەکێك بوو لەوانەی تۆمەتبار کران و، لەڕێگای نۆشینی فارماکۆن ـ ژەهرەوە لەسێدارە دراو کوژرا، بەوەش سزا دراو لەناو چوو. بۆیە فارماکۆن وەکو ژەهر بەشێکە لەچارەسەری دەردی کۆمەڵگا،

ژەهرخـواردکردن، مانایـەکی بـاو بـووە بـۆ زاراوەی فارماسـیێ،[1] بۆیـە دەبیـنین ئەنتیفۆن ــ Antiphon چەند پاسـەوانێك بـەوە تۆمـەتبار دەکات کـە ژەهریـان داوەتێ. لەکاتی وازیکرنیدا، فارماسیێ پـاڵی پێوەنـاوە بـەرەو مـەرگ، مـەرگێك کـە هێشتا کچ و پاکیزەو بووخچەی نەکراوە بووە.

کـەمێك دواتـر، سـوقرات دێـت دەقـی نووسـراو، کـە فیـدرۆس لەگـەڵ خۆیـدا هێناویـەتی، بـەدەرمان و فارمـاکۆن دەشـوبهێنێت. ئـەو فارماکۆنـە، ئـەو "چارەسەرییە"، ئەو "شەڕابە"، کە لەیەك کاتدا، هەم دەرمانەو هـەمیش ژەهـرە، پێشتر بەهەموو پۆشاکی خۆیەوە، دەخزێتە نێو جەستەی گوتارەکان.

---

چونکە ئەو کەسانە لەناو دەبات کـە بوونەتـە بـار بەسـەر کۆمـەڵگاوە. لەهـەمان کاتیشـدا وەکو عەقار، دەرمانە بۆ چارەسەری نەخۆش، چونکە لەرێگای عەقارو دەرمانـەوە نـەبێت نەخۆش ناتوانێت جارێکی تر وەکو پێشتر چاك ببێتەوە. فارماکۆن هـەردوو ڕووی هەیـەو، هەردوو مانا دەبەخشـێت. بـەکارهێنانی چـەمکی فارمـاکۆن لـەلای سـوقرات بەئەنقەسـتەو گەرەکیەتی ئاراستەی وازییـەکی زمانـەوانیمان بکـات، ئـەوەش ئـەو وازییەیـە جـاك دریـدا دەیدۆزێتەوە. (وەرگێڕی کوردی)

١) فارماسـیێ نـاوی ئـەو چرکەسـات و حاڵەتەیـە کـە دەکەوێتـە بـەر لەچرکەسـاتی نۆشـینی فارماکۆن دەرمان ــ ژەهر، چرکەساتی ئامادەکردنی ئـەو کەسـەی کـەوا بڕیـارە فارمـاکۆن بنۆشـێت، لێـرەدا سـوقرات ئـەو شـێوازەی خـۆ ئامـادەکردنی فیـدرۆس بەفارماسـیێ دەچـوێنێت، چـونکە هـەر لەسـەرەتاوە ئـەو دەیزانـی فیـدرۆس شـتێکی لـەبن باغـەڵ و عەباکـەی حەشـارداوەو گەرەکیـەتی لەچرکەسـاتێکدا دەری بێنێـت و بـۆ سـوقراتی بخوێنێتەوە، بۆیـە حاڵـەتی بـەر لەنمایشـکردن و خسـتنە ڕووی نووسـین، لـەلای سـوقرات دەبێتە حاڵەتی فارماسیێ، واتا سوقرات بەر لەوەی فارمـاکۆن ــ نووسـین ــ نـۆش بکـات، دەچێتە نێو کەش و هەوای فارماسیێ تاوەکو بتوانێـت ئـەو ژەهـرو دەرمانـە نـۆش بکـات. (وەرگێڕی کوردی)

ئەم ئەفسوونە، ئەم توانایە لەسەر فریودان، ئەم هێزی ڕاکێشانەی کە هەیەتی، لەیەك کاتدا دوو جۆرە کاریگەری هەیە، یەکێکیان باشەو ئەویتریشیان خراپە. بەم شێوەیە فارماکۆن دەبێتە جەوهەرێك، یا ماددەیەکی باش ـــ substance، بەهەموو ئەو مانایەی کە ئەو زاراوەیە هەڵگریەتی لەمانای تایبەت بەهێزی شاراوەی تایبەت و، قووڵایی نهێنی دوالیزمی کە ئەستەمە شیبکرێتەوە، بەوەش کەش و هەوای کیمیایی دێنێتە ئارا. دەڵێین فارماکۆن دەبووە هەموو ئەم شتانە، ئەگەر ئێمە دواتر دانی پێدانەنێین وەکو ئەوەی بەدیاریکراوی دژە جەوهەرە: هەر شتێك کە بەرگەی هەموو ئیجرائێکی فەلسەفی دەگرێت و دەیبەزێنێت بەبێکۆتایی، وەکو ئەوەی بێ ناسنامەو، بێ ماهییەت و، بێ جەوهەرە. بەو جۆرە لەمیانەی ئەو دژکارییەی کە هەرگیز کۆتایی نایەت درێژ دەبێتەوەو دەکشێت.

لەکاتێکدا فارماکۆن لەمیانەی ورووژاندن و سەرنجڕاکێشانەوە کاری خۆی دەکات، ئەوە لەهەمان کاتیشدا هەموو یاسا گشتییەکانی سروشت و باو، دەخاتە پشت ڕێگاکەی خۆی. لێرەشدا دێت سوقرات لەشوێنی تایبەتی خۆی و ڕێگا باوەکان دێنێتە دەرەوە، چونکە سوقرات بەردەوام لەنێو چوارچێوەو شوورای شاردا ژیاوە. کاغەزەکانی نووسین وەکو فارماکۆنێك کار دەکەن، پاڵ بەو کەسانەوە دەنێت، یا بەرەو دەرەوەی شار ڕایاندەکێشێت، کەسانێك کە هەرگیز شاریان جێ نەهێشتووە، تەنانەت لەدوا چرکەساتیشدا بەمەبەستی دەربازبوون لەژەهری شوکران.[1] ئەو کاغەزانە لەخودی خۆی دەری دێنێت و ڕایدەکێشێتە

---

[1] ) مەبەستی دریدا لێرە سوقراتە کە ژەهر خوارد دەکرێت، کاتێك هەندێك لەقوتابییەکانی پێشنیاری بۆ دەکەن لەشار بچێتە دەرەوەو ڕابکات تاوەکو ژەهری شوکران نەخواتەوەو

سەر ڕێگایەك كە زۆر بەڕاشكاوی ڕێگای كۆچەرانە:

*" فیدرۆس: .... ئەرێ سوقرات، تۆ دەڵێی بێگانەیەكی پێویستیت بەڕێنمایی هەیە، نەوەكو هاوڵاتییەكی شارەزای ناوچەكە. لەڕاستیدا تۆ لەو شارەدا ناچیتە دەرەوە، تەنانەت گەشتیش ناكەیت و، لەشووراكانی شار زیاتر دوور ناكەویتەوە، بۆیە ئەگەر بۆچوونی من ڕاست بێت ...*

*سوقرات: هاوڕێم بەزەییت پێمدا بێتەوە. وەكو ئەوەی دەبینی، من پیاوێكم حەز بەفێربوون دەكەم، ئێ خۆ گوندو درەخت هیچ شتێكم فێرناكەن، پیاوانی شار فێرم دەكەن و لێیان فێردەبم. لەگەڵ ئەوەشدا، پێم وایە تۆ ئەو دەرمانەت دۆزیوەتەوە كە پاڵم پێوە دەنێت لەشار بێمە دەرەوە* — dokeis moi tes emes exodou to pharmakon eurekenai. *ئەدی ئاژەڵ كاتێك برسییە، شوان چیلكە دارێك، یا هەندێك گیا بەدەستەوە ناگرێت، تاوەكو پەلكێشیان بكات بەدوای خۆیدا؟ تۆش وا لەمن دەكەیت. لەمیانەی ئەو وتارانەی كە لەسەر كاغەزدا نووسراونەتەوەو* — en biblíois، *دەیانخەیتە بەردەمم، پێم وابێت وام لێ دەكەیت هەموو ئەتیكەت[1] بەدوادا بكەم، بگرە ڕەنگە پەلكێشی شوێنی تریشم بكەیت، هەر شوێنێك كە خۆت پێت خۆشە. بەهەرحاڵ، مادام ئێستا گەیشتوومەتە ئێرە، ئەوە حەز دەكەم پاڵبكەوم، تۆش چیت پێخۆشە وابكە تاوەكو بتوانیت ئەو كاغەزانەم بۆ بخوێنیتەوە، هەركاتێك ئامادەبووی، دەست بەخوێندنەوە بكە ...".*

---

نەمرێت لەزیندانەدا، بەڵام سوقرات ئەم كارە ڕەتدەكاتەوەو پێی باشترە لەزیندانی شاردا بمرێت نەوەكو لەیاسا ڕابكات. (وەرگێڕی كوردی)

١) ئەتیكا دەكاتە ئەم ناوچەیەی كە ئەسینا دەبێتە پایتەختی.

لەوچرکەساتەدا کە سوقرات ڕادەکشێت و فیدرۆسیش بەئیسراحەتی خۆی وەزعێك هەڵدەبژێرێت بۆ چارەسەرکردنی دەق، یا ئەگەر حەز دەکەن دەڵێین فارماکۆن، ئەوە دیالۆگەکەی نێوانیان دەسپێدەکات. وتارێکی نووسراو لەلایەن لیسیاس ــ Lysias[1]، یا فیدرۆس دەخوێنرێتەوە، وتارێك ئەگەر لەئێستادا ڕاستەوخۆ دەربڕاو بێت و، لەئامادەگی سوقراتدا پێشکەشبکرێت، هەمان ئەم کاریگەرییەی نابێت. ئەوە تەنیا گوتاری نووسراوە لەسەر کاغەز ــ Logoi en biblion، وشەی دواخراو، ئەزبەرکراو، داپۆشراو، نووشتاوەو، پاڵمان پێوەدەنێت چاوەڕوانی بکەین و، حەزمان بچێتێ لەماوەی کاتی ڕۆشتنەکەدا. دەڵێین، تەنیا وشەی شاراوە دەتوانێت بەو شێوەیە سوقرات کێش بکات. ئەگەر ئەوە گوتارێکی ئامادەکراو بووایە، بێ پەردەو پەنا بووایە، ڕووت و قووت، لەلایەن کەسەکەوە خۆی پێشکەش بکرابووایە، وەکو حەقیقەتێك بەبێ پێچ و پەنا، دەڵێین ئەگەر گوتارێکی دوا نەخراو بووایە، ئەوە سوقراتی کێش نەدەکرد. نەخێر، هەرگیز نەیدەتوانی سوقرات کێش بکات بۆ دەرەوەی میتۆدی ڕۆژانەی خۆی وەکو ئەوەی ئێستا لەژێر کاریگەری فارماکۆندایە. باپێش ڕووداوەکان بکەوین، ئێستا ئێمە لەبەردەم نووسیندایین، فارماکۆن.

بێگومان تێبینی ئەوەتان کردووە کە ئێمە لێرەدا وەرگێڕانێکی تایبەتی ئەفلاتون دەخەینەڕوو، ئەم وەرگێڕانەی چاپ و پەخشی گویلاوم بودێیە ــ

---

[1]) لیسیاس لەماوەی نێوان سالآنی (٤٤٥ ــ ٣٨٠) ی پێش زایینیدا لەئەسینا ژیاوە، یەکێك بووە لەناودارترین گوتارنووس و ناودارترین گوتاری نووسراویشی بەناوی (ئۆلۆمپیاکۆس) بووەو، پێدەچێت لەساڵی (٣٨٨) ی پێش زایین خوێندبێتییەوە. (وەرگێڕی کوردی)

Guillaume Bude، كە بەوەرگێڕان و چاپێكی زۆر باش دادەنرێت و، لەناوەندە ئەكادیمییەكانیشدا دانی پێدانراوە، لێرەش لەبارەی فیدرۆسەوە ئەوە لەلایەن لیۆن رۆبین ـ Leon Robin وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی فەرەنسییەوە. ئێمەش لێرەدا بەردەوام ئەم دەقە وەرگێڕاوە بەكاردێنین و هەوڵدەدەین هەر كات بۆ گوتارەكەی ئێمە پێویستبوو، دەقی ئەسڵی یۆنانی بەكاربێنین و دەیخەینە نێوان دوو داشەوە. ئەم كارەش، بۆ نموونە لەگەڵ زاراوەی فارماكۆندا دەكەین.

ئەو كات بۆمان دەردەكەوێت، هیوادارم بەشێوەیەكی زۆر باش بێت، كە فرە مانایی بۆتە هۆی ئەوەی نەكرێت دەستنیشان بكرێت، یانیش زێدەڕۆیی بكرێت لەدەستنیشانكردنی ماناكانی ئەم زاراوەیەدا. دەڵێین بووە هۆی، بەبێ ئەوەی پێمان وابێت ئەوە هەڵەیە كە خودی زاراوەكە خۆی وەربگێڕدرێت بۆ "چارەسەری" و "ژەهر" و "دەرمان" و "شەرابی خۆشەویستی" و .... تاد. هەروەها تێبینی ئەوەش دەكەین كە تا چ ڕادەیەك یەكێتی پێكهاتەی ئەم چەمكە دووچاری پەرت و بڵاوی هاتووە، یا بەمانایەكی تر بنەماو لۆژیكی نامۆی ئەو چەمكەیە كە بەدالەكەی خۆی دەبەستێتەوە، دەڵێین دووچاری پەرتبوون و ڕووپۆشكردن و شێواندن بۆتەوەو، وای لێهاتووە ئەستەمە بەشێوەیەكی ڕێژەیی بخوێنرێتەوە.

بێگومان ئەوەش لەبەر وریا نەبوونی وەرگێڕەكان و سەرەڕۆییانە، هەروەها بەپلەی یەكەمیش لەبەر ئەو زەحمەتی و ناخۆشی و ترسە زۆرەی كە ناتوێتەوەو هاوشانی هەموو وەرگێڕانێكە. زەحمەتییەك كە ئەنجامی گواستنەوە نییە لەزمانێكەوە بۆ زمانێكی تر، زمانێكی فەلسەفی بۆ زمانێكی تر، بەڵكو وەكو

ئەوەی تێبینی دەکەین پێوەندی هەیە بەگواستنەوە لەنێو زمانی یۆنانی خۆیدا، واتا لەیۆنانییەوە بۆ یۆنانی، لێرەشدا توندوتیژی زیاتر لەگەڵ خۆیدا دێنێت، کاتێك لەزمانی نافەلسەفییەوە دەچێتە نێو زمانی فەلسەفی. جگە لەکێشەی وەرگێڕان، ئێمە لێرەدا کێشەی چوونە نێو خودی فەلسەفەشمان هەیە.

ئەو کاغەزانەی ـــ biblia کە وا دەکەن سوقرات ڕابکێشنە دەرەوەو خۆپارێزییەکەی بشکێنن، بیهێننە دەرەوە لەو پانتاییەی حەزی لێ دەکات فێربێت و، خەڵك فێربکات و، قسەبکات و، ببیستێت ـــ سنوورو پانتایی شووڕای شار ـــ ئەم کاغەزانە دەقێکی نووسراو لەخۆ دەگرن کە لەسەر دەستی "بەتواناترین نووسەرانی ئێستا ـ deinotatos on ton nun graphein" نووسراوەتەوە کە بریتییە لەلیسیاس ـ Lysias.

فیدرۆس دەقەکەی هەڵگرتووە، یا ئەگەر حەز دەکەن دەڵێین فارماکۆنەکەی هەڵگرتووەو، لەنێو عەباکەی خۆیدا شاردوویەتییەوە. فیدرۆس لێرەدا پێویستی بەوە هەیە ئەم دەقە لەگەڵ خۆیدا بگێڕێت، چونکە ئەم دەقەی ئەزبەر نەکردووەو، لەنێو دڵیدا جێگیر نەبووە. ئەو خاڵە زۆر گرنگە کە ئێمە لێرەدا دەیخەینەڕوو، چونکە کێشەی نووسین بەگشتی پێوەندی هەیە بەکێشەی "ئەزبەرکردن و پاراستنی لەنێو دڵدا".

بەرلەوەی سوقرات لەسەر پشت ڕابکشێت و، داوا لەفیدرۆسیش بکات ئەویش ئیسراحەتی خۆی وەربگرێت، ئەوە پێشتر فیدرۆس پێشنیاری ئەوە بۆ سوقرات دەکات، بەبێ ئەوەی دەقەکە بخاتەڕوو، هەندێك باسی بیروبۆچوونی لیسیاس و پاساوەکانی و مەبەستەکانی ـــ sa dianoia بۆ بکات، تاوەکو سوقرات باشتر

ـيناسێت. بەلام، سوقرات قسـەكانی پـێ دەبڕێت و، پێـی دەڵێـت:" ئـەوە باشـە، ـەلام ئـازیزم دوای ئـەوەی ئـەو شـتەم نیشـاندەدەی كـە بەدەسـتی چـەپت لـەژێر عەباكەتـدا شـاردووتەتەوە .. گـرەو دەكـەم ئـەوەی دەسـتت، خـودی هــەمان ـەقەكەیە _ton logon auton".

لـەنێوان ئـەم داوایـەو، دەسـكردنی فیـدرۆس بەخوێندنـەوە، ئـەو كاتـەی كـە فارماكۆن لەژێر عەباكەی فیدرۆسدا شاردرابۆوە، ئەوە فارماسیێ ئامادە دەكرێت و، میتۆلۆژیاكانیش سەرف دەكرێن.

ئەریێ باشە ئەوە ڕێكەوتە، یا هەماهەنگییە، پێش ئـەوەی ڕۆژمێـری ئاشـكرای نووسین وەكو فارماكۆنێك بخرێتـە ڕوو لەناوەڕاسـتی میتۆلۆژیـای تووتـدا، دەڵێین ئایـا بەیەكـەوە كۆكردنـەوەی كاغـەز ــ biblia و دەرمـان مەبەسـتێكی خراپـی لەپشـتەوە نییـە؟ ئایـا جێگـای گومـان نییـە؟ چـونكە لەبەرانبـەر پزیشـكی ڕاستەقینەدا كە لەسەر زانست دامەزراوە، ئـەوە بەیـەكجار مومارەسـەی عەشـوایی دێتە پێشەوە، كـاركردن بـەپێی هەنـدێك دەرمـان كـە ئەزبـەركراون و، لـەنێو دڵـی مرۆڤەكانــدا بوونیــان هەیــە. مەعریفەیــەك كــە لەكتێبەكانــەوە وەرگــیراوە، بەكارهێنانێكی كوێرانەی داوودەرمانە. پێمان گووتراوە كە هەموو ئەوانـە، دەچـنە نێو خانەی هەوەس:" دەزانم خـەڵك دەڵـێن ئـەو پیـاوە شـێتە، لەبەرئـەوەی تـازە لەشوێنێك لەنێو كتێبێكدا _ ek biblíou شتێكی خوێندۆتـەوە، یـا بیسـتوویەتی، یا ئەوەتا بەڕێكەوت فێری دروستكردنی هەندێك دەرمان بووە ــ pharmakiois، ئێستا خۆی لێ گۆڕاوەو، وا دەزانێت پزیشكە، لەكاتێكـدا هـیچ شـتێكیش لـەبارەی هونەری پزیشكی نازانێت".

هێشتا ئەم بەیەکەوە کۆکردنەوەیەی نێوان نووسین و فارماکۆن، پێدەچێت بەڕانی و ئەنجامی ڕێکەوت بێت. بەڵام مەبەست و گوزارشتەکە، هەمان شتە: هەمان گومان هەیە، هەمان جوولە، هەریەك لەنووسین و دەرمان، نووسین و چالاکی شاراوە، نادیار، مەحکوم بەئەزموونگەرایی عەشوایی و ڕێکەوت، هانابردنەبەر ڕێگاو شێوازی سیحرئامێزانە کە پێویست نییە. نووسین و مەعریفەی مردووی چەقبەستوو، هەڵگیراوو شاراوە لەنێو کاغەزی نووسراودا، چیرۆکی کەڵەکەبوو و، دۆسیەو وەسف و شێوازێك کە ئەزبەر کراون لەنێو دڵدا، هەموو ئەوانە نامۆن لەئاست مەعریفەی زیندوو و دیالیکتیك، وەکو چۆن فارماکۆن نامۆیە بەزانستی پزیشکی، وەکو نامۆیی میتۆلۆژیا بەمەعریفە.

کاتێکیش پرسەکە پێوەندی بەئەفلاتونەوە هەیە، کە لەکاتی پێویستدا زانی چۆن بەشێوازێکی جوان چارەسەری میتۆلۆژیا بکات لەمیانەی هێزی میتۆلۆژیا خۆی، وەکو بەرەبەیانی لۆژیك و تەتەڵەی یەکەمی، ئەوە ئێمە ئیدراکی فراوانی و گەورەیی ئەو دیدارەی دوایی دەکەین. ئەو زەحمەتییە لەوەدا دەردەکەوێت کە ــ ئەمەش ئەو نمونەیەیە ئێمە لێرەدا بەلامانەوە گرنگە و، سەدانی تری لەو شێوەیەش بوونیان هەیە ــ لەمیانەی ئەوەی حەقیقەت ــ ئەسڵ ــ ی نووسین وەکو فارماکۆنێك بەستراوەتەوە بەمیتۆلۆژیا، میتۆلۆژیای تووت کە ئێستا دێینە سەرباسکردنی.

تا ئەو خاڵەی نێو دیالۆگەکە هێشتا فارماکۆن و نووسەران ــ grapheme، هەریەکەیان لەدوورەوە بەنهێنی ئاماژە بۆ ئەویتریان دەکات، وەکو ئەوەی ڕێکەوت بێت لەیەك کاتداو، بەیەکەوە لەنێو هەمان دێڕ دەردەکەون، بەهۆکارێك

ﻛ هێشتا دیار نییه و، بەنهێنی ماوەتەوەو، ڕەنگە دوایی هەموو شتێکیش هەر ـەنەقەست و بەمەبەست نەبووبێت. ئێمە تاوەکو ئەم گومانە بڕەوێنینەوە، ـەگریمانی ئەوەی هەردوو گوتەزای ویست و ناویست، هێشتا دەسەڵاتی ڕەهایان هەیە لەخوێندنەوەدا، ئەگەرچی بۆ یەك چرکەش ئێمە ئەم بڕوایەمان نییە، ـەلایەنی کەم لەسەرئاستی دەقگەراییدا کە لێرەدا پێشکەشی دەکەین. ئینجا ئێستا بابێینە سەر بەشی دوایی ئەم دیالۆگە، کاتێك تووت دێتە نێو دیمەنەکە.[1]

لێرەدا بەبێ هیچ پێچ و پەنایەك، بەبێ خۆشاردنەوەو نێوەندگیری و، بەبێ هیچ شیکردنەوەیەکی نهێنی، نووسین وەکو فارماکۆنێك پێشنیار دەکرێت و رادەگەیەنرێت.

تێبینی ئەوە دەکەین بەشێوەیەك لەشێوەکان، دەکرا ئەم خاڵە بەلاوەبنرێت، وەکو زیادەیەك، بکرێتە پاشکۆیەك. ئەگەرچی لەبەشەکانی پێشووتردا ڕێگای بۆ خۆشکراوە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەفلاتون هەر وەکو چیرۆکێك بۆ خۆشی دەیخاتە ڕوو، وەکو زەڵاتەی پێش خواردن وایە، یا با بڵێین شیرینی و چای دوای خواردن. ئەو کاتەی ئەم زیادەیە دەخرێتە سەر نووسینەکە، لەو چرکەساتەدا هەموو توخم و بابەتەکانی ئەم دیالۆگە تەواو ماندوو بوون و، خەریکن دەگەنە کۆتایی، لەو چرکەساتەدا زیادەکە دێت کە بریتییە لەنووسین، یا ئەگەر پێتان خۆشە دەڵێین فارماکۆن:" بەو شێوەیە ئێمە بایی خۆی باسی هونەرمان کرد

---

[1]) لەزۆر شوێندا دریدا زاراوەی دیمەن بەکاردێنێت وەکو ئەوەی لەنێو زاراوەی شانۆییدا بەکاردێت و بەهەمان ماناش بەکاری دێنێت تاوەکو شێوازی درامی بدات بەنووسینەکانی و، زمانێکی نیمچە شانۆییش بەکاردێنێت. (وەرگێڕی کوردی)

لەنێو گوتارەکاندا و نا ئامادەگی هونەریش ... to men tekhnes te kai atekhnias logon".

لەگەڵ ئەوەشدا، پرسیاری نووسین لەنێو ئەم چرکەساتە پڕ لەشەکەتی و ماندووبوونەدا، خۆی جێنشین دەکات و دەردەکەوێت.[1] وەکو چۆن زاراوەی "شەرمەزارکەر ــ aiskhron" یا زاراوەی "بەشێوەیەکی شەرمەزارکەرانە ــ aiskhros" یا ئابڕووبەرانە گوزارشتی لێ دەکات، ئەوە لێرەدا پرسیارەکە لەسەر شێوەی پرسیارێکی ئەخلاقی دەردەکەوێت و، خۆی نمایش دەکات. بەتەواوی گرەو لەسەر ئەخلاق دەکات، ئەخلاق بەمانای جیاوازی و ناکۆکی نێوان خێرو شەڕ، وەکو چۆن بەمانای چاکەخوازی و شەڕانگێزی، وەکو چۆن بەمانای عورف و ئەخلاقی گشتی و ئادابی کۆمەڵایەتی بەکاردێت. لێرەدا مەسەلەکە پێوەندی هەیە بەو شتانەی کە دەشێت و دەکرێت، یا ناشێت و ناکرێت ئەنجام بدرێت.

---

[1]) ئەگەر پرسیاری نووسین لەنێو "چەند وانەیەك لەبارەی زمانزانی گشتی" سۆسێر دوورخرابێتەوە بەشێوەیەکی کۆتایی و خرابێتە دەرەوەی کار، ئەم بەشەش کە ڕۆسۆ بۆی تەرخان دەکات، واتا پرسیار لەبارەی نووسین لەنێو کتێبی (وتارێك لەبارەی بنەچەی زمانەکان ــ Essai sur Lorigine des langues) ئەمیش سەرەڕای گرنگی کردەیی، بەڵام وەکو زیادەیەك تێیدا پیشاندراوە، پاساوێکی تەواوکەر، "شێوازێکی تر بۆ بەراوردکردنی زمانەکان و بڕیاردان لەبارەی کۆنییان". ئێمە دیسان هەمان ڕێوشوێن لەنێو (ئینسکلۆپیدیای زانستە فەلسەفییەکان) ی هێگلدا دەبینین، تەماشای "بیرو پیرێتی ــ Le puits et la pyramide" ی جاك دریدا بکە لەنێو ئەم کتێبەدا کە بەکۆمەڵ نووسراوە بەناوی "هێگل و هزری نوێ ــ Hegel et la pensee modern".
(تێبینییەك لەلایەن وەرگێڕەوە: جاك دریدا دواتر ئەم توێژینەوەی خستە نێو کتێبی پەراوێزەکانی فەلسەفە ــ Marges-de la philosophie. (وەرگێڕی عەرەبی)

ئەم دڵەڕاوكێیە ئەخلاقییە، هەرگیز جیاواز نییە لەپرسی حەقیقەت و یادەوەری و دیالۆگ. پرسی دیالۆگ كە هەر خێرا وەكو پرسی نووسین تەماشا دەكرێت، پەیوەستە بەبابەتی ئەخلاق، بگرە لەوەش زیاتر لەمیانەی ماهییەتەوە گەشەی پێدەدات، نەوەكو مەسەلەكە هەر تەنیا تایپكردن و نووسینەوە بێت. بەهۆی ئەو دیالۆگەی كە لەمیانەی گەشەكردنی سیاسییانەی شارو، بڵاوبوونەوەی نووسین و، چالاكییە زۆرەكانی سۆفیستەكان و نووسەرانەوە هاتۆتە ئارا، ئەوە زیاتر جەخت دەكرێتە سەر شێوەزاری گوتارو، سیاقی سیاسی و كۆمەڵایەتی. ئەو ناوبژیوانییەی سوقرات پێشنیاری دەكات، دێت ڕۆڵی خۆی دەبینێت لەبەراوردكردنی بەهای نێوان گونجاوو نەگونجاودا (euprepeia\aprepiea):" لەكاتێكدا زانینی ئەوەی كە ئایا كارێكی شیاوە ئێمە بنووسین؟ یا نەنووسین؟ ئەو مەرجانە چین كە دەبێت تێیاندا مرۆڤ بنووسێت؟ یا نەنووسێت؟ بۆیە دەڵێین — ئەی وانییە؟ - پرسیارێكە بەردەوام ئاڕاستەمان دەكرێتەوە.

ئەرێ كارێكی شیاوە بنووسین؟ ئایا نووسەر بوونەوەرێكی قبووڵكراوە؟ باشە بنووسین؟ ئایا نووسین كارپێكراوە؟

بێگومان وەڵامەكە نەخێر دەبێت، بەڵام وەڵامی ئەو پرسیارەش ئەوەندە ئاسان نییەو، سوقراتیش، لەنێو گوتارێكی عەقڵانی لۆگۆسیدا،[1] لەبەرژەوەندی

---

١) لۆگۆس - logos عەقڵ، چەمكێكە دریدا كاری زۆری لەسەر دەكات، بۆیە ڕاستەوخۆ لەنێو كتێب و نووسینەكانی تریدا دەیبەستێتەوە بەچەمكی لۆگۆسێنترالیزم — ناوەندێتی عەقڵ، یا باڵادەستی عەقڵ، یا عەقڵ سالاری. ستراتیژیەتی هەڵوەشاندنەوەی جاك دریدا، لەلایەنی فەلسەفی و ئەپستیمییەوە، هەوڵدەدات ئەوەمان بۆ ئاشكرا بكات كە لۆگۆسێنترالیزمی خۆرئاوایی تەنیاو تەنیا وازییەكی زمانەوانییە، بەرز بۆتەوە بۆ ئاستی

خۆی پێڕەوی لێناکات. بەڵکو سوقرات هەر ئەوەندەیە سرووشی پێدەدات و دەیگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کە قسەیەکی باوبلاوەو (پڕوپاگەندە ـ akoe)، چیرۆکێك خەڵك گوێیان لێ بووەو بەشێوەیەکی زارەکی دەیگێڕنەوە: " بەهەرحاڵ، ئەو حەقیقەتەی کە ئێمە دەیزانین بریتییە لەقسەو قسەلۆکی خەڵکانی کۆن، ئەگەر ئێمە لەتواناماندا بووایە خۆمان بیدۆزینەوە، ئایا هێشتا خۆمان بەو شتانە سەرقاڵ دەکرد کە مرۆڤەکان بڕوایان پێی هەیە؟".

ناتوانین بەخۆمان و، لەنێو خۆماندا، حەقیقەتی نووسین بزانین، واتا وەکو ئەوەی تێبینی دەکەین نا ـ حەقیقەتی نووسین بزانین. نووسین بابەتێکی زانستی پێکناهێنێت، بەڵکو هەر تەنیا چیرۆکێکی گێڕدراوەیە، چیرۆکێکی دووبارە بۆوەیە. بەم جۆرە دەستنیشانی پێوەندی نێوان نووسین و میتۆلۆژیا دەکرێت، جیاکاری و مەعریفەیان، بەتایبەتیش ئەو مەعریفەیەی مرۆڤ لەخۆی و، خودی خۆی وەریاندەگرێت. لەهەمان کاتیشدا، لەمیانەی نووسین، یا لەمیانەی میتۆلۆژیاوە، گوزارشت لەدابڕانی ڕێژەیی و دوورکەوتنەوە لەئەسڵ دەکات. تێبینی ئەوەش دەکەین کە بەتایبەتی ئەوەی نووسین لەشوێنێکی ترەوە پێی تۆمەتبار دەکرێت ـ گوایە بریتییە لەدووبارەکردنەوەی بێ مەعریفە ـ ئەوە لێرەدا دەستنیشانی ئەو ڕووگەیە دەکات کە بەرەو زاراوەی lenonce ی دەبات وەکو دەستنیشانکردنێك بۆ شوێنگەو پایەکەی.

---

شارستانییەت. ئەم کارەشی بەشێکی سەرەکییە لەنێو ئەم کتێبەی بەردەستمان و کتێبی (لەبارەی زانستی نووسینەوە ـ گراماتۆلۆژیا). (وەرگێڕی کوردی)

ئـەم ديالۆگـە بەدووبارەكردنەوەيـەكى نـا مەعريفييانـە دەسـپێدەكات. لـەو چركەساتەوە، چيتر نزيكى لەنێوان نووسين و ميتۆلۆژيا چێنابێت، ئەو دووەى زۆر جياوازو تايبەتن لەلۆگۆس و ديالۆگ، مەگەر لەميانەى دەستنيشانكردنەوە نەبێت. ـواى ئـەوەى، بـەبێ مەعريفـە، ئـەوەى دووبـارە كـردەوە كـە نووسـين بريتييـە ـەدووبارەكردنـەوەى بـێ مەعريفـە، ئـەوە سـوقرات دێـت بنـەماى بەڵگـەخوازى و، ـۆگۆسـى پاسـاوى نێـو ديالۆگەكـەى خـۆى دادەڕێـژێت، بەپشـت بەسـتن بەقسـەو قسەلۆكى خەڵكانى پێشـينە ـ پڕوپاگەنـدەى خـەڵكانى كـۆن akoe، دێـت پشـت بەبونيادى خوێنراوەى پەيوەست بەڕەگوڕيشەو نەسەبى كۆنى ميتۆلـۆژى نووسـين دەبەستێت، ئـەو كاتـەى ميتۆلۆژيـا گـوڕزى يەكـەم دەوەشـێنێتە نووسـين، ئـەوە لۆگۆسـى سـوقرات دێـت، زيـاترو زيـاتر تۆمەتبارەكـە ـ نووسـين ـ گۆشـەگير دەكات.[1]

---

١) يـەكێك لـەو بابەتانـەى دريـدا گەرەكيـەتى هەڵبوەشـێنێتەوە، مانـاو دەلالـەتى ڕاسـتييە، هەموو ئەو دەلالەت بەخشين و دەستنيشانكردنانەى ميتافيزيكا بۆ چەمكى ڕاستى، بەڕاى دريدا، ناكرێت لەلۆگۆس جيا بكرێتەوە، يا بەلايەنى كـەم عـەقڵێك لەلۆگۆسـەوە سەرچـاوە دەگرێت، چونكە دەستنيشانكردنى ماناو چەمك بەخشـينو دەلالـەت بەخشـين، بـەردەوام لەلۆگۆسەوە سەرچـاوەى گرتـووە. پێوەنـدى بنـەڕەتى و بنچـينەيى لۆگـۆس بـەدەنگ ـ فۆنەتيك ـ هەرگيز نەپچڕاوە، چـونكە لەجەوهـەردا، دەنـگ لايـەنێكى هـزرە، لەبەرئـەوەى هزريش بەمانا عەقڵييەكەى بۆ خۆى لۆگۆسە، كەواتە لۆگـۆس لەسـايەى دەنگـەوە، مانـاو دەلالەت ديارى دەكات و بەرهەم دێنێـت. هـەر لـەم سـەردەمانەى ئەفلاتونـدا، يـا كـەمێك دواتر، ئەرستۆ پێى وابووە ئەو لەرينەوانەى نێو دەنگ، ڕەمـزى بـارودۆخ و حـاڵى ڕۆحـن، وشەى نووسراويش ڕەمزى ئەو وشانەيە كە دەنگ پەخشيان دەكـات، ئـەوە لەبەرئەوەيـە، چـونكە دەنـگ يەكـەم بەرهەمهێنـەرى ڕەمـزە بەراييەكانـەو، ڕاسـتەوخۆ بەڕۆحـەوە

پەیوەستە. کەواتە ڕۆح کە یەکەم بەرهەمهێنەری دالەکانە، ئەوا ئەو دالانـە، ڕەنگدانـەوەی حاڵەتی ڕۆحن. بەو شێوەیە دریدا هەر لەفەلسەفەی گریکی کۆنەوە، ئەو بارودۆخ و حاڵەتە ڕاڤە دەکات کە وایان لەدەنگ کردووە، ببێتە دەربڕی ڕۆح و حاڵەتەکانی و لێکدانەوەی دەلالەتەکانی دەنگیشیان بەلۆگۆس بەخشی. بەپێی پرۆسەیەکی مێژوویی قووڵ، مانای ئامادەگی و بوون، پەیوەستی دەنگ و فۆنەتیك بووە، بەو شێوەیە سەردەمی باڵادەستی لۆگۆس، ئەو سەردەمە بووە، تێیدا لەشوێن و پێگەی نووسین کەم کراوەتەوەو بەئاستێکی نزمتر نمایشکراوەو سەیرکراوە. هەر لەم سەردەمەشدا، دال و مەدلول هاوتەریب و هاوشانی یەکتری کراون بەشێوەیەك نابێت یەکتر ببڕن. (وەرگێڕی کوردی)

# بەشی چوارەم

## باوکی "لۆگۆس"[1]

١) هزری گریکی، عەقڵی بەمانای لۆگۆس خستە جێگای میتۆلۆژیا، ئەوەش کاتێك تالیس ئەو بیرۆکەیەی داهێنا، گوایە لۆگۆس بەسەر میتۆسدا زاڵبووەو، لەناوی بردووە تا سەرمەدییەتی بوونی خۆی رابگەیەنێت، لەم کاتە بەدواوە باڵادەستی لۆگۆس لەنێو گوتاری پاش تالیسدا سەر هەڵدەدات. ئەفلاتونیش لەمیانەی ئەم دیالۆگەو بەشێکی تری نووسینەکانیدا، ئەم ڕەواییە بەلۆگۆس دەبەخشێت. لەڕاستیدا ئێمە بۆ ئەوەی لەو پێگە بەرزەی ئاخافتن تێبگەین، ئەوە دەبێت لەو ڕەگو ڕیشە فەلسەفییە شارەزا بین کە بۆتە هۆی ئەوەی لۆگۆس بەسەر میتۆسدا زاڵ بێت و باڵادەستی گوتاری خۆی بسەپێنێت، چونکە دیارە لەو کاتەی کە فۆنۆسێنترالیزم پاڵپشتی سەرەکی لۆگۆسێنترالیزمە، ئەوە لەهەمان کاتیشدا لۆگۆسێنترالیزمیش پاڵپشتی سەرەکی فۆنۆسێنترالیزمە، واتا ئەوانە بەردەوام دوو سێنتەرن یەکتری تەواو دەکەن و، ئەستەمە یەکێکیان بەبێ پیرۆزکردنی ئەوی تر بتوانێت باڵادەستی خۆی بسەپێنێت. بەپێی ئەو حیکاتەی ئەفلاتون بێت لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا، خواوەندی نووسین کەسایەتییەکی لاوەکی و ملکەچەو تەنیاو تەنیا تەکنۆکراتێکی سادەیە، ئەندازیارێکە پرۆژەیەك پێشنیار دەکات، خزمەتکارێکی زیرەك و بەتوانایە، دەتوانێت هەر کاتێك گەرەکی بێت، بچێتە خزمەتی پاشای خواوەندەکان، ئەو خواوەندەی بەچاکی زانی لەنێو کۆڕو مەجلیسی خۆیدا پێشوازی لێبکات و بزانێت چی دەوێت. (وەرگێڕی کوردی)

چیرۆکەکە بەم شێوەیە دەسپێدەکات:

" سوقرات: باشە! بیستوومە دەگێڕنەوەو دەڵێن، گوایە لەنزیك نۆقراتیس لەمیسر، خواوەندێکی کۆنی میسری ژیاوە، ئەو خواوەندە دروشمەکەی بریتی بووە لەباڵندەیەکی پیرۆز کە ناسراوە بەئەبو منجل ـ فینیق،[1] ئەو خواوەندەش خۆی ناوی تووت Theuth بووە. ئەم خواوەندە، یەکەم کەس بووە زانستی ژمارەو، حیساب و، ئەندازەو، فەلەکناسی دۆزیوەتەوە، یەکەم کەس بووە کاغەزی قومارو، زاری یاریکردنی داهێناوە، لەکۆتاییشدا ـــ ئەوەش بزانە ـــ هەر بەخۆی پیتی نووسینی داهیناوەو دۆزیوەتەوە ـــ grammata. لەلایەکی تریشەوە، لەو کاتانەدا تامووس ـ Thamous[2] حوکمڕانی سەرتاپای وڵاتی میسری کردووەو، تەختەکەی لەو شارە گەورەیەدا بووە کە یۆنانییەکان ناویاننابوو "تیبەی میسر" و خواوەندەکەشی ناوی ئاموون ـ Ammon بوو.

ڕۆژێك تووت دێتە دەربارى پاشا بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ تامووس و، ئەو داهێنانەی خۆی بۆ نمایش دەکات و، پێی دەڵێت:" پێویست دەکات بەسەر هەموو میسرییەکاندا بڵاوبکرێتەوە!". بەڵام پاشا لێی دەپرسێت کە ئایا سوودی هەریەك

---

[1] ) جۆرە باڵندەیەکە لەبنەماڵەی لەقلەقەو، لەنێو کولتووری میسری کۆندا باڵندەیەکی پیرۆز بووەو، بەهۆی دەنووکە درێژو خوارەکەی ناونراوە ئەبو منجل، واتا دەنووك داس.

[2] ) یەکێك لەفیرعەونە کۆنەکانی میسرە.

ـەو داهێنانانە چییە؟ بەپێی ڕوونکردنەوەکانی و، بەپێی ئەوەی تامووس بڕیار ـەبارەی شتەکان دەدا، کە ئایا بەسوودن یا بێسوودن، هەندێکجار لۆمەی ـرەکانی دەکردوو، هەندێکجاریش ستایشی دەکردن بەپێی بەهای شتەکان. بۆیە ـەکو ئەوەی دەگێڕنەوە، تامووس لەبەردەم تووتدا، قسەی زۆری لەبارەی ـهێنانەکانی ئەم کردووە، ئینجا ستایش بووبێت، یا لۆمەکردن و ڕەخنەگرتن.

دەڵێین، ئەوەندە قسەی لەسەر شتەکان هەبووە کە کۆتاییان نایەت! بەلاّم کاتێك ڕۆڵی خستنەڕووی پیتەکانی نووسین دێت، ئەوە تووت دەڵێت:" ئەی جەنابی پاشا، ئەوە مەعریفەیەکە ــ to mathema وا دەکات میسرییەکان ـاناترو، زیرەکتر بن و، توانای بیرکردنەوەیان زیاتر بێت ــ sophoterous kai mnemonikoterous، یادەوەری و فێربوون، بەیەکەوە چارەسەریان بۆ دۆزراوەتەوە ـ Pharmakon. ئینجا پاشا وەلاّمی دەداتەوە .....".

با ئێمە لێرەدا قسەی پاشا ببڕین. ئێستا ئەم لەبەردەم فارماکۆندایەو، دەزانین کە بڕیارێکی لەبارەیەوە دەدات.

با ئێمە دیمەن و کەسەکان وەکو خۆیان ڕابگرین و، لەم دیمەنە ڕابمێنین. کەواتە، نووسین ـ یا ئەگەر حەز دەکەن فارماکۆن ـ ئێستا خراوەتە بەردەم پاشا تاوەکو بڕیاری لێبدات. وەکو دیارییەك و ڕێزێك لەلایەن هاوڵاتییەکەوە نمایشکراوە بۆ پاشاو سەروەرەکەی (تووت کە نیوە خواوەندە، قسە بۆ پاشای خواوەندەکان دەکات)،[1] بەلاّم بەر لەهەموو شتێکی تر، شتێکی دروستکردووەو نمایشکراوە

---

١) مەبەست لەنیوە خواوەند ئەوەیە کە کوڕی خواوەند بووە. کاراکتەری بەشێکی زۆری میتۆلۆژیا کۆنەکان، یا خۆیان خواوەند بوون، یا کوڕو کچی خواوەند بوون، واتا نیوە

تاوەکو هەڵبسەنگێنرێت. ئەم شتە دروستکراوە، هەر خۆی داهێنانێکە، توانایەکە بۆ کارکردن و هێزێکی ئیجرائی هەیە. ئەم داهێنانە خۆی فێڵبازانەیەو کارایە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم دیارییە هێشتا هیچ بەهایەکی دیاریکراوی نییەو، هێشتا بەهاکەی نەخەملێنراوە. ڕاستە بەهای نووسین ـ یا فارماکۆن ـ پێشکەش بەپاشا کراوە، بەڵام ئەوە پاشا خۆیەتی کە بەهاکەی پێدەبەخشێت. ئەوە پاشا خۆیەتی نرخی ئەم کارە دەستنیشان دەکات کە پێی هەڵدەستێت، ئەم کە دیارییەکە وەردەگرێت، هەر ئەمیش بڕیاردەدات دایدەمەزرێنێت و بونیادی دەنێت.

بەم شێوەیە، پاشا یا خواوەند (تاموس نوێنەری ئاموونە[1] کە پاشای خواوەندەکانە، پاشای پاشاکان و، خواوەندی خواوەندەکانە ـــ O basileu، تووتیش بەناوی ـ گەورەی خواوەندەکان ـ ناوزەدی دەکات). دەڵێین ئەم ناوە

---

خواوەند، یا بەشێکیان خواوەند بووەو پیرۆز کراون. بۆ نموونە کەسایەتی گلگامێش لەنێو میتۆلۆژیای سۆمەری کۆندا، سێچارەگی خواوەند بووە. (وەرگێڕی کوردی)

[1]) بێگومان دیارە تاموس لەلای ئەفلاتون، هەمان ناوی خواوەند ئاموونە کە دواتر پێویستە لەسەرمان وێنەی ڕوخساری بکێشین (پاشای خۆرو باوکی خواوەندەکان). لەم بارەیەوە بڕوانە ئەم پرس و وتووێژەی کە لێی کەوتۆتەوە لەلای فرۆتیگی، بەتایبەتیش لەلای ئیسلەر لەنێو کتێبی (ئەفلاتون و پیتی ئەبجەدی میسری ـــ Platon und das agyptische Alphabet, in Archiv)، هەروەها کتێبی (بۆ مێژووی فەلسەفە ـــ fur Geschichte der Philosophie)، هەروەها پاولی فیسوفا ـــ Pauly Wissowa لەنێو کتێبی (ئینسکلۆپیدیای زانستەکانی چاخی کۆن ـــ Real Encyclopadie der classischen)و، ڕۆشێر ـــ Roscher لەنێو کتێبی (زاراوەی هونەری نێو میتۆلۆژیای یۆنانی و ڕۆمانی، وانەی تاموس ـــ Lexikon der grieschischen und romischen Mythologie, art.Thamus).

خۆی، ناوێکی تری ئەسڵی بەهاکە خۆیەتی. نووسین خۆی هیچ بەهایەکی نییە ئەگەر ئەو نەبێت، نووسین هیچ بەهایەکی نابێت ئەگەر ئەم خواوەندە قبووڵی نەکات و وەری نەگرێت ـ بەو ڕادەیەی (پاشا ـ خواوەند) وەری دەگرێت و قبووڵی دەکات ـ بەو ڕادەیە بەهاکەی ڕەچاو دەکرێت. ئەوەش ڕێگر نییە لەوەی پاشا ـ خواوەند وەکو بەرهەمێك تەماشای فارماکۆن بکات، وەکو شتێکی دروستکراو ـ ergon، کە دروستکراوی خۆی نییە، بەڵکو لەدەرەوەڕا بۆی هاتووەو پێی دراوە، لەلایەن شتێکی کەمترو بچووکتر لەخۆیەوە هاتووەو، چاوەڕوانی بڕیاری باڵای ئەویش دەکات تاوەکو بەهاو کەینوونەتی ئەم بەرهەمە دیاری بکات.

خواوەند ـ پاشا نووسین ناناسێت و نازانێت، بەڵام ئەم نەزانی و نەدارییە، دەبێتە مایەی ئەوەی بەتەواوی بەشێوەیەکی سەربەخۆ بڕیاری لەبارەیەوە بدات. خواوەند پێویستی بەوە نییە بنووسێت، ئەو قسە دەکات، دەڵێت و، بڕیار دەدات، قسەکانی ئەو بەتەنیا بەسن. ئەگەر یەکێك لەنووسەرانی دیوانەکەشی، لەکاتی نووسیندا، شتێك وەکو زیادە بخاتە سەر قسەکانی، یا زیادیشی نەکات، ئەوە کردەی نووسینەوە خۆی کارێکی لاوەکییە.

بەدەسپێك لەم پێگەیەوە، پاشا ـ خواوەند، بەبێ ئەوەی ئەم ستایشە ڕەتبکاتەوە، دێت بەهای فارماکۆن ڕەتدەکاتەوە. بگرە، جگە لەوەی کە پێ وایە بێسوودە، ئەوە پیشانیدەدات کە هەڕەشەیەو زەرەریشی هەیە. ئەوەش شێوەو فۆڕمێکی ترە بۆ قبووڵنەکردنی نووسین وەکو دیاری. لەنێو هەموو ئەم ڕووداوانەدا، خواوەندی ـ پاشا ـ کە قسە ـ دەکات، دەڵێین وەکو باوك ڕەفتار دەکات. فارماکۆن لێرەدا پێشکەش بەباوك دەکرێت، بەڵام لەلایەن ئەمەوە

بێزراوەو نەخوازراوو خراپ تەماشاکراوەو، بەهاکەی ڕێزی لێ نەگیراوە. باوك هەمیشە بەرانبەر بەنووسین گومانکارەو چاودێری دەکات.

تەنانەت ئەگەر ئێمە نەشمانەوێت بەو ڕێگە ئاسانەدا بڕۆین کە پاڵمان پێوەدەنێت، لەپێوەندیدا بین لەگەڵ ڕوخسارە جیاوازەکانی پاشاو، خواوەندو، باوك، ئەوەندە بەسە بەوردی تێبینی بکەین ــ ئەوەش کارێکە وەکو ئەوەی بیزانین تا ئێستا پێش ئێمە کەس ئەنجامی نەداوە ــ بەشێوەیەك لەسەر هەمان ڕیتمی ئەفلاتونی وێنەیەك بکێشێت بتوانێت ئەسڵی ئاخافتن و دەسەڵاتەکەی، بەتایبەتیش لۆگۆس ـ le logos بگێڕێتەوە بۆ شوێنگەو پێگەی دەسەڵاتی باوك. لەبەرئەوەنا کە ئەم کارە هەر تەنیا لەلای ئەفلاتوندا ڕوو دەدات، یا لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی زۆر تایبەت هەر تەنیا لەلای ئەمدا بەدی دەکرێت. ئێمە بەئاسانی ئەوە دەزانین و خەیاڵی دەکەین، بەڵام ئەوەی ئەفلاتونییەت خۆی کە تەواوی شوێنگەو جومگەکانی میتافیزیکای خۆرئاوا[1] دادەپۆشێت وەکو چەمکێك،

---

[1] ) دریدا لەبەشێکی زۆری نووسین و کتێب و چاوپێکەوتنەکانی خۆیدا، هەوڵیداوە ئەو دیدگایە ئاشکرا بکات کە چۆن دوالیزم ـ دووانە لەدوا یەکهاتووەکانی فەلسەفەو هزری میتافیزیکی خۆرئاوا، هەر ئاوا بۆخۆیان لەنێو خۆیاندا یەکتر پووچەڵ دەکەنەوە، ئەوەی دواتر دێت، ئەوەی پێشووتری خۆی هەڵدەوەشێنێتەوەو تێکدەشکێنێت، وەکو ئەوەی هەڵوەشاندنەوە لەدوای بونیادگەری هات و بەلاوەی ناو بالادەستی تیڕوانینەکانی خۆی سەپاند. لەبەرئەوەی بەدوایەکداهاتنی چەمکەکانیش مەبەستی سەرەکی ئەو بوو، بۆیە هات لەنێو تەلارو هەرەمی زماندا دەستی بەکار کرد. فیلۆلۆژیاو گراماتۆلۆژیاو تیۆرەکانی تایبەت بەزمان و کشانی بونیادی ئەو تیۆرانەی خستەبەر باس و لێکۆڵینەوەی قووڵ و زۆر، تاوەکو لەبنەماکانی بونیادی گوتار بگات و بزانێت چۆن چەمکی نوێ بەزاراوە سواوو باوەکان دەبەخشێت. بۆیە هەڵوەشاندنەوە ڕاستەوخۆ هاوشانی سیمیۆلۆژیا بوو،

حویشی دێت لەگشتگیری ئەم جۆرە ئیلزامە بونیادگەرییە دەربازی دەبێت، بەڵکو ـگرە دێت بەشێوەیەکی زۆر زیرەکانە دەلالەتداری دەکات، ئەوەش ماناو دەلالەتی ـیبەتی خۆی هەیە.

لەبەرئەوەش نا چونکە لۆگۆس خۆی باوکە، بەڵکو لەبەرئەوەی لۆگۆس باوکی حویەتی. ڕەنگە ئێمە جیاواز بین لەو سەردەم و، بڵێین کەسی بکەرو قسەکەر، خۆی باوکی قسەکانی خۆیەتی. ڕەنگە ئێمە هەر زوو بەزوو ئیدراکی ئەوەشبکەین کە لێرەدا هیچ جۆرە خوازەیەك لەئارادا نییە، بەلایەنی کەم کاتێك ئێمە لەم وشەیەدا جێکەوتێکی باو بۆ هەر جۆرە ڕەوانبێژییەك بدۆزینەوە. بۆیە، لۆگۆس کوڕە، بەبێ ئامادەگی باوکی فەنا دەبێت و لەناو دەچێت، بەبێ یارمەتی ئێستای باوکی کۆتایی دێت. ئەوە ئامادەگی باوکییەتی کە بەرسف دەداتەوە، بەرسڤی ئەوو، لەجیاتی ئەویش. بەبێ باوکی، ئەم خۆی هیچ نییە، هەر تەنیا نووسینێك

---

لەبەرئەوەی هەڵوەشاندنەوەی گوتاری باڵادەستی میتافیزیکای خۆرئاوا، دەبێت لەسایەی هەڵوەشاندنەوەی سیمیۆلۆژیاوە دەبێت، ئەوە بوو جۆرە شیکارو ڕاڤەکردنێکی ئەدەبی لێ هەڵقوولا کە بەڕەخنەی هەڵوەشاندنەوە ناوزەد دەکرێت. شێوازی ڕەفتارو کارکردنی دریدا، لەگەڵ بونیادی میتافیزیکای خۆرئاوا، هەمان شێوازی تەهەکومی سوقراتییە، شێوازی کارکردن لەگەڵ میتافیزیکاو بڕینی ماوەیەکی زەمەنی و گوێبیستبوون لەشێوازی کارکردن و دەربڕینی، دواتریش بەرهەمهێنانی پرسیار. بەرهەمهێنانی پرسیار لەبنەڕەتدا شێوەیەکە لەشێوەکانی گومانکردن لەپرنسیبەکانی پڕۆسەی دامەزراوی میتافیزکی، وەڵامدانەوەی پرسیارەکان کارێکە دەکەوێتە ئەستۆی میتافیزیکا، کاتێکیش میتافیزیکا ناتوانێت وەڵام بۆ ئەو پرسیارانە دابین بکات، یا تەنانەت ئەو کاتەش کە وەڵام بۆ پرسیارەکان دابین دەکات، لەناوەخۆیدا دووچاری دژکاری دێت، ئەو کاتە دریدا دێت ئەو فرسەتە دەقۆزێتەوەو گورزی خۆی دەوەشێنێت. (وەرگێڕی کوردی)

نەبێت. بۆیە تایبەتمەندی نووسین بۆ نا ئامادەگی باوك دەگەڕێتەوە. دەشێت ئەو نا ئامادەگییەی باوك بەزۆر شێوە ڕاڤەبکرێت، جیاوازو تێکەڵاو، لەدوای یەك و لەتەنیشت یەك، وەکو ئەوەی مرۆڤ بەشێوەی مەرگی سروشتی باوکی لەدەستدا بێت، یا بەشێوەیەکی زۆر توندوتیژانە کوژرا بێت. لەحاڵەتی دووەمدا، بەهۆی هەر توندوتیژییەك باوك کوژرا بێت، ئینجا بیەوێت داوای بەهاناوە چوون لەم باوکەی بکات، بۆیە دەشێت باوك بەهانایەوە بێت، یا نەتوانێت بەهانایەوە بێت، ڕاستەوخۆ داوای یارمەتی لێبکات، یا بانگەشەی ئەوە بکات گوایە پێویستی پێی نییەو دەتوانێت دەسبەرداری باوکی بێت، ... تاد.

ئێمە دەزانین سوقرات چەندە جەخت دەکاتە سەر کوێرەوەری، ئەوەی کە دەبێتە مایەی بەزەیی پێداهاتنەوە، کوێرەوەری لۆگۆس کە ڕادەستی نووسین کراوە. بۆیە دەبینین دەڵێت:" ئەو بەردەوام پێویستی بەیارمەتی باوکی هەیە ــ tou patros aei deitai boethou، بەتەنیا خۆی، نە توانای هەیە، نە دەشتوانێت، خۆی بپارێزێت و بمێنێتەوە".

ئەوە کوێرەوەرییەکی ئاڵۆزە: تەنیایی یەتیمێك، نەوەکو هەر تەنیا پێویستی بەوە هەیە پاڵپشتی لێبکرێت لەمیانەی ئامادەگییەوە، بەڵکو پێویستی بەیارمەتی و بەهاوارچوونیشەوە هەیە. بەڵام، ئێمە لەکاتێکدا بەزەییمان بەمرۆڤی بێکەس و یەتیم دێتەوە، ئەوە لەهەمان کاتیشدا تۆمەتباریشی دەکەین، ئەوو نووسین تۆمەتبار دەکەین بەوەی هەوڵدەدەن باوك دووربخەنەوەو، خۆیانی لێ بەدوور بگرن. ئارەزووی نووسین وا وەسفکراوو دەستنیشانکراوو ئیدانەکراوە، وەکو ئەوەی ئارەزووکردن بێت لەبێکەسی و، یەتیمی و، ڕووخاندن و، خاپوورکردن و،

تێکشکاندن و، کوشتنی باوك. ئەرێ باشە ئـەم فارماکۆنـە تاوانبـار نییـە؟! ئـەدی ئەوە دیارییەکی ژەهراوی نییە؟!

پێگەی ئەو یەتیمە کە هیچ یارمەتییەك ناتوانێت لـەخۆی بگرێـت و، بیگەیـەنێت بەپێگەی نووسراو ــ grahpein، نووسـراو لەبەرئـەوەی چرکەسـاتێك دێـت تێیـدا ەقـی نووسـراو کـوڕی کـەس نییـە، بگـرە هـەر چـیتر کـوڕ نییـەو، چـیتریش دان بەنەسەبی خۆیەوە نانێت، بەمانای حەق وەکو ئەوەی بەمانای فرمان و ئەرك بێت.

بەپێچەوانەی نووسین، ئەوە لۆگۆسی زیندوو، بۆیە زینـدووە، چـونکە بـاوکێکی زینـدووی هەیـە ــ لەکاتێکـدا یـەتیم بـەنیوە مـردوو تەماشـا دەکرێـت ــ دەڵـێین بـاوکێکی هەیـە، ئـەم باوکـە لێـرە لەئێسـتادا ئامـادەگی هەیـەو، لەتەنیشـتییەوە وەسـتاوەو، لەپشـتییەتی و، لەنێویدایـە و، بەشـداره لـەجێگیربوونی و، بـەناوو کەسـایەتی خـۆی پاڵپشـتی لێ دەکـات. لێـرەدا لۆگۆسـی زینـدوو خـۆی دان بـەو حاڵەتەدا دەنێت، حاڵەتی ئەوەی لەپلـەو پێگـەدا ئاسـتنزمترو لاوازتـرە، لەمیانـەی ئەو دانپێدانانەشەوە ڕێگا لەخۆی دەگرێت بگاتە ئەو بڕوایەی دەتوانێت باوك تیرۆر بکات و لەناوی ببات. بەڵام ڕێگا نەدان و، تیرۆرکردنی باوك، وەکو پێوەندی نێـوان نووسـین و ئاخـافتن وایـە، دوو بونیـادی لـەناکاون و، دواتـر ئێمـە هەوڵـدەدەین دەقەکەی ئەفلاتون وا شرۆڤە بکەین کە دەکەوێتە نێوان دوو قۆناغ، قەدەغەکردنی تیرۆرکردنی باوك و، تیرۆرکردنێکی ڕێگە پێدراو. ئەوە دواخستنی تیرۆرکردنی باوك و ڕێنیشاندەرە.

هـەر بەتـەنیا دیـالۆگی فیـدرۆس خـۆی بەسـە، بـۆ سـەلماندنی ئـەوەی بەرپرسـیارێتی لۆگـۆس و، بەرپرسـیارێتی مانـاو جێکەوتەکـەی، بـۆ مەسـەلەی

یارمەتی و، پاڵپشتی و، ئامادەگی باوک دەگەڕێتەوە، وەکو باوکێکی ئامادە دەگەڕێتەوە. لێرەدا پێویستە ئێمە بتوانین بەبێ وەستان و ماندوو بوون، ئەم هەموو خوازەیە بەئاخافتن بێنین و بیانخەینە قسە. بۆیە دەبینین سوقرات ئاو قسە لەگەڵ ئیرۆس دەکات:" ئەگەر ئێمە دوێنێ بەقسەی ناخۆش پێشوازیمان لێکردبووای، ئینجا من بووام، یا فیدرۆس، ئەوە لیسیاس ـ Lysias باوکی لۆگۆس ـ ton tou logou patera دەبێت ئیدانەو بەرپرسیار بکرێت". لێرەدا لۆگۆس بەمانای گوتار، یا بەڵگەی خراوە ڕوو نمایش دەکرێت، ئەو قسەیەی دیالۆگی شەفەیی ـ le logos دەوروژێنێت و ڕێکی دەخات. ئەگەر ئێمە وەریبگێڕین وەکو ئەوەی ڕۆبین ـ Robin کردبووی، بۆ خودی کارا ـ سوژە sujet ـ ئەوە ئەم زاراوەیە، بەتەنیا لەگەڵ زمانی سەردەمدا جیاواز نییە، مەبەست سەردەمی ئەفلاتونە، بەڵکو دەبێتە هۆی ئەوەی مەبەستی دەلالی و یەکێتی ئۆرگانی زاراوەکەش لەبەین ببات. تەنیا گوتاری "زیندوو"، تەنیا ئاخافتن (نەوەکو ماددە، یا بابەت، یا خودی کارای گوتارەکە) دەتوانێت خاوەنی باوک بێت.

بەپێی ئەو پێداویستییەی کە لەمەودوا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، ئەوە گوتارەکان ـ logoi بەگشتی کوڕن و باوکیان هەیە. بایی ئەوەندە زیندوون بتوانن نارەزایی دەربڕن و، نارەزایی پیشانبدەن، ئەو کاتەی بۆنەیەکیان بۆ دێتە پێشەوە، یا ئەوکاتەی ڕێگەیان پێدەدرێت قسە بکەن و بەقسە دەخرێن. بەپێچەوانەی گوتاری نووسراویش، ئەوان توانای ئەوەیان هەیە لەحاڵەتی ئامادەگی باوکیانەوە، ڕاستەوخۆ وەڵامیش بدەنەوە. ئەوە بریتییە لەئامادەگی بەرپرسیارانەی باوک.

هەندێکیان، بۆ نموونە نەوەی فیدرۆسن، ئەویش ناچارە پشتگیریان لێبکات. با جارێکی تریش قسەیەکی تری ڕۆبین وەکو بەڵگە بێنینەوە کاتێك ئەمجارەیان ۆگۆس ـ logos وەرناگێڕێت بۆ خودی کارا ـ سوژە، sujet ـ بەڵکو وەری ەگێڕێت بۆ بەڵگە ـ ئەرگومێنت، atgument ـ واتا لەمەودای نێوان تەنیا یست دێڕدا، گەمە لەسەر هونەری گوتار ـ tekhne ton logon دەکات. " مەسەلەکە پەیوەستە بەم "بەرهەم"ەی سۆفیست و گوتاریستەکان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد گوایە بەدەستیان هێناوە، لەکاتێکدا ئەوە فێڵێکی هونەرییە، ئامرازو وەسفەیەك و "پەیام" ێکی ناوەکییە دەشێت بگوازرێتەوەو .. تاد". لێرەدا سوقرات تەماشای کێشەکە دەکات، ئەو کێشەیەی کە ئەو کات، کێشەیەکی کلاسیکی بوو، تەماشای دەکات و لێی ڕادەمێنێت لەڕوانگەی دوالیستی نێوان بڕواپێهێنان و حەقیقەتی بەرجەستەبوودا ـ aletheia".[1]

*"سوقرات: ڕازیم، بەلایەنی کەم لەو حاڵەتەدا کە بەڵگە ـ logoi پێشکەشکراوەکانی سەر سەکۆ، کەواهی لەسەر ئەوە دەدەن گوایە شتێکی دروستکراوە، یا پیشەیەکە ـ tekhne! چونکە وا هەست دەکەم، بەڵگەی تر هەن کە دوای ئەمە، دێنە پێشەوەو خۆیان نمایش دەکەن، ئەم بەڵگانەش ناڕەزایی دەردەبڕن و، دەڵێن گوایە ئەم درۆ دەکات و شتێکی دروستکراو نییە، بەڵکو شتێکی دووبارە بۆوەو ڕۆتینییە و، هیچ بنەمایەکی داهێنراوو پیشەیی تێدا نییە.*

---

[1] aletheia لەنێو زمانی یۆنانیدا گوزارشتە لەحەقیقەت، حەقیقەت نەك وەکو ئەوەی کە پێدراوێکە، بەڵکو حەقیقەت وەکو ئەوەی بەرهەمی دۆزینەوەو بەرجەستەبوونە.

*لاکۆنی*[1] *دێت و دەبێژێت گوایە ئەم لەنێو ئاخافتندا نییە ـ tou de legein، و ناکرێت لەئاییندەشدا هیچ پیشەیەکی ئەسڵی تێیدا سەرهەڵبدات ئەگەر خواستی حەقیقەتی تێدا نەبێت.*

*فیدرۆس: بەڵام ئەی سوقرات ئێمە ئەم بەڵگانەمان پێویستە ـ Touton dei ton Logon O Sokrates! دەی! بیانهێنە ئێرەو، بەقسەیان بێنە: بزانە چی دەڵێن و، بەچ زاراوەیەك دەدوێن و قسەدەکەن ـ ti kai pos legousin؟*

*سوقرات: ئەی بوونەوەرە جوانەکان ـ gennaia دەرکەون و بڕوا بەفیدرۆس، باوکی منداڵە جوانەکان ـ Kallipaida te Phaidron بێنن، ئەگەر ئەو بەباشی فەلسەفەکاری نەکات، ئەوە شایانی قسەکردن نییە لەسەر هیچ شتێك! با ئێستا فیدرۆس وەڵامم بداتەوە ...".*

هەر فیدرۆسیشە ئەمجارەیان پێویستە یەکەم کەس قسە بکات و بدوێت لەنێو دیالۆگی "خوان" دا، چونکە ئەم هەر خۆی لەپلەی یەکەمدایەو، لەهەمان کاتدا، هەر ئەمیش باوکی وتارە ـ pater tou logou.

ئەوەی کە ئێمە هێشتا بەردەوام بۆ ساناکردنەوە ناوی دەنێین خوازە، ئەوە لەهەموو بارێکدا دەگەڕێتەوە بۆ سیستەم ـ systeme. مادام لۆگۆس باوکی هەیەو خاوەنی باوەکە، خۆیشی نابێتە لۆگۆس ئەگەر باوکی یارمەتی نەدات، بۆیە بەردەوام هەیە ـ on، تەنانەت جۆرێکە لەبوونەوەریش.[2] ئەگەر وردتر قسە

---

[1] ) لاکۆنی، بۆ فەلسەفەکارو هزرڤانێکی ناوچەی لاکۆنیای یۆنان بەکاردێت، ئێمەش هیچ پێناسەیەکمان لەبارەی ئەم هزرڤانە نەدۆزییەوە کە هاوسەردەمی ئەفلاتون بووە.

[2] ) بڕوانە دیالۆگی سۆفیستەکانی ئەفلاتون.

ـكەین، ئەوە دەڵێین لۆگۆس بوونەوەرێكی زیندووە ـــ zoon. لۆگۆس كیان یا ـێژەڵێكە.[1] ئەم ئاژەڵە لەدایك دەبێت، گەشە دەكات، بەردەوام بەرەو سروشت ـــ physis دەگەڕێتەوە. هەریەك لەزمانەوەری و لۆژیك و دیالۆگ و ئاژەڵناسیش ـــ zoologie بەشێوەیەكی توندو تۆڵ و پتەو، پەیوەستن بەیەكترییەوە.

كاتێك ئەفلاتون لۆگۆس بەئاژەڵ وەسف دەكات، ئەوە بەدوای ڕێچكەی هەندێك ـەوتاربێژو سۆفستیەكاندا دەڕوات كە پێش ئەو، لەبەرانبەر چەقگیری و چەسپاوی ـووسیندا، هاتن وشەی زیندووی ڕێكخراویان بەشێوەیەك دانا، لەگەڵ ڕەوشی ـیالۆگكاراندا بگونجێت، ئەوانەی لەچركەساتی ئێستادا ئامادەگیان هەیەو لەگەڵ پرسیارو داواكارییەكانیاندا ئامادەن، بۆیە دێت پێشبینی ئەو بابەتانەش دەكات كە دەشێت تێیاندا بخرێنە ڕوو، بەوەش جۆرێك لەملكەچی نمایش دەكات لەو چركەیەدا كە خۆی وا پیشاندەدات گوایە هەوڵی خۆڕازیكردن دەدات.

كەواتە لۆگۆس، ئەو بوونەوەرە زیندوو و فرێشە، بریتییە لەسیستەمێك كە ئافرێدەكراوە. سیستەم ـــ organisme واتا جەستەیەكی تایبەت، جیاواز، خاوەنی لەش و پەل بێت، قاچ و دەست و سەری هەبێت. تاوەكو گوتاری نووسراو قبوولكراویش بێت، پێویستە لەسەری وەكو گوتاری زیندوو، ئەویش بچێتە ژێرباری یاساكانی ژیان. پێویستە لەسەر پێداویستی نووسین و نووسراو ـــ ananke logographike وا خۆی نمایش بكات و دەربخات، وەكو ئەوەی بوونی

---

١) لێرەدا زاراوەو دەستەواژەی ئاژەڵ بەمانای ئەسڵی زاراوەكە بەكارهاتووەو دەلالەت ناكات لەئافرێدەكراوێكی ئاژەڵی بەتەنیا، بەڵكو دەلالەت لەهەموو كیانێكی خاوەن ڕوح و گیان و ژیان دەكات.

ئەم، پێداویستییەکی بایۆلۆجی یا ئاژەڵییە ـ zoologique. ئەگینا، ئەدی خۆ بێ کلك و بێ سەر نابێت؟ لەڕاستیدا مەسەلەکە پێوەندی بەبونیادو دامەزراندن هەیە، ئەوەش لەچوارچێوەی ئەم سەرکێشییەی لۆگۆس دووچاری دێتەوە، بەوەی نەوەکو لەمیانەی نووسیندا سەرو کلکی بەیەکەوە لەدەست بدات:

*" سوقرات: ئەی چی دەڵێین لەبارەی ئەوەی وەکو پاشماوە دەمێنێتەوە؟ وا نایەتە بەرچاو وەکو ئەوەی بەر توخمەکانی بابەتەکە ـ ta tou logou کەوتبێت و خرابێتە ئەستۆیەوە؟ یا پێداویستییەکی سادە هەیە ناچار دەکات ئەوەی بەپلەی دووەم دێت لەنێو گوتاردا، بچێتە شوێنگەی دووەم لەبری ئەم، یا ئەو شتانەی گوزارشتیان لێ دەکات؟ من لەلایەنی خۆمەوە، باپێتان بڵێم، هەر بەڕەهایی هیچ شتێکی لەبارەیەوە نازانم، بۆیە پێم وابوو نووسەر بەئازایەتییەکی زۆرەوە ئەو قسەیە دەکات! ئەرێ باشە تۆ دەزانی کە ئایا پێداویستی نووسین وای لێ دەکات ئەو توخمانە ئاوا بەم شێوەیە لەرێزی یەکتری دابنێت و ڕیزیان بکات لەتەنیشت یەکتری؟*

*فیدرۆس: ئەوە لەپاکی خۆتە وا تەماشای من دەکەی گوایە دەتوانم بەم شێوە دەستنیشانکراوە مەبەستەکانی بزانم!*

*سوقرات: ئەوە شتێکە بەلایەنی کەم پێم وایە تۆ جەختی لەسەر دەکەیتەوە: هەموو گوتارێك ـ logon دەبێت دامەزراوبێت ـ sunestanai لەسەر شێوەی بوونەوەری زیندوو ـ osper zoon: خاوەنی جەستەیەك بێت، کە جەستەی خۆیەتی بەشێوەیەك بێ سەرو بێ قاچ نەبێت، هەروەها بێ قەدو جەستەو پەلیش*

*ـەبێت، بەجۆرێك ئەم پارچانە لەنێوان خۆیان لەگەڵ یەكتردا بگونجێن، لەهەمان كتیشدا لەگەڵ ئەوانیتریشدا بگونجێن".*

ئەم جەستە ئافرێدەكراوە دەبێت "بەباشی لەدایكبوو‌بێت"، واتا لەجیناتێكی ـاش بێت ــ gennaia. ئێمە ئەوەمان لەبیرە كە سوقرات بەو شێوەیە "گوتارەكان" ناو دەبات و پێیان دەڵێت"بوونەوەرە نەبیلەكان". ئەوەش مانای وایە ئەم سیستەمە مادام ئافرێدەكراوە، ئەوە ئاساییە دەبێت سەرەتاو كۆتایی هەبێت. لێرەدا سوقرات بەشێوەیەكی ناچاری و دەستنیشانكراوییەوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە هەموو گوتارێك دەبێت سەرەتاو كۆتایی هەبێت، بەسەرەتا دەسپێبكات و بەكۆتایی تەواو بێت:" پێدەچێت نەستەم بێت بگاتە مەبەستی خۆی، ئەوەی كە بابەتەكەی بەسەرەتا دەست پێنەكات و لەدواوە بۆی بێت و، هەوڵبدات پشتە مەلە بكات! ئەوەی بەم قسانە دەسپێدەكات كە پیاو بەردەوام لەكۆتاییدا بەخۆشەویستەكەی خۆی دەڵێت". دانان و پێڕەوكردنی ئەم جۆرە بنەمایانەو، ئەنجامەكانیان زۆر قورس دەوەستێت، بەڵام زۆر ڕوون و ئاشكران، بەجۆرێك پێویست ناكات جەخت بكەینەوە سەریان. ئەنجامەكەش ئەوەیە گوتاری بەقسەخراو، وا ڕەفتار دەكات وەكو كەسێك كە لەئەسڵدا پاڵپشتیكرابێت و، لەئێستاشدا ئامادەگی هەبێت ــ Logos: Sermo tanquam persona ips loquens وەكو ئەوەی لەیەكێك لەفەرهەنگەكانی[1] ئەفلاتوندا دەیخوێنینەوە. وەكو هەر كەسێكی تریش، لۆگۆس ـ ئاژەڵ باوكی خۆی هەیە.

---

[1]) فردریك ئاست: زاراوەی ئەفلاتونی ـ Fr. Ast, Lexique Plotoniciem. هەروەها بڕوانە: ب. پاراین وتارێك لەبارەی لۆگۆسی ئەفلاتونی ــ B. Parain, Essai sur le

## بەڵام باوك چییە؟

ئایا دەبێت گریمانی ئەوە بکەین کە ئەو ناسراوە، لەولایەنەوە کە ناسراوە. بچینە لای لایەنەکەی تر، تاوەکو بێت وەکو خوازەیەك بۆمان ڕوونی بکاتەوە؟ ئەو کاتە دەڵێین ئەسڵی لۆگۆس، یا پاڵنەرەکەی، هاوشێوەی ئەو شتەیە کە دەزانی هۆکارەکەی شتێکی زیندووە، واتا باوکی خۆی. ئێمەش ئەو کاتە وا خەیاڵی لەدایکبوونی لۆگۆس و ڕێڕەوی دەسپێکردنی ژیانی دەکەین، وەکو بوارێك کە نامۆیە پێی، ئەویش گواستنەوەی ژیانە، یا ئەو پێوەندییانەی دەبنە هۆی منداڵ بوون و نەوە خستنەوە.

بەڵام لێرەدا باوك ئەو کەسە نییە کە منداڵەکەی دروستکردووە، ئەو باوکی ڕاستەقینە نییە پێش هەموو پێوەندییەکی زمانەوانی و دەرەوە زمان. لەکاتێکدا پێوەندی نێوان باوك ـ کوڕ، هۆکار ـ ئەنجام، بەرهەمهێن ـ بەرهەم، پێوەندییەکی تایبەتە، ئەوە ئەگەر لەئاستی لۆگۆسیش نەبێت؟ بۆیە تەنیا توانای گوتاری باوکی هەیە. باوك بەردەوام باوکی بوونەوەرێکی زیندووی قسەکەرە. یا بەگوزارشتێکی تر، لەمیانەی لۆگۆسەوە، شتێکی وەکو باوکایەتی خۆی ڕادەگەیەنێت و ڕێگا دەدات بیری لێبکرێتەوە. مادام خوازەیەکی پەتی لێرە لەنێو ئەو گوزارشتەدا هەیە ـ باوکی لۆگۆس، ئەوە زاراوەی یەکەم (باوك) پێدەچێت سۆزدارتر بێت و، لەگەڵ مانای زاراوەی دووەمدا بەیەك دەگەن (لۆگۆس) و وەردەگرێت زیاتر لەوەی ببەخشێت. لەنێو سۆزداری یەکەمدا، بەردەوام پێوەندییەك هەیە پێوەندی

---

logos Platonicien. هەروەها بڕوانە: پی. لویس خوازەکانی ئەفلاتون ـــ P. Louis, Les Metaphores de Platon.

جێنشینییە لەگەڵ لۆگۆس.

هەردوو بوونەوەرە زیندووەکەی تر، (باوك و کوڕ) لەلای ئێمە وا خۆیان ەرجەستە دەکەن، وەکو ئەوەی یەکێکیان ئاراستەی ئەویترمان بکات ەچوارچێوەی خزمایەتی و نزیکی لەگەڵ لۆگۆسدا، کە ئێمەش لێی دەرناچین ەرەڕای ڕوخسارو دیاردەکان، بۆ ئەوەی وەکو مەجازێك بگوزاینەوەو بچینە نێو ـوارێکی نامۆ کە تێیدا ڕوو بەڕووی باوك و، کوڕو، خزم و، هەموو جۆرە ونەوەرەکانی تر ببینەوەو، دواتر بێین وەکو هاوشێوەییەك ئەمە شرۆڤە بکەین ۆ ئەو کەسانەی نازانن ئاخۆ ئەو لۆگۆسە، ئەو شتە نامۆو سەیرە چییە؟!

ئەگەرچی ئەم شوێنگەیە، شوێنگەی هەموو خوازەو پێگەیەکە وەکو شوێنگەو ماڵ ـ foyer، بەڵام بەخوازەیەکی سادە دەڵێین هەرگیز باوکی لۆگۆس نییە. ئەوە خوازەیە ئێستا ئەگەر ئێمە بڵێین بوونەوەرێکی هەژار لەئاستی زماندا — ئەگەر لاساری بکەین و بڕوامان وا بێت بوونەوەرێکی لەم شێوەیە هەیە ـ خاوەنی باوکەو باوکێکی هەیە. کەواتە دەبێت بەوە دەسپێبکەین بێین هەموو ڕووگە مەجازییەکان سەراوژێر بکەین، هەرگیز پرسیاری ئەوە نەکەین ئایا لۆگۆس دەتوانێت خاوەنی باوك بێت، بەڵکو دەبێت ئیدراکی ئەوە بکەین کە ئەم بانگەشەیەی باوك دەیکات، گوایە ئەم باوکە، ناکرێت ڕاستەڕێ بێت، بەبێ توانای بنەڕەتی خۆی، بەبێ توانای هەبوونی لۆگۆس ئەمیش بوونی نابێت.

باشە ئەم لۆگۆسە مانای چییە کە لەهەبوونیدا قەرزای باوکییەتی؟ بۆئەوەی بوونی هەبێت، پێویستە باوکی هەبێت؟ بەلایەنی کەم ئێمە لەمیانەی دەقی ئەفلاتونیدا کە لێرەدا جێگای بایەخی ئێمەیە، چۆن ئەم ڕوانینە دەخوێنینەوە؟

ئێمە دەزانین وێنەی باوك، وێنەی خێرە ـ agathon. لۆگۆس نمایندەی ئەو شتە دەکات کە قەرزاریەتی لەهەبوونی خۆیدا، واتا باوك، کە لەهەمان کاتدا سەرۆك chef و سەرمایە capital و خێرو پاشایە bien. بگرە ئەم باوکە سەرۆك و، سەرمایەو، خێرە لەیەك کاتدا، بۆیە دەبینین وشەی باوك ــ pater لەزمانی یۆنانیدا، لەیەك کات بەهەموو ئەم مانایانە بەکاردێت.

نە وەرگێڕەکانی دەقی ئەفلاتونی و، نە شرۆڤەکارانی، پێدەچێت ئاگاداری گەمەی ئەم وێنە زەینییانە نەبووبن. با ئێمە دان بەوەدابنێین کە زۆر ئەستەمە بتوانین دڵسۆز بین بۆ ئەم گەمەیە لەکاتی وەرگێڕاندا، بۆیە دەتوانین ئەو مەسەلەیە وا شرۆڤە بکەین کە لەڕاستیدا هیچ کەسێك دەقەکانی ئاوا بەم شێوەیە بەقسە نەهێناوە. بۆیە هەر لەو چرکەساتەوەی تێیدا سوقرات لەنێو کتێبی کۆماردا قسەی خۆی دەگۆڕێت لەبارەی خودی خێر، ئەوە لەهەمان کاتیشدا ڕاستەوخۆ پێشنیاری ئەوە دەکات کە بیگۆڕێت بە ـ ekgonos واتا کوڕەکەی، یا نەوەکەی، بۆیە دەبینین دەڵێت:

***" بالێرەدا بۆ چرکەیەك دەسبەرداری گەڕان بەدوای خودی خێر ببین، چونکە پێم وایە ئەوەندە بەرزو باڵایە، بەجۆرێك ئەو بازدانەی کە ئێمە هەمانە، ناتوانیت تا ئاستی ئەو وێناکردنەش بەرزمان بکاتەوە کە من خۆم لەبارەیەوە دروستم کردووە. بەڵام، ئەگەر تۆ هەر جەخت لەسەر ئەوە دەکەیتەوە، ئەوە من لەبەرخاتری تۆ، پێت دەڵێم کە پێم وایە کوڕو نەوەی ــ ekgonos خێرەو، وێنە هەرە هاوشێوەکەیەتی، ئەگینا با واز لەو مەسەلەیە بێنین و بیخەینە لاوە.***

***ئەویش گوتی: باشە، قسە بکە. جاری داماتوو ئەم قەرزەت دەدەیتەوەو قسەمان بۆ دەکەیت لەبارەی ئەوەی بزانین باوك چییە؟***

***منیش وەڵامم دایەوە: خۆزگە دەمانتوانی، من قەرزەکەی خۆم بدەمەوەو، تۆش ئەم شرۆڤەیە وەربگریت کە من قەزارم پێتی بدەم ـ لەبری ئەوەی دەستنیشان بکرێین تەنیا لەبارەی سوودەکانەوە ـ tokous قسە بکەین، وەکو ئەوەی ئێستا ئێمە دەیکەین. ها ئەم میوەیە بگرەوە، ئەوە هەر خۆی ئەوەی خودی خێرە ـ tokon te kai ekgonon autou you agathou".***

زاراوەی ـ Tokos ـ لێرەدا بەمانای کۆ ـ ekgonos بۆ بەرهەم و بەرهەمهێنان بەکاردێت، لەدایکبوو و لەدایکبوون، ..... تاد. ئەم زاراوەیە، لەنێو بواری کشتوکاڵ و پێوەندی خزمایەتی و کردەی کڕین و فرۆشتن بەکاردێت. وەکو ئەوەی دەبینین، هیچ یەکێك لەم بوارانە، دوور نین لەوەبەرهێنانی لۆگۆس و توانای هەبوونی.

Tokos وەکو ئەوەی بەرهەمێکە، لەدایکبووە، ئەنجامی هەوڵ و کۆششی دووگیانبوونی مرۆڤە، یا ئاژەڵە، وەکو چۆن ئەنجامی بەروبوومی ئەو تۆیەیە کە دەخرێتە سەر زەوی کێڵکەگان و دەڕوێت، سوودی سەرمایەش لەوەدایە دەگەڕێتەوە گیرفان. ئێمە دەتوانین لەنێو دەقی ئەفلاتونیدا بەدوای دابەشکردنی هەموو ئەم دەلالەتانەدا بڕۆین و بیاندۆزینەوە، بگرە مانای باوك ـ pater هەندێکجار ئاڕاستەی لایەنی مانای تایبەتی سەرمایەی نەختینەش دەکرێت. بەتایبەتی لەنێو " کتێبی کۆمار" داو، نزیك لەو بڕگەیەی ئێمە پێش کەمێك ئەو

ڕستەیەمان لێی خواستبوو.

یەکێك لەعەیبەکانی دیموکراتییەت لەڕوانگەی ئەفلاتون، بریتییە لەو ڕۆڵەی هەندێك کەس بەپارەو دراوی دەبەخشن:

*" لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو کەسانە کە بەسەرشۆڕی بەڕێگادا دەڕۆن، پێناچێت چاویان هەرگیز ئەم خەڵکە هەژارو چەوساوانە ببینێت، بکرە بەپارەکانیان هەموو ئەو هاوڵاتیانە بریندار دەکەن کە خۆیان بۆ لێدانەکانی ئەوان ئامادە کردووە، بەوەی سەدان جار باجەکانی خۆیان زیاتر دەکەن ـ tou patros akgonous tokous pollaplasious ئەو کەسانە دەبنە هۆی ئەوەی ژمارەی تەمبەڵ و بێکار لەنێو وڵاتدا زیاتر بێت".*

بەڵام ئێمە ناتوانین ئاوا بەسادەیی، یا ڕاستەوخۆ، باسی ئەم باوکە بکەین، ئەم سەرمایەیە، لەبارەی ئەسڵی ئەم بەهاو بوونەوەرە بەرجەستەبووە. یەکەم، لەبەرئەوەی وەکو خۆر وایە، ناتوانین ڕاستەوخۆ بەرانبەری بووەستین و تەماشای بکەین. فەرموون لەوبارەیەوە ئەم جۆرە سەرسووڕمانە بخوێننەوە لەبارەی وەستان بەڕووی خۆردا، ئەو برگە ناودارەی "کتێبی کۆمار" کە دەڵێت:" بۆیە، سوقرات تەنیا ئاماژە بۆ خۆری هەستپێکراو دەکات ـ وەکو ئەستێرە ـ کە ئەویش کوڕی خۆری عەقڵییە، هاوشێوەو پەڕەلێلی ئەویشە ـ analogon. ئێستاش، ئاوا دەستم بەقسەکردەوە، با ئێوە بزانن ئەم خۆرەی من مەبەستمە کاتێك ئاماژەم بۆ نەوەی خێر ـ ton tou agathou ekgonon کرد، ئەم کوڕەیە ـ نەوە ـ کە من لەسەر شێوەی ئەو دامهێناوە ـ on tagathon egenne sen analogon لەنێو جیهانی بینراوداو، بەپێوانە لەگەڵ بینین و شتە بینراوەکاندا، وەکو

ـمایندەی خێر لەجیهانی زەینی، بەپێوانە بەرانبەر بەعەقڵ و گوتەزای شتەکان".

ئەریّ باشە چۆن لۆگۆس دەکەوێتە نێو ئەم هاوشێوەییەی باوك و کوڕ؟ نێوان ماقووڵ و ـ noumene ـ بینراودا ـ oromene؟

خێر لەنێو وێنەی بینراو ـ نەبینراوی باوکدا، هی خۆر، هی سەرمایە، ئەسڵی بوونەوەرەکانە ـ onta ـ و ئەسڵی سەرهەڵدان و هاتنیەتی بەرەو ئەو لۆگۆسەی کە لەهەمان کاتدا کۆی دەکاتەوەو فۆڕمی تایبەتیشی پێدەبەخشێت:" کۆمەڵێك شتی زۆر جوان هەن، کۆمەڵێك شتی زۆر باش، کۆمەڵێك شتی زۆری تر لەهەموو جۆرێکدا، ئێمە جەخت دەکەینەوە سەر هەبوونیان و لەنێو زماندا جیایان دەکەینەوە ـ einai phamen te kai diozizomen to logo".

بەم شێوەیە، خێر دەبێتە (باوك، خۆر، سەرمایە)، سەرچاوەی شاراوەی ــ ڕۆشنکەرەوەو گشتگیر بۆ لۆگۆس. مادام کەس ناتوانێت قسە بکات لەبارەی ئەوەی دەشێت قسەی لەسەر بکرێت ـ ڕێگا نادات قسەی لەبارەیەوە بکەین، ڕێگا نادات ڕاستەوخۆش ڕوو بەڕوو قسەی لەگەڵدا بکەین ــ ئەوە ئێمە تەنیا قسە لەبارەی ئەو شتە دەکەین کە دەدوێت، قسە لەبارەی ئەو شتانەی بەردەوام قسەیان لەسەر دەکرێت، تەنیا یەك شت نەبێت. مادام کەسێك ناتوانێت حیسابێکمان پێبدات کە نمایندەی لۆگۆس بێت ــ حیساب compte یا عەقڵ raison کە هەردووکیان لەیەك موفرەدەدا کۆ دەبنەوەو بریتییە لە ratio ــ دەڵێین ئەوەی نمایندەی لۆگۆس دەکات، ئەو شتەیە کە لەبوونی خۆیدا قەرزاری ئەمە، مادام ئێمەش ناتوانین ئەم سەرمایەیە حیساب بکەین، یا ڕاستەوخۆ ڕوو بەڕوو بەرانبەر بەسەرۆك بووەستینەوە، ئەوە دەبێت حیسابی کۆی گشتی سوودو

داهات و بەرهەم و لەدایکبووەکان بکەین، ئەوەش لەمیانەی هانا بردنەبەر کردەی جیاکاری و تایبەتمەندێتی پێدان و خاڵبەندییەوە.

بۆیە دەبینین هەر لەنێو "کتێبی کۆمار" دا، جارێکی تر ئەفلاتون دەنووسێت:

***" گوتی: باشە، با قسەبکەین ــ lege. جاری داهاتوو قەرزەکەی خۆت دەدەیتەوە بەوەی دەبێت بۆمانی راڤە بکەیت کە باوك چییە؟***

***منیش وەڵامم دایەوە: خۆزگە دەمانتوانی، خۆزگە دەمتوانی قەرزەکەم بدەمەوە، تۆش دەتتوانی ئەم راڤەکردنە وەربگریت کە من قەرزاری تۆم و دەبێت پێتی بدەم، لەبری ئەوەی وەکو ئێستا ئاوا، ناچارین بەدەستنیشانکراوی لەبارەی سوودەوە قسە بکەین. ها ئەم میوەیە بگرەوە، ئەوە لەدایکبووی خودی خێرە، بەڵام وریابە با فێڵت لێ نەکەم بەبێ ئەوەی مەبەستم بێت، بەوەی حیسابێکی سوودەکانت پێبدەم ـ ton logon ـ ناڕۆشن و نا شەفاف بێت ـ tou tokou".***

لەنێو ئەم برگەیەشدا، دەست بەحەقیقەتی ئەوەوە دەگرین کە لەپاڵ حیسابی ـ logos زیادەوە ( کە خراوەتە سەر باوك ـ سەرمایە ـ خێر ـ ئەسڵ، .... تاد)، لەپاڵ هەموو ئەم زیادەیەی دەکەوێتە سەر هەر یەکێکیان، لەنێو هەمان بزاڤدا کە تێیدا ون دەبێت و، چیتر بەچاو نابینرێت، بەم شێوەیە داوای گۆڕینی خۆی دەکات. لەپاڵ جیاوازی و جیاکاریدا، سوقرات دێت توانای کراوەنەوەی بەردەوام بەدی دەکات بۆ kibdelon، واتا ئەوەی کە ناڕۆشن و نا شەفافە، گەندەڵکارە، درۆزنە، فریودەرە، ئاڵۆزە. بۆیە دەبینین ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە وریابە فێڵت لێ نەکەم لەمیانەی پێشکەشکردنی حیسابێك بۆ سوودەکان ناڕۆشن و نا شەفاف

ـيـت ـ kibdelon apodidous ton logon tou tokou. Kibdeleuma
ـرِتییە لەکاڵای نا ڕۆشن و نا شـەفاف، بەرانبـەر بـەفرمانی kibdeleuo دێـت کـە
ـەمانای پارەی تەزویر ـ پارەی قەڵپ ـ دێت، بەمانای سـاختەکردنە لـەکاڵاو، بـەو
ـنایەی مرۆڤێك ڕەفتاری خراپ بێت.

ئـەم گەڕانەوەیـە بـۆ لۆگـۆس لـەنێو چوارچـێوەی تـرس لـەونبوون و نـەبینینی
ـستەوخۆی ڕوخسـاری بـاوك، خێـر، سـەرمایە، ئەسـڵی بـوون لـەخودی خۆیـدا،
ـموونەی باڵای نموونەکان، ... تـاد. دەڵـێین ئـەم جـۆرە گەڕانەوەیـە بـۆ لۆگـۆس،
وەکـو ئـەوە وایـە بمانخاتـە شـوێنێك بـۆ خۆپاراسـتن لـەخۆر، خۆپاراسـتن لێـی و
ـەسایەی ئەویشەوە، ئـەوەش سـوقرات لەشـوێنێکی تـر پێشـنیاری دەکـات لـەنێو
سیستەمی هاوشێوەی هەستناك و بینراودا، ئێمەش ئەم دەقە درێـژە وەکـو خـۆی
وەردەگرین، چـونکە بایـەخی تایبـەتی خـۆی هەیـە. ئـەم دەقـە لـەنێو وەرگێڕانـی
ڕۆبیندا، ئەگەر بکرێت بڵێین کۆمەڵێك خزینی زۆر دەلالەتـدار لـەخۆ دەگرێـت. ئـەم
دەقە لەنێو دیالۆگی فیدۆن دایە لەکاتی ڕەخنەگرتن لەفزیاییەکان:

*" سوقرات گوتـی: باشە! ئەوەی خستمەڕوو بیروبۆچوونی مـن بـوو. دوای ئەوە، لەوکاتـەوە دەمبینـی بێتاقـەتم لەتوێژینـەوە لـەبوون ـ ta onta. دەبووایە من وریا بم لـەو ڕووداوەی ئـەو کەسـانە دووچـاری دێـن و دەبنـە قوربانی کاتێك تەماشای خۆرگیران دەکەن، چونکە دەشێت هەندێك لەوانە بەڕاستی چاویان لەدەست بدەن و کـوێربن، ئەگـەر تەماشـای وێنـەی ئـەو ئەستێرەیە ـ eikona نەکەن لەنێو ئاو یا شتێکی هاوشێوەدا. بەڵێ، مـن لەلای خۆمەوە بیرم لەشتێکی لەم شێوەیە دەکردەوە. دەترسام بەتەواوی*

***دووچاری نابینایی ڕوح بێم بەوەی کە بەم شێوەیە چاوم بخەمە سەر شتەکان و، هەوڵبدەم بەهەر یەکێك لەهەستەکانم بەتەواوی ڕۆبچمە ناویانەوەو بەریان بکەوم. لەوکاتەوە، من پێم وایە هیچ ڕێگایەك نییە بۆ خۆ شاردنەوە لەهزرو بۆچوونەکان و ــ en logois هەوڵدەدەم حەقیقەتی شتەکانی تێدا ببینم. بەم شێوەیەش، پاش ئەوەی هەر حاڵەتێکم وەکو بنەما وەرگرت، ئەوە هزرــlogon بەدیتنی من لەهەموویان پتەوترە، ... تاد".***

بۆیە، لۆگۆس سەرچاوەی وزەیەو، دەبێت بۆ لای ئەم بگەڕێینەوە، نا بەتەنیا ئەو کاتانەی سەرچاوەی تیشکی خۆر ئامادەیەو، هەرەشە لەسووتاندنی چاوەکانمان دەکات ئەگەر ئێمە تەماشای بکەین، بەڵکو دەبێت ڕووەو لۆگۆس وەرگەڕێین، کاتێك کە خۆر لەنا ئامادەگی و گیرانیشدایە. لەکاتی مردن و کوژانەوەی، لەکاتی مانگرتن و خۆشاردنەوە، ئەو ئەستێرەیە هەمیشە لەوە مەترسیدارترە کە پێیەوە دیارە.

با لێگەڕێین ئەم هێلّ و، ئەم منداڵانە پەرت و بڵاوببنەوەو ونبن. ئێمە تا ئێستا بەدوای ئەواندا نەچووین، تەنیا بۆ ئەوە نەبێت ڕێگا بەخۆمان بدەین لەلایەن لۆگۆسی باوکەوە ئاڕاستەو ڕابەرایەتی بکرێین، تاوەکو قسەکانمان بە ــ kurios واتا مامۆستا، ڕابەرو، سەروەر، ببەستینەوە، ئەم ناوەی کە لەنێو کتێبی کۆماردا بەخشراوەتە (خێر، خۆر، سەرمایە، باوك). دواتر لەنێو هەمان سیاق و دەقدا، هێلی تر ڕادەکێشین، سەرلەنوێ هەمان هێل، تاوەکو مەبەستی تر بەدی بکەین کاتێك ئاوێتە دەبن، یا لەیەکتری جیا دەبنەوەو دادەبڕێن.

" مێژووی گەردوون بەڕێگاو کاروانی خۆیدا تێپەڕی، ئەم خواوەندە زێدە مرۆڤانەش کە ئیکزۆنۆڤانیس هێرشی کردە سەریان، گەڕێندرانەوە بۆ ڕێزی داهێنراوو دروستکراوی شیعری و ئەهریمەنانە، بەڵام گوایە یەکێك لەوانە، هێرمسی مەزن بوو،[1] کە کۆمەڵێك کتێبی فرەو جیاوازی بۆمان جێهێشتووە. بەقسەی کلیمۆنی ئەسکەندەری بێت، ژمارەی کتێبەکانی دەگاتە (٤٢) کتێب. بەقسەی جاملیکیش بێت، ئەوا ژمارەیان دەگاتە (٢٠٠٠٠) کتێب. بەپێی بۆچوونی کاهینەکانی تەحوتیش[2]

[1]) لەسێ لاوە مەزن ـ Trismegiste، نازناوێك بوو لەلای یۆنانییەکان لەهێرمس نرابوو. هێرمس خۆی وەکو خواوەندێك کۆمەڵێك ئەرك و فرمانی زۆری هەبوو: خواوەندی خۆشەویستی و ئۆلیمپ بوو، ڕێنیشاندەری گەشتیاران و ڕوحی مردووان بوو، خواوەندی دزیکردن و ساختەچێتی بوو، سەرداری گوتاربێژان بوو، سەرداری بازرگانان بوو، داهێنەری پێوانەو تەرازووی پێوان بوو، یەکەم ئامێری موزیکی لەلایەن ئەمەوە داهێنرابوو، خواوەندی شوانکاران بوو، خواوەندی تەندروستی باشی بوو. ئەو سیفەتەی کە لەناوەکەی وەریگراوەو زۆرجار بەکاردەهێنرێت (هێرمسی) بەمانای داخراووی و نارۆشنی و کەسایەتی ئاڵۆز بەکاردێت.

[2]) بەدرێژایی ئەم توێژینەوەیەو، سەرەڕای نزیکی مومکیندا لەئەسڵ، بەڵام ئێمە جیاوازی دەکەین لەنێوان تەحوت ـ Thot خواوەندی نووسین لەنێو میتۆلۆژیا میسرییەکان، لەگەڵ تووت ـ Theut کە لەلای یۆنانییەکاندا لەنێو دیالۆگی فیدرۆسی ئەفلاتوندا هەیە.

بێت ـ کە هەر خۆی هێرمسیشە ـ ئەوا ژمارەیان دەگاتە (٣٦٥٢٥) کتێب و، هەموو شتەکانی جیهانی تێدا نووسراوەتەوە. بەشێك لەم کتێبخانە خەیاڵییە، لەسەدەی سێیەمەوە کۆکراوەتەوەو، ناونراوە بەناوەڕۆکی هێرمسی "Hermeticum Corpus".

(خۆرخێ لویس بۆرخێس).

" لەنێو قووڵایی ماندوێتییەکەیدا، ترسێکی شاراوە هەبوو لەداهاتووی نادیارو نەزانراو، لەڕەمزو پێشبینییەکان، لەم پیاوە ــ هەڵۆیەی ناوی ئەمی هەڵگرتبوو و، بەدوو باڵە سیحراوییەکەی لەزیندانەکەی ڕایکردبوو، لەتەحوتی خواوەندی کتێب ڕایکردبوو، ئەوەی کە بەقامیش لەسەر لەوحێك دەنووسێت و، لەسەر سەری خۆیدا سەری ئەبی مونجیل هەڵدەگرێت، قۆچی شێوە هیلالی".

(جیمس جۆیس، وێنەی هونەرمەند لەتافی لاوێدا).

" مامۆستایەکی تری ژنیش هاوار دەکات: گوایە زەمان پێشتر هەمووی کۆتاییهاتووەو، ژیانی ئێمەش تەنیا بریتییە لەیادەوەری و، ئاوەژوبوونێکی کۆتایی هاتوو کە بێگومان ساختەو براوەیە بۆ نێو سیاقێك، ناکرێت تازە بگەڕێتەوەو بگێڕدرێتەوە بۆ دواوە. ژنە مامۆستایەکی تریش دەڵێت: مێژووی گەردوون ـــ لەنێویشیدا ژیانی ئێمەو، بچووکترین وردەکاری نێو ژیانمان ـــ بریتییە لەو نووسینەی خواوەندێکی لاوەکی دایهێناوە، تاوەکو لەمیانەیدا لەگەڵ شەیتان بگاتە لێکتێگەیشتن. ژنە مامۆستایەکی تریش دەڵێت: گەردوون هاوشێوەی ئەو نووسینە ڕەمزدارانەیە کە تێیدا هەموو ڕەمزەکان وەکو یەك بەهادار نین ...".

(خۆرخێ لویس بۆرخیس).

ئێمە هەر تەنیا دەمانویست، بیرکردنەوە بانگ بکەین لەو سادەیی و، خۆڕسکی
ـ ئازادی و فەنتازیایەی، نراوەتە پاڵ ئەفلاتون لەنێو کتێبی میتۆلۆژیای تووتـداو،
ـیمان وایە پەیوەستە بەکۆمـەڵێك پێداویسـتی توونـدوتۆڵ. بونیـادی میتۆلۆژیاکـە
خۆی، بـەزۆرداری دەچـێتە ژێربـارێکی وا کـە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی میتۆلۆژیاکـە،
ـەنێو سـەمتێك لەبنـەمادا خـۆی ڕێکبخـات کـە هەنـدێکجار لـەنێو ئـەم شـتەدا
ـەردەکەوێت کە ئێمە، وەکو کارێکی ئەزموونگەری هەڕەمەکی ئەفلاتون تەماشای
ـەکەین ـ پێش کەمێك ئاماژەمان بۆ ژمارەیەك لەو بنەمایانە کرد. یا بەم شـێوەیە
تەماشـا بکرێـت کـە گوایـە بەشـێکبووە لـەکولتوورو ڕۆشـنبیری و زمـانی یۆنـانی،
هەنـدێکجاریش لـەدەرەوەڕا وەکـو گێڕانـەوەو وەرگرتنـی میتۆلۆژیایـەکی بێگانـە
تەماشا کراوە.

میتۆلۆژیایەك کە ئەفلاتون هـەر بەتـەنیا نـەهاتووە شـتێکی لێ بخوازێـت، تـەنیا
تـوخمێکی سـادەی لێ نەخواسـتووەو بیکاتـە ناسـنامەی کەسـایەتی، ئـەویش
کەسایەتی تەحووت خواوەندی نووسینە. لەڕاستیدا ئێمە ناتوانین قسە لەبارەی —
بەتایبەتیش ئێمە هیچ مەعریفەیەکمان نییە بەوەی ئەو وشەیە لێـرەدا چ مانایـەکی
هەیە — هـیچ خوازەیـەکی دەرەکـی و لـەناکاو بکـەین. بێگومـان دیـارە دەبووایـە
ئـەفلاتون چـیرۆکەکەی خـۆی بخاتـە ژێـر یاسـای بونیادگەرییانـە، گشـتیترین ئـەو
یاسایانەش ئەوانەن کـە دوالیزمییەتـەکان ئاڕاسـتە دەکـەن: ئاخـافتن — نووسـین،
ژیان ـ مەرگ، باوك ـ کوڕ، سەرکار ـ خزمەتکار، یەکەم ـ دووەم، کـوڕی شـەرعی

- یەتیم و بیژی، ڕوح - جەستە، ناوەوە - دەرەوە، خێر - شەڕ، جدی - گەمە شەو - ڕۆژ، خۆر - مانگ، ... تاد. ئەو یاسایانە بەگشتی بەپێی هەمان ئەم دارشتنە، بالادەستن لەنێو میتۆلۆژیاکانی میسری و بابلی و ئاشوری و، بێگومان میتۆلۆژیای تریشدا.

ئێمە لێرەدا نامانەوێت شوێنگەکانیان دەستنیشان بکەین، تەنانەت ئامرازی ئەم کارەشمان لەبەردەستدا نییە تا ئەنجامی بدەین. لەمیانەی بایەخمان بەو حەقیقەتەی کە ئەفلاتون هەر بەتەنیا نەهاتووە توخمێکی سادە بخوازێت، ئەوە ئێمە دێین کێشەکانی دابەزینی ڕێژەیی و بەرچاوو، پێوەندی هەرەمەکی کردەیی نێوان کولتوورو میتۆلۆژیاکان،[1] دەخەینە نێوان دوو کەوانە. ئێمە هەر تەنیا دەمانەوێت ئەم پێداویستییە ناوەکی و بونیادگەرییانە ڕابگەیەنین کە بەتەنیا توانیویەتی توانای ئەم جۆرە پێوەندییەو، هەموو ئەو جیاکارییە گریمانکراوانەی نێو توخمە میتۆلۆژییەکان لەخۆ بگرێت - mythemes.

---

[1]) لێرەدا ناچارین خوێنەر بنێرین تەماشای هەموو ئەم نووسین و بابەتانە بکات کە هەن لەبارەی پێوەندی نێوان یۆنان و خۆرهەلات و خۆرهەلاتی ناوەڕاست هەبوون. ئێمە دەزانین کە ئەم پێوەندییانە زۆربوون. لەبارەی ئەفلاتون و پێوەندییەکانیشی بەمیسرو، گریمانەی ئەوەی کە گەشتی کردبێت بۆ عین شەمس - هیلیوپۆلیس - بەپێی قسەکانی هەریەك لەسترابۆن و دۆجینیس لایبرتیوس، ئەوە خوێنەر سەرچاوەو توخمە سەرەکییەکان لەنێو کتێبی (بەرجەستەبوونی هێرمسی خاوەن سێ لای مەزن - La Revelation d Hermes Trismegiste) لەلای فێستوگێرێ - Festugiere و (ئەفلاتون لەچاوی خۆری میسریدا - Platon a Heliopolis d Egypte) ی ئێل ئار گۆدێل - L. R. Godel و (کاهینەکانی میسری کۆن - Les Pretres de L ancienne Egypte) ی ئێس سونیرۆندا - S. Sauneron، بەوردی دەبینێتەوە.

ڕاستە، ئەفلاتون باسی کەسایەتی تووت ناکات. هیچ جۆرە پێکهاتەیەکی ـەروونی دیاریکراوی پێنەدراوە، نە لەنێو دیالۆگی فیدرۆسداو، نە لەنێو ئەو کورتە ـسەی دیالۆگی فیلیپۆسدا، بەلایەنی کەم، ئەوە ڕوخسارە دیارەکەیەتی کە ئێمە ـەیبینین. لەکاتێکدا ئەگەر ئێمە بەوردی تەماشا بکەین، ئەوە دەبینین ـەوشەکەو، ناوەڕۆکی گوتارەکەی و ڕێکارەکانی، لەگەڵ ئەو پێوەندییەی لەنێو ـابەت و چەمك و دالە تێکەڵاوەکاندا هەیە، هەموو ئەوانە بەیەکەوە ڕوخسارو ـیمای ڕاستی ئەم کەسایەتییە دیاری دەکەن. ئەو بەراوردە بونیادییەی کە ناڕاستەی دەکات، واتا سیماو ڕوخسارەکەی، بەرەو خواوەندەکانی تری نووسین ناڕاستەمان دەکەن، بەتایبەتیش بەرەو یەکەم خواوەند کە بریتییە لەتەحووتی میسری، ناکرێت ئەنجام و بەروبوومی خوازەیەکی لاوەکی، یا تەنانەت تەواویش بێت، هەروەها کوڕی ڕێکەوت و خەیاڵی ئەفلاتونیش نییە. خستنەڕووی هاوشان و توندوتۆڵ، بەم شێوەیە لەنێو میتۆدی فێڵبازانەی فەلسەفەی ئەفلاتوندا، ئەوەی کە دێت میتۆلۆژیاو فەلسەفە لەیەکتر جیا دەکاتەوە، ناڕاستەی کۆمەڵێك بنەمای شاراوەترمان دەکات لەوەی تا ئێستا زانراوە.

بێگومان، دیارە تەحووتی خواوەند زۆر ڕوخسارو سەردەم و شوێنگەو ماڵ و حاڵی فرەی هەیە، ئێمەش نابێت تێکەڵاوی و ئاڵۆزی چیرۆکە ئەفسانەییەکان لەگەڵ یەکتریدا فەرامۆشبکەین، بەتایبەتیش لەم کاتانەدا کە دەبینین ئەو تێیدا ئامادەیی هەیەو تێوەگلاوە.[1] لەگەڵ ئەوەشدا، لەهەموو شوێنێکدا، کۆمەڵێك

١) لێرەدا دەشێت لەخۆمان بپرسین: کە ئایا شوێن و پێگەی تووت ــ تەحووت لەنێو میتۆلۆژیای میسری کۆندا هەمان شوێن و پێگەی پاشا نییە؟ ئایا لەئاستی پلەو پایەی ئەو نزمترە؟ لەنێو میتۆلۆژیا کۆنەکانی میسردا تووت خواوەندێکە زۆرجار بەناوی کوڕی

خواوەندی پاشا دێت ــ ئامون راع ــ بۆیە لەشوێنێکدا کاتێک خۆی پێناسە دەکا دەڵێت:" من تووتم کوڕە گەورەی ئامون ڕاع". ئامون ڕاع خواوەندێکە لەسایەی ئاخافتن و وشەوە هەموو شتێك بەرهەم دێنێت، ناوی هەر شتێك بێنێت، ئەگەر بەر لەئەوکات بوونیش نەبوو بێت، ئەوە یەکسەر دێتە بوون و، دروست دەبێت و بەرهەم دێت. دەلالەتی ئەم سیفەتانە ـ دەسەڵاتی ئاخافتن و خەملاندن و بڕیاردان، ئافرێدەکردنی بوون و ژیان بەپێی هەندێك میتۆلۆژیای میسری کۆن، تووت، بەناوی پاشای خواوەندەوە قسە دەکات ئەو قسەکەری ڕەسمی خواوەندی باوکە، ئەوە دێت ئاخافتنەکانی باوك ڕاڤە دەکات، ئەو دێت دەلالەت دەبەخشێتە دالەکان. لەنێو هەندێك لەمیتۆلۆژیاکان، تووت بەوە ناسراوە جیاوازی دەخاتە نێو زمان، وا دەکات مانای ئاخافتنی پاشای باوك و خواوەند، مانای جیاواز لەخۆیانەوە بگرن. ئەوە وازی دەلالەتەکان ئەنجام دەدات و، دەلالەت بەدالەکان دەبەخشێت. خواوەندی باوك بیردەکاتەوەو قسە دەکات، ئەویش دێت مانای جیاواز دەخاتە ڕوو بۆ قسەکانی. ئالێرەدایە جیاوازی زمانەکانیش بۆ خودی تووت دەگەڕێتەوە. ج. سیرنی گۆرانییەك لەنێو میتۆلۆژیای میسری کۆن وەردەگێڕێت کە لەبارەی تووتەوەیە تێیدا دەگوترێت:" سڵاوت لێ بێت ئەی تووتی مانگ، ئەی ئەوەی زمانی هەموو ناوچەکانت کردە جیاواز". کەواتە تووت هەر لەخۆیەوە زمانی نووسینی دانەهێناوە بەڵکو ئەوە کارو فرمانی ئەو بووە، ئەو خواوەندی زمانی لاوەکی و جیاوازی زمانەوەر بوو. تووت ناتوانێت ببێتە خواوەندی قسەکردن و ئاخافتن و داهێنان، تەنیا لەسایەی گۆڕینێکی زمانەوانی و، شۆڕشێکی زمانەوانی مەزن و، پرۆسەیەکی مێژوویی نەبێت بتوانێت زمان لەئاستێکەوە بگوازێتەوە بۆ ئاست و شێوەیەکی تر. ئەوە پرۆژەی کودەتا شۆڕشێکی مەعریفی و سیاسی و ئابووری گەورەیە تووت لەپەنای زمانەوە گەرەکی بوو ئەنجامی بدات. پرۆژەی بەها بەخشین بەنووسین و پیادەکردنی تاوەکو لەولاوە لەپیرۆزی ئاخافتن و پلەو پێگەی خواوەندی باوك کەم بکاتەوە. ئاساییە کاتێك باوك هەست دەکا سێنتەرێکی تری مەعریفی بەناوی نووسینەوە دێتە بوون، ڕاستەوخۆ تێدەگات و دەزانێ بوونی سێنتەرێکی تر، واتا بێ بەهایی سێنتەری ئەو، باوکیش ڕێگا نادات سێنتەرێکی تر لەدەرەوەی دەسەڵات و سێنتەری ئەو بێتە بوون. لەسایەی ئەم پرۆژەیەوە، تووت گەرەکی بوو شوێنگەی باڵادەستی خۆی بگۆڕێت و جێگەی ڕاع بگرێتەوە. تووت هێما

ـەمای جێگیر دەردەکەون و، دەبنە هۆی ئەوەی وێنـەی پیتـی تایبـەت و جیـاواز
کێشن، هێڵی وا بکێشن کە جـەختیان کراوەتـەوە سـەر. زۆر شـت هەیـە وامـان لێ
ـەکەن بڕوامان وا بێت کە ئەمانە، دەبنە هۆی پێکهێنان و دروستکردنی ناسنامەی
جێگیر بۆ ئەم خواوەندە لەنێو کۆمەڵگەی خواوەندەکاندا، ئەوە ئەگـەر کـاری ئـەم
ـەبێت. وەکـو ئـەوەی ئێمـە تێبینـی دەکـەین، ئـەم دێـت کـار لەسـەر
مەڵوەشـاندنەوەیەکی تێکدەرانـەی ناسـنامە دەکـات بەگشـتی، هـەر لەناسـنامەی
بنەماگەراییەوە تا دەگاتە مەرجەعییەتی لاهووتی.

باشە ئەو سیما داپۆشراوانە چین کە خۆیان بەسـەر ئـەم کەسـانەدا دەسـەپێنن کاتێك دەیانەوێت سەرلەنوێ هاوشێوەیی بونیادگەرییانەی نێوان وێنەی ئـەفلاتونی و، وێنەی میتۆلۆژی تری ئەسڵی نووسین دروستبکەنەوەو دابڕێژنەوە؟ دەرخستنی ئەم سیمایانە، نابێت هەر تەنیا لەوەدا خزمەتمان بکەن ئێمە بتوانین دەستنیشانی هەر یەکێك لەو دەلالەتانە بکەین لـەنێو گەمـەی ــ وازی دوالیزمییـەتی مەبەسـت و گرێچنەکاندا، وەکو ئەوەی پێشتر خستمانە نێو زنجیرەیـەکی بێکۆتـایی، یـا لـەنێو گوتـاری ئەفلاتونیـدا، یـا تەنانـەت لـەپێکهاتنی میتۆلۆژیاکانیشـدا. بـەڵکو دەبێـت بمانبەنـەوە بـۆ ئیشـکالییەتی گشـتی پێوەنـدی نێـوان توخمـە میتۆلۆژییـەکان و، فەلسـەفەی جێنشـینبوو لـەنێو ئەسـڵی لۆگۆسـی خۆرئاواییـدا. واتـا ئیشـکالییەتی مێژوویی ــ یا بەمانایەکی تر ئـەم مێـژووەی ــ کـە هـەر هـەمووی بەتـەواوی لـەنێو

---

مانگ بووە، دیارە مانگیش کاتێك دەردەکەوێت کە خۆر نامێنێت و، جێگـای خۆی چۆڵ دەکات، کەواتە تووت لە نا ئامادەگی ڕاع دا کار دەکات و، بالادەستی خۆی ڕادەگەیەنێت. بەم شێوەیە ئەسڵی مانگ وەکو زیادەیەکی خـۆر دەردەکـەوێت، ئەسـڵی نـووری شـەویش وەکو زیادەیەکی نووری خۆر، نووسینیش دەبێتە زیادەیەکی ئاخافتن. (وەرگێڕی کوردی)

جیاوازی فەلسەفییانەی نێوان میتۆس ـ عەقڵی ئەفسانەیی و غەیبی ـ لەگەڵ لۆگۆس ـ عەقڵی گوتارو حیسابدا سەریان هەڵداوە. دەڵێین ئەم گوتارە، و دامەزراوە کە کوێرانە ئاوێتەو تێکەڵاوی بووە، وەکو ئەوەی هەر بەشێوەیەکی سروشتی پێوەندی هەبێت بەنێوەندی تایبەتی خۆی.

کەواتە، خواوەندی نووسین لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا، کەسایەتییەکی ملکەچ و لاوەکییە، تەکنۆکراتێکە، داماڵراوە لەهەموو توانایەك بۆ خوێندنەوە. ئەندازیارە، خزمەتکارێکی بەتواناو فێڵبازە، دەسەڵاتی پێدراوە بتوانێت بچێتە بەردەم خواوەند، خواوەند کە حەزی کرد لەنێو مەجلیسی خۆیداو، لەبەردەم خواوەندەکاندا پێشوازی لێبکات. تووت دێت بەرهەمی دەسکردی خۆی ـ tekhne وەکو فارماکۆنێك ـ نمایش دەکات و پێشکەشی پاشای دەکات. پێشکەشی پاشا، باوك، خواوەندی دەکات، پاشا کاتێك قسە دەکات و لەمیانەی دەنگە خۆاییەکەیەوە[1] فرمان دەردەکات. کاتێك خواوەندی پاشا بڕیاری خۆی دەدات، یا وای لێ دەکات لەبەرزاییەوە بکەوێتە خوارەوە، ئەو کاتەی باوك لەکاتی خۆیدا بڕیاری ئەوە دەردەکات کە دەبێت فارماکۆن بکەوێتە خوارەوە، یا بەلاوە بنرێت و بێ بایەخ تەماشا بکرێت، ئەوە تووت هیچ وەڵامێکی ناداتەوە. هێزە ئامادەبووەکان نەیانهێشت ئەو لەشوێنی خۆیدا بجوولێت و، چەق وەستابوو.

ئەرێ باشە ئەمیش هەمان پێگەی نییە لەنێو میتۆلۆژیای میسریشدا؟ لێرەشدا، تەحووت خواوەندێکی ئافرێدەکراوە. زۆرجار بەناوی کوڕی خواوەند ـ پاشای

[1]) لێرەدا مەبەست لەدەنگە خۆراوییەکەی، دەنگی خواوەندە کە وەکو تیشکی خۆر وێناکراوە لەنێو ئەفسانەکەدا، دەنگێك لەتیشکی خۆر چنراوەو هەرگیز دەسگیر ناکرێت و هێزی تایبەتی خۆی هەیە کە ئەنجامی پیرۆزی ئاخافتنە.

حور، بانگ دەكرێت و ناودەبرێت، كوڕی خواوەند ــ خۆر، ئامون ــ ڕاع:" من ئەحووتم، كوڕی گەورەی ڕاع"[1]. ڕاع ـ خۆر ئەو خواوەندەیە كە هەموو شتەكانی هێناوە، ئەو تەنیا لەمیانەی وشە شتەكان ئافرێدە دەكات و بەرهەمیان دێنێت.[2] ناوەكەی تری ئەوەی كە لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا بەكاردێت بریتییە لەئامون، مانای بۆماوەیی ئەم نازناوەش، بریتییە لە: شاراوەو نادیارو پەردەپۆشكراو. بۆیە، لێرەشدا ئێمە لەبەرانبەر خۆرێكی شاراوەداین،[3]

---

[1]) بڕوانە: ئێس. مۆرێنز (ئایینی میسری ـ La Religion egyptienne). مۆرێنز پێی وایە ئەم شێوە قسەكردن و داڕشتنە زۆر سەرنجڕاكێشە بەهۆی هەبوونی ڕاناوی كەسی یەكەمی تاكی قسەكەر كە بەناوی خۆیەوە دەئاخفێت و دەنووسێت:" پێمان وایە ئەم بەكارهێنانە زۆر سەنجڕاكێشە، چونكە ئەم جۆرە داڕشتنانە زۆرجار لەنێو سروودە نووسراوەكانی یۆنانیشدا هەن كە داوای دەستتێوەردان لەخواوەندی میسری كۆن ئیزیس دەكەن (من ئیزیسم، ..... تاد). ئەوەش مانای وایە، ئێمە مافی ئەوەمان هەیە پرسیار لەبارەی ئەوە بكەین كە ڕەنگە ئەم سروودانە لەمیسرەوە وەرگیرابن و چووبنە دەرەوەی میسر".

[2]) خواوەندەكانی كۆن بۆ ئەوەی شتێك ئافرێدە بكەن و دروستی بكەن و بەرهەمی بێنن، هەر ئەوەندەیان بەس بوو ناوی بێنن و بئاخفن تاوەكو ئەم شتە بێتە بەرهەم و ئافرێدە بێت. لەمیانەی دەنگەوە، ئەوان دەتوانن بوونەوەرو شتەكان دروست بكەن.

[3]) بڕوانە مۆرێنز، هەمان سەرچاوەی پێشووترو، ئێس. سۆنێرن كە لەم بارەیەوە جەخت دەكاتە سەر ئەوەی:" ئێمە نازانین بەڕاستی ناوەكەی چ مانایەك دەگەیەنێت، بەڵام بەهەمان ئەم شێوازە گوزارشتی لێ دەكرا كە مانای (دەشارێتەوە) و (شاردنەوە) دەیگەیەنێت. ئەم كەسانەی دەقەكانیان كۆپیكردووە، یاریان لەسەر ئەم چەمكە كردووەو، وا ناساندوویانە كە بریتییە لەوەی ئامونی خواوەندی مەزن ڕوخسارو سیمای ڕاستەقینەی خۆی، لەمنداڵ و نەوەكانی دەشارێتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، خەڵكانێكی تر دوورتریش ڕۆیشتن و چوونە سەر ئەو میراتە كولتوورییەی لەمیانەی هیقاتسی ئەبدریری ـ

ئەستێرەیەك كە باوكی هەموو شتەكانەو، تەنیا لەمیانەی ئاخافتنەوە نمایندە دەكرێت و بەرجەستە دەبێت.

یەكێتی فۆرمگەرایی ئەم دەلالەتانە ــ دەسەڵاتی ئاخافتن و، ئافرێدەكردنی بوون و، ژیان و، خۆر، یا وەكو ئەوەی تێبینی دەكەین چاویش، شاراوەیی و پەردەپۆشی ـ هەر هەموویان خۆیان لەنێو ئەو شتەدا دەبیننەوە كە دەكرێت ناوی بنێین چیرۆكی هێلكە، یا هێلكەی نێو چیرۆكەكان. جیهان هەر هەمووی لەهێلكەیەكەوە سەرهەڵدەدات، بگرە زۆر وردتر قسە بكەین، دەڵێین ئافرێدەكاری زیندوو، خۆی ژیانی جیهانی لەهێلكەیەكەوە ئافرێدەكردووە: لەسەرەتادا خۆر لەنێو پەلكی هێلكەدا هەڵگیرابوو. بۆیە لێرەدا ئێمە دەتوانین شرۆڤەی زۆر لەسیفەت و سیماكانی ئامون ــ ڕاع بكەین، چونكە ئەم باڵندەیەو دەفڕێت هەڵۆیەو لەبەرزاییدایە، "منم ئەو هەڵۆ گەورەیەی لەنێو هێلكەكەیدا هاتۆتە دەرەوە". بەڵام ئامون ڕاع مادام ئەسڵی هەموو شتەكانە، ئەوە هەر خۆی ئەسڵی هێلكەكەشە. هەندێكجار وەكو باڵندەی ــ خۆر كە لەهێلكەیەك لەدایكبووە.

---

Hecatee d Abdere كۆكرابوونەوە، توخمی كاهینانەی ناوی ئامونیان وا شرۆڤە كرد، گوایە ئەم وشەیەیە كە لەمیسردا بۆ بانگكردنی كەسێك بەكاردێت. ڕاستە زاراوەی ئەموانی ــ amoini بەمانای وەرە، وەرە لای من بەكارهاتووە، دیارە كە بەشێك لەسروودەكانیش بەوە دەسپێدەكەن (ئەموانی ئامون ... ــ وەرە لای من ئەی ئامون). تەنیا هاوشێوەیی نێوان ئەم دوو زاراوەیە وای لەكاهینەكان كردووە بڕوایان وابێت كە پێوەندی پتەویان بەیەكەوە هەیەو لەمیانەی ئەم پێوەندییەشدا هەوڵبدەن شرۆڤەیەك بۆ ناوی خواوەند بكەن، بۆیە دەبینین كاتێك دەگەڕێنەوە بۆ خواوەندی سەرەتایی، وەكو ئەوەی وایە بگەڕێنەوە بۆ لای بوونەوەرێكی نەبینراو و شاراوە، هانی دەدەن و بانگی دەكەن بۆ ئەوەی ئامون خۆی دەرخات و پیشانیان بدات".

ـماژەی بۆ دەکرێت و ناوزەد دەکرێت، هەندێکجاری تریش وەکو باڵندەی ئەسڵی مەلگری یەکەم هێلکە. لەو حاڵەتەشدا، مادام دەسەڵاتی قسەکردن ــ ئاخافتن ـوێنەو تێکەڵاوی توانای خواوەندو ئافرێدەکردن بووە، ئەوە هەندێك لەدەقەکان ـمی "هێلکە تروکاوە گەورەکە دەکەن". لێرەدا پرسیارکردن هیچ مانایەکی ـیە، جا ئەو پرسیارە سادە، یا فەلسەفی بێت، پرسیاری "هێلکەو مریشك" و پێشینەی لۆژیکی و سەردەمەکان، یا پرسیاری ئەنتۆلۆژی لەبارەی هۆکار بە بەراوردو پێوەر لەگەڵ ئەنجامدا. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە، هەندێك دەقی کۆن، زۆر بەجوانی وەڵامیان ئامادە کردووە:" ئەی ڕاع، ئەی ئەوەی لەنێو هێلکەکەی خۆتدا جێنشینی". ئەگەر ئێمە ئەوەشی بخەینە سەر کە ئەو هێلکەیە " هێلکەیەکی شاراوەیە"، ئەوە ئێمە سەمتێکمان لەو دەلالەتانە دروستکرد و کردمانەوە.

ملکەچی تەحووت ـ ئەبی مونجەل ـ ئەو کوڕە گەورەیە بۆ باڵندەی ئەسڵی و پاشکۆیەتی بۆ ئەو، لەنێو کۆمەڵێك وێنەی جیاوازدا دەردەکەوێت: بۆ نموونە لەنێو ڕێبازی مەمفیسیدا[1] ئەوە کە لەمیانەی زماندا پڕۆژە مەزنەکەی حۆرسی[2]

---

[1]) شاری مەمفیس شارێکی میسری کۆنە دەکەوێتە دووری (٣٠) کم لەباشووری قاهیرە، پێشتر لەسەردەمی ئیمپراتۆرییەتە کۆنەکانی سەرەتایی فیرعەونەکاندا، پایتەخت بووەو، دواتریش ئیمپراتۆرییەتەکانی دواتر، دێن شاری تیبە دەکەنە پایتەخت، بەبێ ئەوەی مەمفیس تواناو دەسەڵاتی کولتووری و شارستانی خۆی لەدەستدا بدات.

[2]) حۆرس بەمیسری کۆن (هۆر) بووە، خواوەندێکی کۆنی میسرییەو لەشێوەی بازو هەڵۆدا وێنەکێشراوە، یا پیاوێك بەڵام سەرکی هەڵۆی هەبووە. لەسەرتادا، خواوەندی گەورەی ئاسمان بووە، چاوەکانی سیمبولی خۆرو مانگ بوون، ئینجا دواتر گۆڕاوەو خۆی بۆتە خۆر ــ خواوەندو پاشا. بۆیە هەموو فیرعەونێك دوای ئەم مێژووە، ناوی حۆرسی وەکو

ئافرێدەکار جێبەجێ دەکات.[1] ئەوە کە هەڵگری سیماو ڕوخساری خواوەندو گەورەیە ــ خۆر. ئەوە کە دێت شرۆڤەی ئاخافتن و قسەکانی دەکات، وەکو ئەوەی وتەبێژی ئەم بێت. ئەویش وەکو هێرمسی هاوتا یۆنانییەکەی کە ئەفلاتون هەرگیز باسی لێوە ناکات، ڕۆڵی خواوەندی پەیامبەر دەگێڕێت، ئەو کەسە فێڵبازەی نێوەندگیری دەکات، زیرەك و، زۆرزانە، ئەوەی بەردەوام شتەکان دەشارێتەوەو خۆیشی ون دەکات و، بەردەوام خۆیشی دەشارێتەوە. ئەوە کە خواوەندی دالە، خواوەندی دەلالەتە. ئەوە کە پێویستە لەسەری شتەکان رابگەیەنێت و لەمیانەی وشەوە دایانبڕێژێت، ئەو وشانەی کە پێشتر حۆرس بیری لێکردوونەتەوە، ئەم دێت دەیانکاتە ئاخافتن تا بێنە بوون. ئەو زمانەی وایکردووە ئەم ببێتە پارێزگارو نهێنی پارێزو سکرتێری خواوەند، ئەوە دێت نوێنەرایەتی دەکات تاوەکو پەیام و نامەکان بگەیەنێت[2] و بیانکات بەهزرو بیرکردنەوەیەکی

---

پێشناوێك خستۆتە بەرناوی خۆی. لەگەڵ سەرهەڵدانی ئایینی ئۆزیریسی لەمیسردا، حۆرس خرایە نێو بازنەی میتۆلۆژیا ئۆزیریسییەکان و فیرعەونی مردوو و ئۆزیریس کران بەیەك، لەولاشەوە فیرعەونی زیندوو و حۆرس کران بەیەك، بەوەش پێگەی حۆرس گۆڕاو بووە کوڕی ئۆزیریس و ئیزیس (هاربۆقراتیسی بچووك)، کە بەردەوام لەخەباتدایە لەدژی سیت ـ ی مامی (سیت بەیۆنانی بۆتە سیتیك) کە دەیویست سامان و دەسەڵاتەکەی داگیر بکات.

[1]) بڕوا وایە ئەم دوو خواوەندە (حۆرس و تەحووت) هاوبەشبوون لەئافرێدەکردن و دروستکردنی بووندا، حۆرس بریتی بووە لەو هزرەی کە وێنا دەکات و بیر دەکاتەوە، تەحووتیش ئەو قسەو ئاخافتنە بووە کە جێبەجێ دەکرێت.

[2]) بڕوا وایە تەحووت پەیامبەریش بووە، ئەو خۆیشی هێرمینیۆس ــ ڕاڤەکارو شرۆڤەزان بووە، ئەوەش یەکێکە لەو هێماو ئاماژە زۆرانەی کە هاوبەشن لەنێوانیان لەگەڵ هێرمس.

حولوەندانەو بیانگەیەنێت، ئەوەی پێشتر بیری لێکراوەتەوەو داڕێژراوەو بۆتە ێنەیەکی ئەنجامدراو.

ئەو خۆی پەیامەکە نییە، بەڵکو بەرەهایی نوێنەری چرکەساتی داهێنەرانەیە. ریتییە لەقسەی دووەم و لاوەکی. کاتێك تەحووت خەریکی مامەڵەکردن و زمانی ئاخافتنە لەگەڵ نووسین نا ـ کە لەڕاستیدا ئەم حاڵەتە زۆر کەمیشە ـ ئەوە ئەو ببێتە نووسەرو بێژەری ڕەهای زمانی کارپێکراو. بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئەم دێت جیاوازی دەخاتە نێو زمان و فرەیی، جیاوازی زمانەکانیش بۆ ئەم دەگێڕدرێتەوە.[1] (ئێمە لەشوێنێکی دوورتردا، دەگەڕێینەوە سەر ئەفلاتون لەنێو دیالۆگی فیلیپۆس، ئەگەر جیاکاری ببێتە چرکەساتی دووەم و، ئەم لاوەکییەتە خۆی سەرهەڵدانی نووسەران نەبێت وەکو ئەسڵێك و، توانای لۆگۆسیش بەتایبەتی. ئێمە لەنێو دیالۆگی فیلیپۆسدا دەبینین تووت وا ئاماژەی بۆ کراوە گوایە ئەو بەرهەمهێنەرو دروستکەری جیاوازییە: دروستکەری جیاوازی لەنێو زمان، نەوەکو فرەیی و جیاوازی زمانەکان. ئێمەش پێمان وایە لەبنەچەدا، هەردوو کێشە ناکرێت لەیەکتری جیا بکرێنەوە).

مادام ئەو خۆی خواوەندی زمانی لاوەکی و، جیاوازی زمانەوانییە، ئەوە تەحووت ناتوانێت ببێتە خواوەندی قسەکەری ئافرێدەکار، تەنیا لەڕێگای گۆڕینی

---

[1]) جی. سێرنی سروودێکی تەحووت دەگێڕێتەوە کە بەم شێوەیە دەسپێدەکات:" سلاوت لێ بێت ئەی تەحووتی مانگ، ئەی ئەوەی زمانی هەموو ولاتانت جیاواز کرد". بەپێی بۆچوونی سێرنی، ئەم بەڵگەنامەیە زۆر دگمەنەو ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە بۆیلانیش لەنێو کتێبی (تەحووت، هێرمسی میسر) دەقێکی تری هاوشێوە نمایش دەکات کە تێیدا هاتووە:" تۆ، ئەی ئەوەی زمانی هەموو ولاتە بێگانەکانت جیاکردەوە".

کونیەی خۆی و، تەنیا لەڕێگای خزانی مێژوییەوە نەبێت، هەندێکجاریش لەمیانەی تێکدانێکی توندوتیژانەدا ئەم کارە دەکات.

بەم شێوەیە، ئەوە تەحووت لەمیانەی جێگۆڕکێدا، دێت جێگای ڕاع دەگرێتەوە، وەکو چۆن مانگ دێت جێگای خۆر دەگرێتەوە. بەم جۆرە خواوەندی نووسین دەبێتە جێگری ڕاع، کەواتە هەر خۆی لەکاتی نا ئامادەگی و بزربوون و شاراوەبوونی ڕاع دا، دێت جێگای ئەویش دەگرێتەوە وەکو جێگرێك. ئەم ئەسڵی مانگە وەکو زیادەیەکی خۆر، ئەسڵی ڕووناکی شەوە وەکو زیادەیەك بۆ ڕووناکی ڕۆژ. نووسینیش وەکو ئەوەی زیادەی ئاخافتنە. " ئەو کاتەی ڕاع لەئاسماندا بوو، ڕۆژێك لەڕۆژان گوتی:" بڕۆن تەحووتم بۆ بێنن"، ڕاستەوخۆ تەحووتیان هێنا بەردەمی. جەنابی ئەم خواوەندە بەتەحووتی گوت:" وەرە لەجێگای من لەنێو ئاسمان دانیشە، تاوەکو من دەچم ڕووناکی بەکەسە باشەکانی نێو هەرێمە تاریکەکانی خوارەوە دەبەخشم .... تۆ لەجێگای من دەبیت، جێگری منی، ناویشت دەبێتە: تەحووت، جێگری ئامون ڕاع". ئینجا زۆر شت هاتنە بوون و، سەریان هەڵدا بەهۆی ئەوەی گەمەی لەسەر وشەکانی ڕاع کرد. ئەم، بەتەحووتی گوت:" کارێکی وا دەکەم بەجۆرێك جوانی و ڕۆشناییت هەردوو ئاسمان لەباوەش بگرێت ionh، لەو چرکەساتەدا مانگ ioh لەدایکبوو و، سەری هەڵدا".

لەشوێنێکی دوورتریشدا، کاتێك ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە تەحووت وەکو جێگری ڕاع شوێنگەیەکی کەمێك نزمتر لەو پلە بەرزو پیرۆزە داگیر دەکات، دەڵێت:" کارێکی وا دەکەم کە hob شتی زۆر لەخۆت گەورەترت بۆ بنێرێت"، لەو چرکەساتەدا ئەبو مەنجەل hib باڵندەی تەحووت سەری هەڵداو هاتە بوون.

ئەو جێگۆڕکێیەی کە دەیبینین، ئەوەی لەسەر شێوەی گەمەو وازییەکی پەتی
ـشماوەی کۆن و، زیادە بوونەوە دێتە بەرچاو، یا ئەگەر حەز دەکەن دەڵێین
ـەوەی لەنێو سیستەمی دالی پەتیدا ڕوو دەدات، هیچ واقیعییەتێکی تێدا نییە، هیچ
مەرجەعێکی بەڕانی و، هیچ مەدلولێکی تراندنسندنتالی تێدا نییە تاوەکو
ـەستنیشانی بکات و، ڕێکی بخات و، سنووورداری بکات، ئەو جێگرتنەوەیەی کە
ـەتوانین ناوی بنێین زۆر شێتانەیە، چونکە ئەوەندە بێکۆتاییانە جێنشینە لەنێو
ـوخمی ئاڵوگۆڕی زمانەوانی ئەلتەرناتیف و، ئەلتەرناتیڤی ئەلتەرناتیڤەکان.

دەڵێین ئەو بەرەڵلابوونە شێتانەیە، هەرگیز بێ تووندوتیژی نییە. هیچیش لەو ئاڵۆزییە زمانەوانییە تێناگەین، ئەگەر ئێمە توخمی ئاشتیخوازانەی نێو جەنگێکی وەهمی بەدی بکەین و، گەمە لەسەر وشەکان بکەین بەبێ ئەوەی کەس ئازار بدەین، بەرانبەر بە دژایەتیکردنێك ـ polemos کە لەنێو واقیعدا ئاڵۆزی و تێکدان بەرهەم دێنێت. واقیعێکی سەیر نییە بۆ گەمەکردن بەوشە، ئەگەر تەحووت بەم شێوەیە زۆرە بەشداربێت لەپیلان و موئامەرەکاندا، کاری ساختەچییانەو کردەوەو فێڵبازانە، مانۆڕو کۆنترۆڵکردن و داگیرکردنی شتەکانی پاشا. یارمەتی کوڕەکان دەدات کاتێك هەوڵدەدەن خۆیان لەدەسەلاتی باوکیان ڕزگار بکەن، یارمەتی براکانیش دەدات کاتێك دەیانەوێت خۆیان لەبرا گەورەکانیان دەرباز بکەن کاتێك ئەمان دەبن بەپاشایان. چیتر نۆت Nout کە بەر نەفرەتی ڕاع کەوتووە، هیچ مێژوویێکی نابێت، هیچ ڕۆژێکی نابێت لەنێو ڕۆژژمێردا تاوەکو منداڵی ببێت. ڕاع دەرگای زەمەنی بەسەر داخستووە ـ وەکو چۆن دەڵێین ڕیگای لێ داخستووە ـ هەموو ڕۆژێك ڕێگای لێ دەگرێت و ناهێڵێت بێتە بەر ڕۆشنایی، هەموو کاتێك ڕێگای

لێ دەگرێت بێتە نێو جیهان و لەدایك ببێتەوە. بۆیە تەحووت خۆی بۆتە خاوەنی دەسەڵاتی حیساب و، ڕۆژژمێری و، سەیروورەتی زەمەنی و، پێنج ڕۆژی زیاد کرد بۆ زەمەن. ئەو زەمەنە زیادەیە، بووە هۆی ئەوەی نۆت بتوانێت پێنج کوڕی ببێت: حارۆریس، سیت، ئیزیس، نەفتیس، ئۆزیریس، کە دواتر لەپاش باوکی ـ جیب ـ دەبێتە پاشاو جێگای ئەم دەگرێتەوە.

لەسەردەمی ئۆزیریس پاشا ـ خۆر، تەحووت کە برای ئەوە "هەڵساوە بەوەی مرۆڤەکان فێری ئەدەب و هونەر بکات"، هاتووە "نووسینی هێرۆگلیفی داهێناوە تاوەکو توانای ئەوەیان پێبدات بیروبۆچوونی خۆیان بنووسنەوەو جێگیری بکەن". بەڵام دواتر بەشداری دەکات لەپیلان و موئامەرەکەی سیتی برای ئۆزیریس کە ڕقی لێی دەبۆوە. ئێمە ئەو میتۆلۆژیا ناودارەش دەزانین کە لەبارەی مەرگی ئۆزیریسەوەیە: بەفرت و فێڵ و تەڵەکەبازی، دەخرێتە نێو سندوقێك کە بەقەد لاشەی خۆی دروستکراوە، ئینجا دوای سەرکێشییەکی زۆرو، ڕووداوی زۆرو، گەڕانی یەکجار زۆریش، ئیزیسی خێزانی دەیدۆزێتەوەو، دەبینێت جەستەکەی پارچە پارچە کراوە بۆ چواردە بەش، ژنەکەی هەموو بەشەکانی جەستەکەی دەدۆزێتەوە، تەنیا ئەندامی نێرینەی نەبێت کە ماسییەك خواردبووی. ئەوەش ڕێگای لەتەحووت نەگرت بەشێوەیەکی نەرم و نیان و ئوسولیانە بجولێتەوەو، بتوانێت ئەم تاوانە لەبیر بکات.

کەچی ئیزیس خۆی گۆڕی بۆ سەر شێوەو فۆڕمی هەڵۆو، لەسەر جەستەی پارچە پارچە کراوی ئۆزیریسی مێردی ڕاکشاو دایپۆشت، بەم شێوەیە حۆرس لەدایك دەبێت. حۆرس، ئەو منداڵەی ـ پەنجەی ـ لەنێو ـ دەمیدایە، کە دواتر

ـیت بکوژەکەی باوکی لەناو دەبات، بەڵام سیت دەتوانێت لـەم شـەڕەدا، چـاوێکی ـەم لێبکاتەوەو دەری بێنێت، حۆرسیش دەتوانێت هەردوو هێلکە گونەکانی سـیت ـەربێنێـت و لـەناویان ببـات. کاتێـك لەمیانـەی ئـەم شـەڕەدا، حـۆرس دەتوانێـت چاوەکەی خۆی بەدەست بێنێتەوە، پێشکەشی باوکی خۆی دەکـات ــ ئـەو چـاوە هەر خۆی مانگیش بوو: تەحووت. بەم جۆرەش حۆرس ژیانی بۆ خۆی گێڕایـەوەو، جارێکی تریش هێزی خۆی بەدەستهێنایەوە. تەحووت لەکاتی جەنگدا، توانیبـووی ـەم دوو جەنگاوەرە لەیەکتری بکاتەوەو، دووریان بخاتەوە، مادام ئـەم خواوەنـدە ـ پزیشك ـ دەرمانساز ــ سـیحربازە، ئـەوە تـوانی هـەردووکیان چـاك بکاتـەوەو، برینەکانی ئەوان سارێژ بکات. دواتـریش کاتێـك چـاوو هێلکـە گونـەکانی خسـتەوە شوێنەکانی خۆیان، دادگایەك سازدراو، تەحووت لەدژی سیتی هاوبەش و هاوکاری خۆی وەستایەوەو، لایەنگیری لەڕاستی و دروستی قسەکانی ئۆزیریس کرد.

تەحووت، ئەو جێگرە بوو کە دەیتوانی جێگای پاشا ـ باوك ـ خۆر ــ ئاخـافتن ـ بگرێتەوە. تەحووت کە وەکو نوێنەرو، ماسك و، ڕووپۆش و، دووبارە بوونـەوەی پاشـا ناسـراو بـوو، دەیتـوانی زۆر بەسروشـتی، هـەر بەتـەواوی جێگـای ئـەویش بگرێتەوەو، هەموو دەسەڵاتەکانی ئەویش بەکاربێنێت. تەحووت وەکـو زیادەیـەکی بنچینەیی وابوو بۆ سەر کەسایەتی پاشا، باوك، لەکاتێکدا پاشا بەهیچ شتێك لەئەو جیـاوازتر نـەبوو. بـەهیچ شـێوەیەك جیـاواز نـەبوو لـەئاخافاتن و ڕۆشـنایی خواوەندی.[1]

[1]) بەم شێوەیە دەشێت خواوەنـدی نووسـین ببێتـە خواوەنـدی ئاخـافتنی ئافرێـدەکار. ئـەم توانـا بونیادییـە لەپێگـەی (زیـادە)و، لـۆژیکی (زیـادە) وە سـەرهەڵدەدات. دەشـێت وا تەماشای ئەم حاڵەتەش بکەین وەکو پێشفەچوونێك لـەنێو مێـژووی میتۆلۆژیـادا. ئـەوەش

بەڵام بەرلەهاوشێوەیی و جیاوازی نێوان نوێنەرایەتیکردن و، داگیرکردن و دەسبەرداگرتندا، ئەگەر بکرێت بڵێین ئەوە تەحووت لەبنچینەدا خواوەندی نووسینەو، ئەمینداری ڕاع و نۆ (٩) خواوەندەکانی تره، نووسەری زمانی هێرۆگلیفی و، تۆمارکەری یادەوەرییەکانە. بەڵام، وەکو ئەوەی دەبینین، ئەوە تاموس لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا دەردەکەوێت، هیچ بەهایەك بەفارماکۆن ـ نووسین ـ نابەخشێت و عەیب و عاری زۆری لێ دەبینێتەوە hypomnesis ـ

---

کارێکە فیستۆگێر دەیکات و دەنووسێت:" لەگەڵ ئەوەشدا، تەحووت بەم پێگە لاوەکییە ناوەستێت. لەو سەردەمەدا کە کاهینەکانی میسر سەرقاڵی دانانی چیرۆك بوون لەبارەی ئافرێدەبوون و دروستکردنی گەردوون، هەموو کاهینێك لەناوچەکەی خۆیدا، هەوڵیدەد ڕۆڵی سەرەکی و مەزن بەم خواوەندە ببەخشێت کە خۆی دەیپەرستێت، زانایانی لاهووتی هیرمۆپۆلیس کە لەململانێدابوون لەگەڵ زانایانی دەلتاو هیلیۆپۆلیس، هاتن چیرۆکێکی ئافرێدەکردنیان دانا کە تێیدا پشکی شێر بەر تەحووت کەوتبوو. مادام تەحووت سیحرباز بوو، مادام هێزو گرنگی دەنگەکانی دەزانی، چونکە ئەگەر بەشێوە دەربڕینێکی ڕاست و ڕەوان گوزارشتی لێبکرابووایە، ئەنجامێکی دەبوو کە دواتر گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوەی بۆ نەبوو، بۆیە بێگومان ئەم لەمیانەی دەنگ و ئاخافتنەوە جیهانی ئافرێدەکردووە. بەم شێوەیە دەنگی تەحووت ئافرێدەکارەو دروست دەکات و دادەمەزرێنێت. کاتێك خۆیشی لەنێو خودی خۆیدا چڕ دەکاتەوە وەکو ماددەیەك، ئەوە دەبێتە کیانێك. تەحووت دەتوانێت هاوشێوەی خودی خۆی چۆن هەر تەنیا لەگەڵ سەرهەڵدانیدا هەموو شتەکانی هێنایە بوون، ئەواش دەتوانێت وا بکات هەموو شتێك بێنێتە بوون. بێگومان ڕەنگە هەندێك لەم خەملاندنانەی خەڵکی هیرمۆپۆلیس هەندێك ڕەگەزی هاوشێوەی تێدا بێت لەگەڵ لۆگۆسی یۆنانی: ئاخافتن و، عەقڵ و، خواوەندێکی ئافرێدەکار، لەگەڵ صۆفیا ـ حیکمەتی بەهودەکانی ئەسکەندەرییە. خۆ ڕەنگە کاهینەکانی تەحووت، پێش لەدایکبوونی مەسیح لەم خاڵەدا، کەوتبنە ژێر کاریگەری هزری یۆنانی، بەڵام ناتوانین لەوە دڵنیابین".

ـڕخستنەوە، کۆکردنـەوە، نووسـین ـــ نـەوەکو mnene واتـا یـادەوەری زانـاو ـیندوو.

دواتر لەنێو میتۆلۆژیا ئۆزیریسییەکاندا دەبیـنین، تـەحووت دەبێتـە نووسـەری ـۆزیریس و ژمێریاری ئەم، هەر ئەویشە، کە نابێت لەبیرمان بچێت، ئەو کاتە وەکـو ـرایـەکی ئـەم تەماشـاکراوە. تـەحووت وا نمایشـکراوە وەکـو ئـەوەی نموونـەی ـووسەرانەو، پێشڕەوایەتییان دەکـات و سـەرۆکیانە، ئـەم نووسـەرانەی کـە ئێمـە ـەزانین لەنێو دیوانەکانی فیرعەوندا چ پێگەو پایەیەکی گرنگیان هـەبووە:" ئەگـەر خواوەندی خۆر گەورەی گەردوون بێت، ئەوە تەحووت فەرمانبەری یەکەمی ئـەوە، وەزیری ئەوەو، لەنێو بەلەمەکەیـدا لەتەنیشـتی دەوەسـتێت تـاوەکو ڕاپۆرتـەکانی خۆی پێشکەشبکات".

ئـەم "گـەورەی کتێبانـە"، لەمیانـەی نووسـینەوەی کتێبیشـدا، لەمیانـەی تۆمارکردنیـان و، پاراسـتنیان و، هـەڵگرتنیان و، بـاش ڕاگرتنـی کۆگـای نووسـراوەکاندا، ئـەو دەبێتـە "خواوەنـدی قسـە خواییـەکان". هاوسەرەکەشـی هەروەها ناوی دەنووسرێت، سیشات، کە بێگومان بەمانای: ئەو ـ ئافرەتەیە کە ـــ دەنووسێت. ئەمیش کە "خـانمی کتێبخانەکانـە"، دێـت قارەمـانێتی و پاڵـەوانێتی پاشـاکان تۆمـار دەکـات. مـادام خواوەنـدە بەراییـەکان توانـای نەخشـاندن و هەڵکۆڵینیان هـەبووە، ئـەوە ئـەمیش دێـت وەکـو خانمێـك نـاوی پاشـاکان لەسـەر درەختێك لەنێو پەرستگای "هیلیۆپۆلیس ـ عەین شەمس" تۆمار دەکات.

لەکاتێکدا تەحووت ژمارەی ساڵەکان لەسەر دار عەسایەك تۆمار دەکـات. ئێمـە دیمەنی بەپاشابوونیش دەبینین کە لەنێو هەندێك نەخش و نیگـاری بەرچـاوی نێـو

زۆر لەپەرستگاکاندا بوونی هەیە: دەبینین پاشا لەژێر سێبەرێك دانیشتووە لەکاتێکدا تەحووت و سیشات ناوی لەسەر گەڵاکانی درەختێکی پیرۆز تۆمار دەکەن و دەنووسنەوە. هەروەها ئێمە دیمەنی دادگاییکردنی مردووەکانیش دەزانین: لەنێو جەهەننەم و، لەبەردەم ئۆزیریسدا، تەحووت دێت کێشی دڵ ـ ڕوحی مردووان تۆمار دەکات.[١]

---

١) لەنێو میتۆلۆژیای ئۆزیریسدا تووت نووسەرو ژمێریاری ئۆزیریسە، لێرەدا تووت وەکو برایەکی ئۆزیریس پێشکەشکراوە، نموونەی نووسەری چالاکی و پێشڕەوانەیە. نووسەرانیش لەو سەر دەمەدا شوێن و پێگەو پلەی بەرزیان هەبووە لەنێو دیوانی فیرعەونەکاندا. توت نووسینی داهێناو مەرگیشی داهێنا، یا بوو بە بەشێك لەمەرگ، لێرەدا نووسین وەکو مردن و ئاخافتنیش وەکو ژیان تێیان دەڕوانێت، چونکە تووت دەبێتە بەرپرسی جیهانی ژێر زەمینی، واتا بەرپرسی جەهەننەم و مەرگ، ئازاری ڕۆحی مردووان دەدات، لەکاتێکدا ئۆزیریس توانای ئەوەی هەیە وەکو ئامون ڕاع ژیانێکی تازەیان پێ ببەخشێتەوەو ئازادیان بکات لەدەست مەرگ و ئازاری تووت دەربازیان بکات. خواوەندی ئاخافتن دێت مرۆڤ ئازاد دەکات، خواوەندی نووسینیش مەرگیان بۆ دێنێت و، لەنێو جیهانی ژێر زەمیندا ئازاریان دەدات، ئەوە سەرەتای وێناکردنی خواوەندی نووسینە وەکو کەسایەتییەکی مەرگ بەخش، دەشێت لەژێر کاریگەری ئەو کەسایەتییە میتۆلۆژییەدا. دواتر ئەم بۆچوونە لەبارەی نووسین و خواوەندی نووسین، بڵاو بووبێتەوەو گەشەی کردبێت. دواتر لەنێو میتۆلۆژیاکانی تریشدا، تووت سەرپەرشتیاری کۆڕی مەرگ و مردن بووە، ئەو گەورەی نووسین و ژمارەو حیسابە، بەتەنیا ڕۆحی مردووان ناکێشێت تاوەکو تۆماریان بکات، بەڵکو بەر لەوکاتەش ئەو هاتووە ژمارەی ساڵەکانی ژیانیانی نووسیوەو، دیاریکردووە کەی ڕۆژی مەرگە، ئەوە ڕۆژی مەرگی هەر کەسێك دیاری دەکات و خواوەندی مەرگە. هەر بەوەندەش ناوەستێت کە مەرگی مرۆڤ دیاری بکات، بەڵکو مەرگی خواوەندەکانی تریش بەدەستی ئەوەوەیە، ئەوە دەبێتە مردوو شۆڕو ڕێکخەری ناشتنی مردووەکان. (وەرگێڕی کوردی)

چـونکە خواوەنـدی کتێـب، خـۆی بەشـێوەیەکی ڕاسـتەوخو هـەر خواوەنـدی مـەرگە.[١]

١) دریدا وەکو دابو نەریتی هـزری خـۆی، هـەر بەوەنـدە ناوەسـتێت ئیشـکالییەتی داهێنـانی نووسین ڕۆشن بکاتەوە، ئـەو دێـت ڕۆدەچـێتە نێـو میتۆلۆژیـای میسـری کـۆن و، بـەدوای شوناسی تووتدا دەگەڕێت، بەڵام ئایا توت شوناسێکی دیاریکراوی هەیە، وەکو ئـەوەی تـا ئێستا ئێمە خستوومانەتە ڕوو؟ یا کەسایەتییەکی ئەفسـانەیی‌و، میتۆلـۆژی زۆر ئـاڵۆزەو، ئەسـتەمە بـەو شـێوەیە دەسـگیر بکرێـت کـە ئێمـە دەمانـەوێت؟ ئـەوە پرسـیارێکەو، پرسیارێکی تریش ئەوەیە ئایا تـووت کاتێك لەبـەردەم ڕاع دا بێـدەنگ دەبێـت و، پـڕۆژە مەعریفییەکەی شکست دێنێت، بـەنیازە دواتـر چـی بکـات، یـا دەشـێت بپرسـین چیکرد؟ شارەزایان لەمیتۆلۆژیای میسری کۆن دەزانن ئەو میتۆلۆژیایانە بەسەر چـەند سـەردەم و، زەمـەنێکی جیـاواز دابـەش دەبێـت، لەهـەر سـەردەم و، زەمەنێکـدا، بەشـێوەیەك کەسایەتییەکان ڕێکدەخرێن کە بتوانن ئەو فرمانە جێبەجێ بکەن کە پێیان درابـوو، بـەڵام ئەوەی جێگـای تێبینـی زۆر گەورەیـەو، دریـدا دیـاری دەکـات، ئەوەیـە کـە ڕەنگـە تـووت ئاڵۆزترین کەسایەتی بێت لەنێو سەرجەم سەردەم و زەمەنە میتۆلۆژییەکانـداو، بـەردەوام شوێنگەو پلەو پایەی لەگۆڕاندایە.

لێرەدا بێگومان ناتوانین یەکە بەیەکەی میتۆلۆژیاکـان نمـایش بکـەین، ئـەوەی حـەزیش بکـات دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ ئەو هەموو سەرچاوەو کتێبانەی لەسەر میتۆلۆژیای میسری کۆندا نووسراونەتەوە، بەڵام ئێمـە بـەپێی پێویسـت ئاسـت و پلـەو پایـەی گۆڕانـە ئیدارییـەکانی تووت دەخەینە ڕوو، تاوەکو بتوانین بـەپێی تێگەیشـتنی خۆمـان شوناسـێکی بـۆ دروسـت بکەین. ئـەو بۆخـۆی کـوڕی خواوەنـدە، سـیفەتی مـانگی هەیـە، توانـای ئـەوەی پێـدراوە تەئویلکـەری قسـەکانی بـاوکی بێـت، کەواتـە نووسـین بەشـێوەیەك لەشـێوەکان لـەخودی تووتـدا بەرجەسـتە دەبێـت، چـونکە ئـەو جێگـری دەسـەڵاتی ئاخافتنـە کـە ڕاع ە. زۆر سروشتییە کاتێك ڕاع بۆ گەشتەکانی دەچێت، تووت لەشوێنی ئەودا حـوکم بەسـەر وڵاتـدا دەکـات و، هـەموو دەسـەڵاتەکانی بـاوکی دەگرێتـە دەسـت، واتـا دەسـەڵاتی زیـادەی پێـدەدرێت. دەسـەڵاتێك هـی خـۆی نییـە، بـەڵکو پاشـبەندو زیادەیـە پێـی دراوە تـاوەکو

ئـەوەشمان بـیر نەچـێت کـە لـەنێو دیـالۆگی فیـدرۆس، ڕەخنـە لـەداهێنان
فارمـاکۆن دەگیرێـت، لەبەرئـەوەی نووسـین دەخاتـە شـوێنی قسـەی زینـدوو و
بانگەشەی ئەوە دەکات کە دەسبەرداری باوك دەبێت، ئـەو باوکـەی کـە زینـدووم
ژیانی پێ بەخشیوە، واتا لۆگۆس. هەروەها نەداره لەئاست بەرسڤی خـودی خـۆی

---

پراکسیسـان بکـات، لێـرەدا دیسـان ئێمـە دەچـینەوە نێـو وازی زیـادەو پاشـبەندکاری لەبنەچەدا، تووت خواوەندی نووسینە، ئەو کەسەیە نووسـینی هیرۆگلیفـی میسـری کـۆنی داهێنـاوەو، یـادەوەری و مێشـکی مـرۆڤ تۆمـار دەکـات، تـاوەکو ون نـەبن. لـەنێو میتۆلۆژیایەکی تردا هاتووە دەگوترێت:" ئەگەر خواوەندی خۆر گـەورەی گـەردوون بێـت ئـەوە تـووت یەکـەم فەرمانبـەری ئـەوە، وەزیریـەتی، بـەردەوام لەسـەر بەلەمەکـەی ئـەو لەتەنیشتییەوە دەوەستێت بۆ ئەوەی ڕاپۆرتەکانی خۆی پێشکەش بکـات". لێـرەدا تـووت بۆتە گەورەی نووسەران، سەرنووسەرو بەڕێوەبەری نووسینی دیوانە، کـاتێکیش شـتەکان دەنووسـێتەوەو تۆماریـان دەکـات و هەڵیانـدەگرێت، ئـەوە دەبێتـە گـەورە قسـەکەرو وتەبێـژی فیرعـەون و، ئـامون ڕاعـی خواوەنـد. لەهەنـدێك شـوێنی تـردا، دەبیـنین تـووت حیسابی ساڵەکان تۆمـار دەکـات، ئـەو ڕۆژژمێـری داهێنـاوەو، ڕۆژەکـان تۆمـار دەکـات و ڕێکیان دەخات، بەپێی ئەم ڕۆژژمێرەی تووت، هەموو مانگەکان بریتـی بـوون لەسـی ڕۆژ. لەهەندێك شوێنی تراو لەکاتی ئـەوەی مردووەکـان لـەڕۆژی قیامەتـدا حیسـابیان لەگەڵدا دەکرێت، تووت لەبەردەم ئۆزیریسدا وەستاوەو کێشی ڕۆح و دڵی مردووان دەکات و کـاری باش و خراپیان دەپێوێت، تـاوەکو ئـوزیریس بتوانێـت حوکمیـان بەسـەردا بـدات. لێـرەدا شوێنەکان گۆڕان، تووت خواوەندی نووسـین، دەبێتـە ئـەو کەسـەی ڕۆحـی مـردوان کـێش دەکات، ڕاستەوخۆ دەگۆڕێـت و دەبێتـە خواوەنـدی مـەرگ و مـردن، کەواتـە مەسـەلەکان ئاڵۆز دەبن و شوناسی تووتیش ون دەبێت و دەبێتە خواوەندی مەرگ، ئەوەش وا دەکات لەنێو دیـالۆگی فیدرۆسـدا ڕەخنـەی ئـەوە لـەفارماکۆن بگیرێـت کـە مـەرگ لەگـەڵ خۆیـدا دێنێت. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم بابەتە، خوێنەر دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ کتێبـەکانی ترمـان لـەبارەی هەڵوەشـاندنەوەو جـاك دریـدا، بەتایبـەتیش کتێبـی (جـاك دریـداو هەڵوەشاندنەوە). (وەرگێڕی کوردی)

وەکو چۆن پەیکەر، یا وێنە نەدارەو ... تاد. لەنێو هەموو زنجیرەکانی میتۆلۆژیای میسریدا، تەحووت سەرپەرشتی ڕێکخستنی کاروباری مردووان دەکات. سەرۆکی نووسین و ژمارەو حیساب، هەر بەتەنیا ڕوحە مردووەکان کێش ناکات، بەڵکو پێش ئەو کاتە، حیسابی ڕۆژگارەکانی ژیانیشیانی کردووە، ژمارەو مێژووی پێدلون. تەنانەت ئەو حیسابی ڕووداوەکانی نێو ژیانی خواوەندەکانیش دەکات و دەمزانێت. هەر ئەوە کە حیسابی بەردەوامی و درێژەپێدانی ژیانی خواوەندو مرۆڤەکان دەکات. وەکو سەرپەرشتیاری کۆڕی پرسەی ئەمانیش ڕەفتار دەکات، هەر ئەویش ئەرکی ئەوەی پێ سپێردراوە مردووەکان بشوات و کفنیان بکات پێش ئەوەی لەخاك بنرێن.

هەندێکجار، مردوو شوێنی نووسەر دەگرێتەوە، لەنێو پانتایی دیمەنێکی ئاوادا شوێنی ئەو مردووە بۆ تەحووت دەگەڕێتەوە. دەتوانین لەسەر ئەهرامەکان ئەو چیرۆکە ئاسمانییەی مردوویێك بخوێنینەوە:" گایەکی گەورە بەقۆچەکانی هەڕەشەی لێ دەکات و لێی دەپرسێت: ئەوە بۆ کوێ دەچیت؟ ـــ لێرەدا دەبێت ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە ناوێکی تری تەحووتی ئەکتەری بەتوانای شەوانەی ڕاع بریتییە لە (گای نێو ئەستێرەکان) ـــ ئەویش وەڵامی دەداتەوە: ئەو دەچێتە ئاسمانی پڕ لەوزەی زیندوو تاوەکو باوکی خۆی ببینێت و لەڕاع ڕابمێنێت، بۆیە ئەو بوونەوەرە ترسناکە ڕێگای پێدەدات تێپەڕێت".

کتێبی مردووان کە لەتەنیشت تەرمی مردووەکان دەخرایە نێو گۆڕ، زۆر شێوازو بۆچوونی وای لەخۆ دەگرت کە گریمان وابوو بۆ ئەوە دانراون، تاوەکو دواتر ئەم مردووە بتوانێت بەرگەی بەر ڕووناکی بگرێت و، بتوانێت خۆر ببینێت. پێویستە

مردوو خۆر ـ ڕۆشنایی ببینێت، مەرگیش یەکێکە لەمەرجەکانی ئەو ڕوو بە بوونەوەیەو دەبێت تاقی بکاتەوە. ئەوەش پاڵمان پێوە دەنێت بیر لەدیالۆگ فیدۆن بکەینەوە. خواوەند لەنێو بەلەمەکەی خۆیدا پێشوازی لێ دەکات و" وا دەدات کە خواوەند نووسەری تایبەتی ئاسمانی خۆی بەلاوە بنێت و، ئەم مردوو بخاتە شوێنی، ئەم مردووەش دەچێت حوکم دەکات و دەبێتە ناوبژیوان و فرما بەسەر ئەوانەشدا دەکات کە لەئەویش گەورەترو مەزنترن". بۆیە دەبینین لە حاڵەتانەدا، مردوو زۆر بەئاسانی لەگەڵ تەحووتدا تەماهی دەبێت و "ئەویش بەسادەیی وەکو خواوەند ناودەبرێت، ئەو تەحووتە، بەهێزترینە لەنێوا خواوەندەکاندا".(١)

بەرانبەردانانی پلەو پایەی نێوان باوك و کوڕ، خەڵك و پاشا، مەرگ و ژیان نووسین و ئاخافتن، .. تاد، تەواوکردنی هەمان ئەو سیستەمەی بەرانبەری شەو

---

١) ئەو هەمو وازیيە شوێنگەيیەی تووت، وا دەکات ئەستەم بێت شوناسێك بەو بوونەوەرە بەخشرێت، ئەستەمە تايبەتمەنديیەکانی دياری بکرێت، ئەو بەردەوام لەشوێنگە گۆڕيندايە، بەردەوام پلەو پايەکانی دەگۆڕێت، بەردەوام فۆڕمی خۆی دەگۆڕێت، بەردەوام دژايەتی جەوهەری ڕۆحی خۆيشی دەکات، کەسێکە بەشوێنگەيەك، فۆڕمێك ڕازی نابێت، ڕۆحێکی بزۆزەو ناوەستێت، لەچرکەساتێکدا سەدو هەشتا پلە دەگۆڕێت و، دەبێتەوە دژکاری خۆی. ئەو ئالۆزيیەی کەسايەتی تووت، دريدا دووچاری سەر سوڕمان دەکات، بۆيە دەگاتە ئەو بڕوايەی بوونەوەرێکی بێ شوناسە، ئەگەر شوناسێکيش هەبێت ئەوە بريتييە لەيەکێتی دژەکان و ململانێی دژکارەکان لەنێو خودی خۆيدا. بەم شێوەيە تووت خۆی لەهەمووان جيادەکاتەوە، دەمێك هاوشێوەيە، دەمێکيش دژکارو پێچەوانە، دەمێك تەريب و پەڕەلێلە، دەمێکيش يەکتربڕو دابەشکارە. خواوەندی نووسين بۆخۆی باوك و خواوەندەو، بۆخۆيشی کوڕێکی ملکەچە، ئەو باوکەيە بەکوڕايەتی خۆی ڕازی نييەو، دەست دەداتە پيلان داڕشتن و کودەتای هزری. (وەرگێڕی کوردی)

ڕۆژ، خۆرهەڵات و خۆرئاوا، خۆرو مانگە. تـەحووت، نوێنـەری بـەتوانای شـەوانەی بوو، گای نێو ئەستێرەکان، ڕووی کردە لای خۆرئـاوا. ئـەو خواوەنـدی مانگـە، یـا کاتێك تەماهی دەبێت لەگەڵی، یانیش کاتێك دەیپارێزێت.

سەمتی ڕێکخستن و دانانی ئەم سیفەتانە بەرەو لۆژیکێکی ڕەسەن پاڵ دەنێت: وێنـەی تـەحووت لـەدژی ئـەویتری خـۆی دادەنێـت (بـاوك، خـۆر، ژیـان، ئاخـافتن، ئەسڵ، خۆرهەڵات، ... تاد)، بەڵام بەجۆرێك کە بتوانێت جێگۆڕکێ بکات و جێگای ئـــەو بگرێتـــەوە. لەمیانـــەی ئەنجامـــدانی کـــردەی دووبـــارە بوونـــەوە، یـــا نوێنەرایەتیکردنەوە، زیاد دەبێـت و دژکـار دەبێـت و شـوێنگەی خـۆی دەگۆڕێـت. لەنێو هەمان ئەو بزاڤەدا شـێوەیەك وەردەگرێـت و، شـێوەیەکی تـر پیشـاندەدات، تاوەکو بتوانێت بەرانبەر بەخود بووەستێت، لەهەمان کاتیشدا بتوانێت شوێنیشـی بگرێتەوە. لەو چرکەساتەوە لەگەڵ خۆیدا دەکەوێتـە دژکـاری، دەبێتـە ناحـەزو دژ بەخۆی، بۆیە ئەو خواوەندە ـ پەیامبەرە، بەڕاستی خواوەندی پەڕینەوەی ڕەهایە لەنێوان دژکارەکاندا. خۆ ئەگەر ناسنامەیەکی هەبێت ـ بەڵام ئەو لـەنێو هەموانـدا بەتایبـەتی، خواوەنـدی بـێ ناسـنامەیە، تاکـە ناسـنامەی ئـەو بریتییـە لەیـەکێتی دژەکـان ــ coincidentia oppositorum ــ ئـەوەی کـە دەبێـت بـەم زووانـە بگەڕێینەوە لای.

تـەحووت کـە جیـاوازە لەئـەویتر، ئـەویش هـەمان لاسـایی دەکاتـەوەو دەبێتـە مارکـەو نماینـدەی، ملکەچـی بـۆ دەکـات و خـۆی وەکـو ئـەو نمـایش دەکـات و، دەنوێنێت و، نوێنەرایەتی دەکات. تەنانـەت ئەگـەر پێویسـت بێـت، تووندوتیـژیش بـەکاردێنێت بـۆ ئـەو کـارە. کەواتـە ئـەو، بـاوکێکی تـرە، ئـەو بریتییـە لـەباوك و

نوێنەرایەتی برازی تێکدەر. بۆیە، خواوەندی نووسین لەیەک کاتدا باوک و کوڕ خودی خۆیەتی. ڕێگا نادات لەنێو گەمەی جیاوازیدا، هیچ شوێنگەیەکی دیاریکراوی بۆ دیاری بکرێت. کەسێکی فێڵبازە، ئەستەمە دەسگیر بکرێت دەمامکدارە، ساختەچییە، وەکو هێرمس نە پاشایەو نە خزمەتکارە، بەڵکو جۆرێکی ترە لەو کاغەزانەی بردنەوە مسۆگەر دەکەن،[1] دالێکی ئامادەیە. کاغەزێکی بێلایەنە، گەمەی زیاتر بەگەمە دەبەخشێت.

ئەو خواوەندی زیندووکردنەوەیە، زۆر گرنگی بەمانای ژیان و مردن نادات تەنیا بەو ڕادەیە نەبێت کە دووبارەکردنەوەی ژیان لەلای ئەو، وەکو دووبارەکردنەوەی مەرگ وایە، بەوشیاری ژیان و دەسپێکردنەوەی مەرگ. ئەوە مانای ئەو ژمارانەیە کە ئەو دایهێناون و خاوەنداریێتیان دەکات. تەحووت هەموو شتێك لەنێو زیاترکردنی زیادەدا دووبارە دەکاتەوە: ئەو خۆی ئەلتەناتیڤی خۆرە، شتێکی تر جگە لەخۆرو هەمان خۆریش، شتێکی تر جگە لەخێرو هەمان خێریش، ... تاد. بەردەوام شوێنێك داگیر دەکات کە شوێنی خۆی نییە، شوێنێك دەشێت ناوی بنێین شوێنی مەرگ، ئەو خاوەنی شوێن و ناوی تایبەت نییە. تایبەتمەندی ئەم بریتییە لەنا تایبەتمەندی، نا دیاریکراوو نا دەستنیشانکراو کە بەردەوام وا دەکات بشێت جێگۆڕکێ و جێگرتنەوەو گەمە (قومار) مومکین بێت. گەمە، یا قومار، کە خۆی دروستیکردووەو دایهێناوە، وەکو ئەوەی ئەفلاتون بیرمان دەخاتەوە. ئێمە قەرزاری ئەوین کە زار ـ kubeia ـ ی داهێناوە، ئێمە قەرزاری ئەوین کە کاغەزی قومار ـ petteia ـ ی داهێناوە. دەیتوانی برازی ناوەڕاست

---

[1] مەبەست وەرەقەی جۆکەرە لەنێو یاری قوماردا.

ـێکبێنێت لـەنێو دیالیکتیـك، ئـەوە ئەگـەر لاساییشـی نەکاتـەوە، لـەڕێگای ئـەم
ـوليزمە گاڵتەیەشەوە، دەیتوانی بەبێ کۆتـایی لـەنێو کۆتاییەکدا تـەواو بێـت، یـا
ـبێتە جۆرێك لەپۆست ـ وەکـو پۆسـت مـۆدێرن. هـەرگیز تـەحووت ئامـادە نییـە.
ـەکو کەسایەتی خـۆی، لـەهیچ شـوێنێك ئامـادەیی نییـە. بەتایبـەتی لێـرەدا هـیچ
کەینوونەیەکی نییە تاوەکو بۆی بگەڕێتەوە.[١]

١) خواوەندی نووسین ڕێگانادات لەنێو وازی جیاوازیدا، شوێنگەیەکی دیاریکراوی پێ بـدرێت، کەسـێکە فێڵبـازەو دەسـگیر ناکرێـت، ماسـکدارو پیلانگێـرو چاوچـنۆکە، گەرەکیـەتی دەسەلاتی نووسین بخاتە شوێنگەی دەسەلاتی ئاخافتن. ئەم نە پاشایەو نە کۆیلە، بـەڵکو لەلای جاك دریدا جۆکەری نێو گەمەی قومارە، دالێکی ئامادەکراوە، کاغـەزێکی بێلایەنـەو وازی زیاتر بەوازی دەبەخشێت. مردن چییە ئەگـەر پاشـبەندو زیادەیـەکی ژیـان نـەبێت؟ مردن دووبارە بوونەوەی ژیانە بەلام بەشێوەیەکی تر. ئـەم لەکاتێکدا خواوەنـدی مـردن و مەرگە، ئەوە لەهەمان کاتیشدا خواوەندی کۆتـایی هێنانـە بـەژیان، بۆیـە ئەگـەر ئاخـافتن ژیان بێت، ئەوە نووسین مردن و مەرگە. سەرهەڵدانی مەرگ واتـا کۆتـایی هێنـان بـەژیان، مەرگ چۆن پاشبەندی ژیانە، ئاوا ژیانیش پاشبەندی مەرگە، چـونکە ئەگـەر ژیـان خـەیاڵ بێت، دیارە مردن واقیعە، لەولاشەوە لەنێو ژیاندا ئەگەر مـردن خـەیاڵ بێـت، ئـەوە دیـارە ژیان واقیعە. تووت بەردەوام شـوێنگەیەك داگیر دەکـات شـوێنگەی خـۆی نییـە، دەسـتی بەسـەردا گرتـووە، ڕۆحێکـی بـزۆزو نـاجێگیرە، بـەردەوام لەکۆچـکردنی شـوێنگەییدایە، خـاوەنی شـوێنێکی تایبـەت نییـە، تاکـە تایبەتمەنـدی، نـا تایبەتمەنـدە. تاکـە دەستنیشانکردنی دەستنیشان نەکراوە. بەردەوام لەشـوێنگە گۆڕیندایـە، ئـەوە تـووت ـــ نووسـین ـــ فارمـاکۆن ـــ ە کـەوا دەکـات جێگـۆڕکێی دەلالی و وازی مـومکین بێـت، ئـەو جێگۆڕکێیەیە وازی مومکین دەکات، هەر ئەوە کاغەزی وازی قوماری داهێناوە، بۆخۆیشی ڕۆڵـی جۆکـەری تێـدا دەگێڕێـت، جۆکـەر چییە؟ کەسـایەتییەکی نادیـارو خـاوەن هێـزە، هەرکاتێك دەردەکەوێت، وازییەکە گەرمترو خۆشتر دەکات، ئەو دەتوانێت کۆتایی بـەوازی بێنێت، هەر ئەویشـە دەتوانێـت وازییەکـە درێـژ بکاتـەوە. تـووت هـەر خـۆی بـەردی زاری داهێناوە، ئێمە فرێیدەدەین بۆ ئـەوەی وازی بکـەین، ئـەوە ژمارەکـانی سـەر زاری دیـاری

هەموو کارەکانی ئەم جۆرە دوالیزمییەتە لەخۆ دەگرێت، جۆرێك لەهاوسەنگی کە جێگیر نییە. ئەو خواوەندەی خاوەنی حیساب و، ژمارەو، زانستی عەقڵییە دێت زانستەکانی وەکو سیحرو فالگرتنەوەو جادووکەری و کیمیاش ئاراستە دەکات. ئەوە خواوەندی شێوازە سیحرییەکانە دەبێتە هۆی هێمن کردنەوەی دەریا، خواوەندی چیرۆکە نهێنییەکان و دەقە شاراوەکانە: نموونەیەکی پێشووترو ئەسڵی هێرمسە، خواوەندی نووسینی ڕەمزدار، نەوەکو هەر تەنیا خەت و نووسین.

زانست و سیحر بەیەکەوە، پردێك لەنێوان ژیان و مەرگ پێکدێنن، زیادەیەك بۆ ئازارو کەمبوونەوە: بێگومان دیارە کە بواری پزیشکی جێگای سەرنجڕاکێشانی تەحووت بووە. لەوێدا هەموو تواناکانی خۆی تاقیکردۆتەوەو، دەرفەتی کاری هەبووە. خواوەندی نووسین کە دەزانێت کۆتایی بەژیان بێنێت، دەتوانێت نەخۆشیش چارەسەر بکات، بگرە دەتوانێت مردووەکانیش ڕزگار بکات.[1] ئەو پاشماوە قورپینییانەی دۆزراونەتەوە، حۆرس وا نمایش دەکەن کە لەسەر پشتی

---

کردووەو، وازییەکەش گەرمتر دەکات. ئەوە لەنێو کاغەزی قوماردایە، لەنێو بەردی زاردایە، لەنێو ژمارەکانی حیساب و ماتماتیکدایە. شتێکە ئیحتیوا ناکرێت و، هەرگیز لەهیچ شوێنێکیشدا ئامادە نییە، هەرگیز کەسایەتی خۆی دەرناکەوێت، بەردەوام دەلالەتی خوازە وەردەگرێت، هەموو کردەوەو کارەکانی بەو شێوەیە دوو لایەنەیە. (وەرگێڕی کوردی)

[1]) فیستۆگیر زۆر دەقی لەنێو میتۆلۆژیاکان لەبارەی تەحووت کۆکردۆتەوە، لەشوێنێکدا لەنێو میتۆلۆژیا کۆنەکانی میسردا، کە لێرە لەلای ئێمە گرنگە، ئاوا دەسپێدەکات: دوعایەکە لەبەردەم خۆردا دەگووترێتەوە: من تەحووتم، داهێنەری پیت و شەرابی خۆشەویستیم".

ـیمساح دانیشتووە، چۆن پاشای خواوەندەکان تەحووت دەنێرێت تاوەکو ـدرسیسیس چارەسەر بکات کە مارێك لەنا ئامادەگی دایکیدا پێوەی دابوو.[1]

---

[1]) نووسینی ڕەمزدارو پزیشکی سیحری و وێنەی مار زۆر بەسەیری لەنێو چیرۆکە میللییەکاندا تێکەڵاوو ئاوێتەن، گاستۆن ماسبیرۆ لەنێو چیرۆکە میللییەکانی کۆنی میسر زۆری لەبارەیانەوە کۆکردوونەتەوە. ئەوە چیرۆکی سەرکێشی ساتنی ــ خامواسە لەگەڵ مۆمیاکان. ساتنی ـ خامواس کوڕی پاشایە، کاتی خۆی لەخوێندنەوەی ئەو نووسینانە بەسەر دەبات کە لەنێو مەمفیسی پایتەختدا نووسراونەتەوەو لەم شارەدا کتێبە پیرۆزەکان دەخوێنێتەوە. ڕۆژێك لەڕۆژان یەکێك لەبنەماڵەی پاشایەتی گاڵتەی پێدەکات، ئەمیش لێی دەپرسێت: بۆ پێم پێدەکەنیت و گاڵتەم پێدەکەیت؟ ئەمیش وەڵامی دەداتەوە:"من بەتۆ پێناکەنم، بەڵام ناتوانم دان بەخۆمدا بگرم کاتێك دەبینم تۆ پەنا بۆ خوێندنەوەی هەندێك کتێب دەبەیت کە هیچ دەسەڵاتێکیان نییە؟! ئەگەر بەڕاستی دەتەوێت دەقێکی سەرکەوتوو بخوێنیتەوە، لەگەڵم وەرە، دەتبەمە شوێنێك ئەو کتێبەی تێدایە کە تەحووت بەدەستی خۆی نووسیویەتییەوەو بەخوێندنەوەی ئەم کتێبە دەگەیتە پێگەیەك کە ڕاستەوخۆ نزیکی لەپێگەی خواوەندەکان. ئەگەر تۆ توانیت یەکەم دوو بەرگی ئەم کتێبە بخوێنیتەوە، ئەوە دەتوانی سیحر لەئاسمان و، زەوی و، جیهانی شەوو، شاخەکان و، ئاوەکان بکەیت. دەتوانیت لەقسەی باڵندەکانی ئاسمان و خشۆکەکان تێبگەیت مادام زیندوون، دەتوانیت ماسییەکانی ناو دەریا ببینیت، چونکە هێزێکی خواییانە وا دەکات بەرز ببنەوەو بێنە سەرئاو بۆت. ئەگەر بەرگی دووەمت خوێندەوە، تەنانەت ئەگەر لەنێو گۆڕیش بوویت، دەبیتەوە خاوەنی هەمان شێوەو ڕوخسار کە لەسەر زەوی هەتبوو، بگرە دەتوانی خۆریش ببینیت کاتێك لەئاسمانەوە هەڵدێت و خوولی ڕۆژانەی خۆی تەواو دەکات، دەتوانیت مانگ بەپڕی خۆی ببینیت کاتێك دەردەکەوێت". ئینجا ساتنی گووتی:" بەڕاستی؟ پێم بڵێ مەبەستت چییەو پێتی دەدەم، تەنیا ببمە بۆ ئەم شوێنەی کە ئەم کتێبەی تێدایە. پیاوەکەش بەساتنی گووت: ئەم کتێبە هی من نییە. ئەم کتێبە دەکەوێتە ناوەڕاستی گۆڕستانێك، لەنێو گۆڕی نینۆفەر گیبتاح، کوڕی پاشا گیبتاح دایە. وریابە ئەم کتێبە نەبەیت، چونکە وات لێ دەکات ناچاربیت بۆی ببەیتەوەو

گۆپاڵێکی دڕکاویت بەدەستەوەبێت و پشکۆی ئاگرێکیش لەسەر سەرت بسووتێت لەئەوپەڕی گۆڕستانەکەدا ڕۆشنایی لەم کتێبە هەڵدەستاو وێنەی پاشاو بنەماڵەکەی ڕەنگیدەدایەوە لێی. "بەپێی کتێبی تەحووت" ... ئەم حاڵەتە هەمیشە دووبارە دەبۆوە نینۆفەر گیبتاح خۆی ئەم چیرۆکەی ساتنی ژیا بوو. کاهینێك پێی گوتبوو:" ئەم کتێبەی بەدوایدا دەگەڕێیت، لەنێو قووڵایی دەریای قیبتدایە. ئەم کتێبە خراوەتە نێو سندوقێکی ئاسن، سندوقە ئاسنەکەش خراوەتە نێو سندوقێکی برۆنزی، سندوقە برۆنزییەکەش خراوەتە نێو سندوقێکی دار، سندوقە دارەکەش خراوەتە نێو سندوقێکی عاج و ئەبەنووس، سندوقە عاج و ئەبەنووسەکەش خراوەتە نێو سندوقێکی زیو، سندوقە زیوەکەش خراوەتە نێو سندوقێکی زێڕ، کتێبەکەش خراوەتە نێو ئەم سندوقە زێڕە".

دیارە لێرەدا ئەم چیرۆکە بەچەند شێوەیەك گێڕدراوەتەوەو چەند دەقێکی جیاوازیشی هەیە، بۆیە لەیەکێك لەدەقەکاندا ئاماژە بۆ ئەوە کراوە کە لەنێو هەر یەکێك لەم سندوقانەدا، (١٢٠٠٠) هەزار مارو دووپشکی جۆراوجۆر هەیە کە هەرگیز نامرن و خۆیان لەسندووقەکان ئاڵاندووە. دوای (٣) جار هەوڵدان، ئەم کوڕە دەتوانێت مارو دووپشکەکان بکوژێت و ئەم کتێبە دەخاتە نێو ئاوی بیرەو دەیتوێنێتەوەو دەیخواتەوە، بەمەش دەبێتە خاوەنی زانستێکی بێکۆتایی. لێرەدا تەحووت لەلای ڕاع سکاڵا دەکات و دەبێتە هۆی توندترین سزا. لێرەدا، پێش ئەوەی ئەم کەسایەتییە میسرییەی تەحووت جێبێڵین، تێبینی ئەوە دەکەین کە لەپاڵ هێرمسی یۆنانیدا زۆر نزیکن لەیەك و هاوشانی کەسایەتی نابۆی کوڕی مەردۆخن، چونکە ئێمە دەبینین نابۆ چۆن شوێنگەو پێگەی مەردۆخ بۆ خۆی دەبات و داگیری دەکات. مەردۆخی باوکی نابۆ، خۆی خاوەنی کەسایەتی خواوەند ــ خۆرە. نابۆ "خاوەنی قەلەم" و "داهێنەری نووسینە" و هەڵگری "تابلۆی چارەنووسی خواوەندەکانە ـ دەفتەری ئەعمال". هەندێکجار نابۆ خۆی بەپێش باوکیشی دەکەوێت و ئامرازە ڕەمزییەکەی باوکی دەخوازێت (ئەلمارۆ ــ کتێبی دۆرم). لەئەنجامی هەڵکۆڵینە ئەرکیۆلۆژییەکانیشدا، قاپێکی فافۆن لەسوس دۆزراوەتەوە کە تێیدا وێنەی مارێك کێشراوە قاپێکی هەڵگرتووە بۆ سرووتی ئایینی، لەسەر ئەم قاپە نووسراوە:" قاپی خواوەند نابۆ". ئەگەر بەدوای ئەم شێوە لێکچوونەدا بڕۆین، دەتوانین زۆر ئاماژە لەسەر هاوشێوەیی نێوان تەحووت و نابۆی ـ Nebo نێو چاخی کۆن بدۆزینەوە.

كەواتە، خواوەندی نووسین، لەهەمان کاتدا خواوەندی پزیشکیشە. پزیشکی، ئەوەی لەیەك کاتدا هەم زانستەو هەمیش دەرمانێکی شاراوەیە. خواوەندی دەرمان و ژەهر.[1] خواوەندی نووسین بریتییە لەخواوەندی فارماکۆن. نووسین وەکو فارماکۆنێك ئەو شتەیە کە فیدرۆس بەترس و لەرزەوە وەکو تەحەدایەك پێشکەشی پاشای دەکات.

---

١) خواوەندەی حیساب و ژمارەو زانستی عەقڵی، هەر بۆخۆیشی فاڵ گرتنەوەو تەنجیم و سیحری داهێناوە. سەیری ئەو موفارەقەکارییە بکەن، زانستی عەقڵی و سیحر چەندە دژ یەکن، ئەوە هەڵوێستی موفارەقەکارانەی تووتە لەنێو میتۆلۆژیاکاندا. ئەم پزیشکی و نووشداری کیمیایی داهێناوە، لەنێو ئەو بوارەدا وزەی خۆی تاقیکردۆتەوە، خواوەندی نووسین و ژمارە کە دەتوانێت ئاستێك بۆ ژیان دابنێت و مەرگ لەگەڵ خۆیدا بێنێت، دێت لەسایەی پزیشکی و نووشداری و سیحرەوە، نەخۆشەکانیش چارەسەر دەکات، لەوەش زیاتر مردووەکانیش سەر لەنوێ دەگێڕێتەوە نێو ژیان. بەو شێوەیە خواوەندی نووسین خواوەندی پزیشکیشە، پزیشکی کە لەیەك کاتدا زانست و سیحرو دەرمانێکی حەشاردراوە، خواوەندی دەرمان و ژەهر، خواوەندی نووسین خواوەندی فارماکۆنە، نووسین وەکو فارماکۆنێك، نووسین وەکو ژەهرێك، نووسین وەکو شتێکی جیا ئەستەمە وەسف بکرێت، وەکو ئەوەی ئەفلاتون لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا بەملکەچی و بەدڵەڕاوکێ وە، وەکو تەحەددایەك پێشکەشی پاشا ــ سوقراتی دەکات. دیسانەوە بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە داوا لەخوێنەر دەکەین بگەڕێتەوە بۆ کتێبی (جاك دریداو هەڵوەشاندنەوە). (وەرگێڕی کوردی)

# بەشی شەشەم

# فارماکۆن

" بۆ ئەم جۆرە ڕیسواییانە، دەبێت یاسادانەر بۆ هەموو حاڵەتێك فارماکۆنێك بدۆزێتەوە. ئەو پەندەی پێشینانیش ڕاستە کە دەڵێت زەحمەتە لەیەك کاتدا بەرانبەر دوو دوژمن شەڕ بکەیت، ئەوەش لەمیانەی نەخۆشی و زۆر کارەساتی تردا دەردەکەوێت".

(دیالۆگی یاساکان

با بگەڕێینەوە بۆ دەقەکەی ئەفلاتون، بەگریمانی ئەوەی پێش کەمێك، بۆ چرکەیەك جێمان هێشتووە. زاراوەی فارماکۆن خراوەتە نێو زنجیرەیەك دەلالەت. بەدەچێت گەمەی ئەو زنجیرەیە، لەنێو سیستەمێکدا ڕێکخرابێت، بەڵام ئەم سیستەمە زۆر بەئاسانی مەبەستەکانی نووسەرێکی ڕێکخستووەو بەسیستەمی کردووە کە ناوی ئەفلاتونە. یەکەم، ئەم سیستەمە لێرەدا مەبەست نییە. جۆرێك لەپێوەندی ڕێکخراوو سیستەماتیك سەرهەڵدەدات بەهۆی ئەو گەمە زمانەوانییە لەنێوان کۆمەڵێك وەزیفەی جیاوازی وشەدا، هەر لەنێو وشەشدا، لەنێوان پاشماوە، یا ناوچەی جیاوازی کولتووری جیاوازدا. ئەم جۆرە بەردەوامبوونانە لەنێو کون و کەلەبەری مانادا، هەندێکجار ئەفلاتون دەتوانێت ڕایانبگەیەنێت و ڕۆشنیان بکات و بەگەمەیەکی "ویستخوازانە" لەگەڵیان بڕوات. کاتێك ئێمە زاراوی ویستخوازی دەخەینە نێو دوو کەوانە، بۆ ئەوەمانە تاوەکو لەنێو چوارچێوەی ئەو دوالیزمییەتانەدا بمێنینەوە ـــ کە تەنیا دەتوانێت دەستنیشانی جۆرێك لە"ملکەچی" بکات بۆ پێداویستییەکانی "زمان" ێکی دیاریکراو.

هیچ یەکێك لەم چەمکانە، ناتوانێت ئەو پێوەندییە دیاری بکات کە ئێمە لێرەدا باسیان لێوە دەکەین. بەهەمان شێوەش، ئەفلاتون دەتوانێت لەحاڵەتی تردا ئەو پێوەندییانە بەدی نەکات، هەروا لەنێو تاریکی و لەبەر سێبەردا بیانهێڵێتەوە، یا بیانبڕێت. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم پێوەندییانە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ

سەرهەڵدەدەن. ئایا بەبێ ویستی ئەم سەرهەڵدەدەن؟ لەسایەی ئەوەوە سەرهەڵدەدەن؟ لەنێو دەقی ئەمدا؟ لەدەرەوەی دەقی ئەمدا؟ ئەگەر لەدەرەوەی دەقدا بن، کەواتە لەکوێ؟ لەنێوان دەق و زماندا؟ لەپێناو چ جۆرە خوێنەرێکدا؟ لەچ چرکەساتێکدا؟ هێدی هێدی بۆمان ڕوون دەبێتەوە وەڵامی ڕیشەیی و گشتگیری ئەم جۆرە پرسیارانە ئەستەمە، ئەوەش پاڵمان پێوە دەنێت بگەینە ئەو بڕوایەی هەڵەیەك هەیە لەخودی پرسیارەکاندا، لەهەر یەکێك لەچەمکەکانی، هەر یەکێك لەو دوالیزمییەتانەی کە بەم شێوەیەن.

بەردەوام دەتوانین بیر لەوە بکەینەوە ئەگەر ئەفلاتون هەندێك ڕێگای بگرتبووایە بەر، تەنانەت هەندێك ڕێگاشی ببڕیبووایە، بەڵام ئەم بینیویەتی و لەنێو چوارچێوەی ئەم شتانەدا جێی هێشتووە کە ئەستەمە بگیرێنەبەر دارشتنێك، کە مومکین نابێت، تەنیا بەخۆلادان نەبێت لەگێڕانەوەی هەموو جیاوازییەك لەنێوان وشیاری و نا وشیاریدا ـ یا نەست ـ لەنێوان ویستخوزای و نەویست، جیاکارییەك کە ئامرازێکی زۆر گەمژانەیە کاتێك مەسەلەکە پێوەندی بەچارەسەرکردنی زمانەوە هەبێت. هەمان شتیش لەبارەی دوالیزمییەتی نێوان ئاخافتن ـ یا نووسین ـ لەگەڵ زماندا هەر ڕاستە، ئەگەر ئەو دوالیزمییەتە، وەکو ئەوەی زۆرجار وای لێ دێت، بگوڕدرێت بۆ ئەو جۆرە گوتەزایانە.

هەر تەنیا ئەو پاڵنەرە خۆی، دەبووایە پێشتر ڕێگامان لێبگرێت لەوەی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی تەواوی زنجیرەی دەلالەتەکانی فارماکۆن، یا ماناکانی ئەنجام بدەین. هیچ ئیمتیازێکی ڕەها نییە ڕێگامان پێبدات بەشێوەیەکی ڕەها کۆنترۆڵی سیستەمی دەقگەرایی بکەین. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم جۆرە سنوورانە

ـمێت لەچوارچێوەیەکی دیاریکراودا بهەژێنرێن. تواناکانی هەژاندن و بزواندن فـرە ـروشتن، لەبری ئەوەی هەمووی بژمێرین و تێبینیان بکەین، با بێین هەوڵبدەین " ـەر بـەڕێگاوە" هەنـدێك لەجێکەوتـەکانی[1] بەرهـەم بێنـێن، ئـەوەش لەمیانـەی ێشکالییەتی ئەفلاتونییەوە بۆ نووسین.

پێش کـەمێك بەدواداچـوونمانکرد لـەنێوان وێنـەی تـەحووت لـەنێو میتۆلۆژیـای میسریدا، لەگەڵ جۆرێك لەڕێکخسـتنی دیـاریکراو بـۆ چـەمك و توخمـە فەلسـەفی و میتۆلۆژییەکان و خوازە ئاشکراکراوەکان لەڕوانگەی ئەوەی کە ناو دەنرێـت دەقـی

---

١) جێکەوت لەلای دریدا، هێمایە، هێمایەك بـەردەوام جـێ پەنجـەی خـۆی لەسـەر توخمـەکان دیاری دەکات. ئەو هێمایەی دریدا ناوی دەنێت (جێکەوت ـ trace)، واتا ئەوە جێکەوتە بەردەوام لەنێو چرکەساتی ڕابردوو و، ئێستاو، ئایندەدا، خـۆی دەسـەپێنێت بەشـێوەیەك وا لەتوخم دەکات بکرێت بۆ سەرچاوەی پێشووتری بگێڕدرێتەوە. ئەو تێڕوانینە بـۆ کـاری جێکەوت، لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە دریدا هەرگیز بڕوای بەوە نییە دەشـێت زەمـەن و مێژوو بەگشتی، بەپێی ڕووگەیەکی هێلکاری و نەخشەسازی دیاری بکرێت. بۆیـە دەبیـنین دەڵێت:" من بانگەشەی دابەشکردنی زەمەن ناکەم بەپێی ڕووگەیـەکی هێڵـی پێشـووتر ـــ ئێستا ـ دواتر، یا ڕابردوو ـ ئێستا ـ ئاییندە. ئەو چرکەسـاتانە لەگـەڵ یەکتریـدا دەژیـن، ڕابردوو، بەردەوام ڕابردووە، بەبێ ئـەوەی بەیـەکجارەکی ڕابـردوو بێـت. ئێسـتا بـەردەوام ئێستایە، بەبێ ئەوەی بەتەواوی هەمەکیانە ئامادە بێت، یا ئەوەندە ئامادەیە بەشێوەیەك دەبێتە هۆی نا ئامـادەگی، بۆیـە بـەردەوام ڕەنگـی ڕابـردوو هەڵدەگرێت". بـەم شـێوەیە تێدەگـەین جێکـەوت و، پرنسـیبی جێکـەوتکاری لـەنێو پـرۆژە هزرییەکـەی دریـدا چـۆن کاردەکەن و، شوێن پەنجەی خۆیان لەسەر توخمەکان هەڵدەکۆڵن و دیـاری دەکـەن. ئـەم گوتەیـەی دریـدا لـەنێو کتێبـی (جـاك دریـدا، وتوویـژ، لەعەرەبییـەوە: ڕێـبین ڕەسـوڵ ئیسماعیل) وەرگیراوە. (وەرگێڕی کوردی)

ئـــەفلاتونی.[1] بۆمـــان دەرکـــەوت زاراوەی "فارمـــاکۆن" توانایـــەکی زۆری هەبـ لەسەرئەوەی لەنێو ئەم دەقەدا، هەموو هێل و سەرەداوەکانی پێوەندی بەیەکەوە گرێبدات و کۆ بکاتەوە.

ئێستاش با دیسان بگەڕێینەوە سەر وەرگێڕانەکەی "ڕوبین" و ڕستەیەکی لـە شـێوەیە لـەنێو دیـالۆگی فیدرۆسـدا بخوێنینـەوە:" تـووت دەڵێـت: فـەرموو ئـەی پاشای خاوەن شکۆ، ئەوە مەعریفەیەکە ـ mathema کاریگەرییەکەی بریتییە لەوەی وا لەمیسرییەکان دەکـات زانـاتر ـ sophoterous بـن و، باشـتر شـتیار بیربکەوێتـــەوە ـــ mnemonikoterous: لێـــرەدا یـــادەوەری ـــ mneme و فێربـوون، یـا حیکمـەت ـ sophia، بەیەکـەوە چارەسـەریان بـۆ دۆزراوەتـەوە ـ pharmakon".

ڕاستە وەرگێڕانی باوی فارماکۆن بۆ چارەسەری ـ دەرمانێکی چارەسـەرکەر ـ کارێکی هەڵە نییە. نا، فارماکۆن لەتوانایدایە دەلالەت لـە "چارەسـەری" بکـات و، یەکێك لەکارەکانی ئەوە بێت هـەڵگری ئـەم مانایـە بێـت و ئـاڵۆزی لەسـەر لاببـات. بگـرە ئـەوە کـارێکی ئاشـکرایە کـە تـووت مـادام مەبەسـتییەتی ڕیکـلام بـۆ ئـەو بەرهەمـەی خـۆی بکـات، وا دەکـات وشـە لـەنێو چارەنووسـی سـەیرو نـابینراودا بخولێتەوەو یاری پێبکات و تەنیا لەیەکلایەنـەوە پێشکەشـی بکـات، ئـەو لایەنـەی

---

[1] ) لێرەدا ڕێگا بەخۆم دەدەم ئەگەر بۆ ئاماژەش بێت، بگەڕێینـەوە بـۆ (پرسـیاری میتـۆد ـ Question de method) کـە لـەنێو کتێبـی (لـەبارەی گراماتۆلۆژیـا ـ De la grammatologie) پێشـنیارم کـردووە. لەگـەڵ هەنـدێ خۆپارێزییـەوە، دەشـێت بگوترێـت فارمـاکۆن لـەنێو ئـەم خوێندنەوەیـەی ئەفلاتونـدا ڕۆڵێکـی هاوشـێوەی ئەمـە دەبینێت کە زیادە ـ supplement لەنێو خوێندنەوەی ڕۆسۆدا دەیگێڕێت.

ـێ جێگـای دڵنیاییـە. ئـەم دەرمانـە زۆر باشـە، بەرهـەم دێنێـت و چارەسـەریش ـەكات، كەڵەكە دەبێت و دەپارێزێتیش، مەعریفە زیاد دەكات و، لەبیرچوونەوەش كەمتر دەكاتەوە.

لەگـەڵ ئەوەشـدا، پیشـاندنی وەكـو " remede ـــ چارەسـەری" بـەهۆی ـەرچوون بۆ دەرەوەی زمانی یۆنانی دەبێتە هۆی ئەوەی لایەنێك و بەشێكی تـری ماناكـەی زاراوەی "فارمـاكۆن" بسـڕێتەوەو بـەلاوەی بنێـت. واتـا وەرگێـڕان دێـت سەرچاوەی كێشەو ئالۆزییەكە ڕەش دەكاتەوەو دەسڕێتەوە، وا دەكات تێگەیشتن ـەم سـیاقە زەحمـەتتر بێـت، ئـەوە ئەگـەر نـەڵێین هـەر ئەسـتەمی دەكـات. بەپێچـەوانەی "drogue ـــ دەرمـان"، تەنانـەت بەپێچـەوانەی "medecine ـــ دەرمـان" یـش، ئـەوە "remede ـــ چارەسـەری" گوزارشـتە لەعەقڵانییـەتی شـەفافانەی زانسـت و تـەكنیك و هۆكـاری چارەسـەری، بـەوەش لـەدەق دوور دەكەوێتەوە. ئەم تایبەتمەندییە سیحرییەی هێزێك كە ڕێگای پێنـادات كـۆنترۆڵی ئەنجامەكانی بكات و، بەردەوام توانای ئەوەی هەیە سـەرنجمان ڕابكێشـێت كاتێـك یەكێك دەیەوێت لەشوێنگەی سەردارو بكەرەوە چارەسەری بكات.

بەڵام، ئـەفلاتون دەیـەوێت نووسـین وەكـو هێزێكـی نـاوەكی و شـاراوە پیشـان بدات، هێزێك جێگای گومانـە، وەكـو ئـەم وێنەیـەی لـەدوورەوە بـەراورد دەكرێـت، فڕت و فێڵی بینین و چاوبازی و تەكنیكەكانی لاساییكردنەوە، بەگشتی كاریگەریان هەیە. ئێمە دەزانـین ئـەفلاتون گومـانی هـەبوو لـەفالگرەوەو فالچـی و جادووكـەرو مامۆستا سیحربازەكان، بۆیە لەنێو "دیالۆگی یاساكان" دا، بەتایبەتی قسە لەسەر سەپاندنی سزای زۆر قورس دەكات بەسەر ئەوانەدا.

ئەفلاتون داوا دەكات ئەوانە لـەنێو پانتـایی كۆمەڵایـەتی دووربخرێنـەوەو لـەنێ
كۆمەڵگەشدا دەربكرێن، بگرە داوا دەكـات دەسـگیر بكـرێن و نـەهێڵرێت تێكـەڵاوی
خەڵك ببن. ئەم لەیەك كاتدا، داوای گرتنەبەری هەردوو ڕێوشـوێن دەكـات، بـەوەی
بخرێنە نێو زیندانەكان و، نەهێڵرێت هیچ پیـاوێكی ئـازاد سـەردانیان بكـات، تـەنیـ
ئەو كۆیلەیە نەبێت كە ڕۆژانە نانیان بۆ دەبات، ئینجا پاش ئـەوەی دەمـرن لـەگۆ
نەنرێن و لێی بێبەشبكرێن. بۆیە دەبینین دەڵێت:" هەر یەكێك لەوانە ئەگـەر مـرد
دەبێت تەرمەكـەی فڕێبدرێتـە دەرەوەی سـنوورەكانی وڵات و گۆڕیـان پێنـەدرێت
هـەر پیـاوێكی ئـازادیش ویسـتی یارمـەتیان بـدات و لـەگۆڕیان بنێـت، پێویسـتە
بەتۆمەتی زەندەقە دەسگیر بكرێت و تۆمەتباربكرێت و ببرێتە دادگا".

لەلایـەكی تریشـەوە، دەبیـنین وەڵام و بەرسـڤی پاشـا، هـەڵگری مانـاو توانـای
فارماكۆنە لەسەر ئینقیلاب و هەڵگەڕانەوە، واتا گـەورەتركردن و خراپتركردنـی زام
و نەخۆشییەكە، لەبری چارەسەركردنی. بەمانایەكی تر، وەڵامی پاشـا مانـای وایـە
تووت یا ئەوەتا بەفێلبازانەیە ـ یا بەنەزانییەوەیە، هاتووە كاریگەری ڕاسـتەقینەی
نووسـینی بەشـێوەیەكی پێچـەوانە نمایشـكردووە. بـەبڕوای پاشـا، تـووت تـاوەكو
ڕیكلام بۆ داهێنانەكەی خۆی بكات، هـاتووە فارمـاكۆنی بـەم شـێوەیە شـێواندووە
"de-nature ـــ سروشـتـەكەی گۆڕیـوە" و شـتێكی گوتـووە پێچـەوانەی ـــ
tounantion ـــ ئەوەیـە كـە نووسـین دەتوانێـت بیكـات. ژەهرێكـی هێنـاوەو
پێشكەشیكردووە، گوایە ئەوە دەرمانە.

بەم شێوەیە ئێمە كاتێك دێین فارمـاكۆن بـۆ وەكـو چارەسـەری ـــ remede
دەخەینـەڕوو، ئـەوە ئێمـە بێگومـان ڕێـز لەمەبەسـتەكەی تـووت، یـا تەنانـەت

ـفلاتونیش دەگرین، بۆیە ئەوەی پاشا دەیڵێت، گوایە تووت گوتوویەتی، ئەوە سێی لەپاشا کردووەو فێڵی لەخۆیشی کردووە. لێرە لەو چرکەساتەوە، کاتێک ـەقی ئەفلاتونی دێت وەلام و بەرسڤی پاشا وا نمایش دەکات وەکو ئەوەی ـەڕاستی حەقیقەتی بەرهەمەکەی تووت بێت و، قسەکەشی لەبارەی حەقیقەتی ـووسین وەردەگیرێت، ئەوە پیشاندانی ئەم زاراوەیە وەکو "چارەسەری"، ـەڕوانگەی خواوەندی خۆرەوە، بەڵگەیە لەسەر سادەیی و نەزانی تووت.

لەم ڕوانگەیەوە ئەگەر تەماشای بابەتەکە بکەین، دیارە تووت بێگومان گەمەی ـەسەر ئەم زاراوەیە کردووە، پارچە پارچەی کردووەو لەپێناو مەبەستەکانی خۆیدا بەکاری هێناوە، واتا پرسی بەیەککگەیاندنی نێوان دوو بەهای جیاوازو ناکۆك و دژکار. بەلام، پاشا سەرلەنوێ پێوەندییەکە دەگێڕێتەوەو وەرگێڕانیش ئاوڕ لەم بابەتە ناداتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو کەسانەی دیالۆگ دەکەن، هەرچییەکیان کردبێت، بیانەوێت یا نەیانەوێت، ئەوە هەر لەنێو یەکێتی دال خۆیدا ماونەتەوەو جێگیر بوون، خودی گوتاری هەردووکیان بەشدارە لەدروستکردنی ئەم حاڵەتە، ئەوەش حاڵەتێکە ئێمە لەنێو زمانی فەرەنسیدا تێبینی ناکەین. بەدڵنیاییەوە زاراوەی "remede ـــ چارەسەر" زیاتر لەو دوو زاراوەیەی تر "دەرمان" و "عەقار" کاردەکات لەسەر ڕێگرتن لەئیحالەی تەواوو دینامیکی بۆ بەکارهێنانێکی تری هەمان ئەم زاراوەیە لەنێو زمانی یۆنانیدا.

ئەم جۆرە وەرگێڕانە، ئەو شتە وێران دەکات کە دواتر ناوی دەنێین نووسینی "ئەناگرامی"[1] ئەفلاتونی، بەوەش ئەم پێوەندیانەی نێوان وەزیفە جیاوازەکانی هەمان وشە، لەنێو زۆر بابەتی تردا بەلاوە دەنێن: پێوەندییەك كە بەردەوام بەشێوەیەكی گریمانكراو، بەڵام پێویست، لەناوەخۆیدایە. کاتێك وشەیەك و دەنووسرێت وەکو ئەوەی لەهەمان کاتدا مانایەکی تریش ببەخشێت، کاتێك تەختەی شانۆی زاراوەی فارماکۆن لەو کاتەدا کە بەمانای "چارەسەر" دێت کەچی لەهەمان کاتیشداو، لەنێو هەمان زاراوەدا بەقووڵی و، لەدیمەنێکی ترد بەمانای "ژەهر" بەکاردێت ـ ئێمە لێرەدا تەنیا وەکو نموونەیەك ئەوە بەکاردێنین ئەگینا فارماکۆن مانای تریشی هەیە. دێت سەرلەنوێ ئەم مانایە بەرهەم دێنێتەوەو پیشکەشی خوێنەرانی دەکات، ئەوە هەڵبژاردنی وەرگێڕ بۆ یەکێك لەم زاراوە فەرەنسییانە، خۆی لەخۆیدا یەکەم جێکەوتی سنووردارکردنی ئەو گەمەیەیە، گەمەی ئەناگرامی، تا ڕادەیەکیش بەسادەیی دەبێتە هۆی سنووردارکردنی دەقگەرایی وەرگێر خۆیشی.

کەواتە بێگومان دەکرێت ـ ئێمەش لەکاتی خۆیدا ئەم کارە دەکەین ـ پیشانی بدەین کە ئەم جۆرە دابڕان و کەرتکردنانەی نێوان مانا جیاوازەکان، کە لەهەمان کاتیشدا ناکۆك و دژکارن، ئەوە خۆی کاریگەری ئەفلاتونییەتێکی دیاریکراوە، ئەنجامی کارێکە پێشتر لەنێو هەمان دەقی وەرگێڕدراودا دەستیپێکردووە، لەو پێوەندییەی کە خودی ئەفلاتون کێش دەکات بۆ زمانەکەی خۆی. کەواتە هیچ

---

[1]) ئەناگرام ـ anagramme ئەم وشەیەیە کە ئێمە دێین پێکهاتەو ڕێزبەندی پیتەکانی دەگۆڕین تاوەکو وشەیەکی تازەی لێ دروست بکەین وەکو (بحر ـ ربح).

حیاکاری و دژکارییەك لەنێوان ئەم گریمانەو گریمانەکەی پێشووتردا نییە. مادام ەقگەرایی لەئەنجامی جیاوازی و جیاوازی و جیاوازییەوە پێکدێت، ئەوە ەسروشتی خۆی دژکارە ـ ناگونجێت ـ بەردەوام بەبێ کۆتایی، بەشێوەیەکی ەها لەگەڵ ئەم هێزانەدا دەخولێتەوە کە هەوڵی لەوناوبردن و سڕینەوەی دەدەن.

کەواتە ئێمە لەسەرمانە ئەم دوو هێزو بزاڤە قبووڵبکەین و بەدوایاندا بچین و شرۆڤەیان بکەین. بگرە ئەم جۆرە دوالیزمییەتە، بەمانایەك لەماناکان دەبێتە تاکە بابەتی ئەم توێژینەوەیە. لەلایەك ئەفلاتون بڕیارێکی لۆژیکیانە دەدات، کاتێك ڕێگا بەتێپەڕینی نێوان مانای دژکاری ئەو یەك وشەیە نادات، بەتایبەتیش کاتێك ئەو تێپەڕینە ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە ئەوە هەر بەتەواوی شتێکی تری جیاوازە، نەوەکو هەر تەنیا ئاڵۆزی و تێکەڵاوی و سەرلێشێواوی بێت لەنێوان دژەکان، یا دیالیکتیکی دژەکان بێت. لەلایەکی تریشەوە لەبارەی فارماکۆن، ئەگەر خوێندنەوەی ئێمە ڕاست بێت لەبارەیەوە، ئەوە دەبێتە ناوەندی ئەسڵی ئەم بڕیارە، ئەم توخمەیە کە پێشتر بوونی هەیە، لەخۆی دەگرێت، لێی زیاد دەبێت و، هەرگیز ڕێگا نادات کورتبکرێتەوە بۆی و لێشی جیا نابێتەوە ـــ لەئامرازی دال ـ وەکو تاکە فاکتەری نێو دەقی یۆنانی، یا ئەفلاتونی.

بۆیە، هەموو ئەم وەرگێڕانانەی لەنێو زمانەکاندا هەیە، میراتگری میتافیزیکای خۆرئاوایەو، درێژە پێدەریەتی، بەشێوەیەك مامەڵە لەگەڵ فارماکۆن دەکات، کە جێکەوتێکی ڕاستەوخۆی بەسەردا هەیەو بەتووندی تێکی دەشکێنێت و، لەمیانەی ڕاڤەکردنەوە وەکو توخمێکی سادەی خۆی لێ دەکات. کەواتە ئەم جۆرە وەرگێڕانە ڕاڤەکراوە، لەیەك کاتدا هەم نەدارو بێ توانایە،

ەمیش توندوتیژە: فارماکۆن تێکدەشکێنێت، بەڵام لەهەمان کاتیشدا ڕێگای ێدەدات بەبێ دەسکاریکردن لەنێو عەمبارەکەیدا بمێنێتەوە.

ئەگەر وەرگێڕان بکرێتە چارەسەری، کارێکە ناکرێت بەسادەیی قبوڵکراو بێت ، ئاسان نییە ڕەتیش بکرێتەوە. ئێمە، تەنانەت ئەو کاتەش کە پێمان وایە ەمیانەی ئەم کارەدا جەمسەری عەقڵانی و مەبەستی پشت ئەم کارە ڕزگار ەکەین، واتا بیرۆکەی بەکارهێنانی باش بۆ زانستی پزیشکی، یا هونەری زیشکی، ئەوە بێگومان هەموو دەرفەتێك لەبارە تاوەکو ئێمە لەمیانەی زمانەوە ەڵبخەڵەتێین.

لەلای ئەفلاتون، نووسین بەهایەکی زیاتری نییە لەبەرئەوەی دەرمانە، یا ژەهرە، چونکە دەرمان خۆیشی جێگای دوودڵییە، تەنانەت پێش ئەو کاتەش کە اموس بڕیارەکەی خۆی بدات و لەپێگەکەی کەم بکاتەوە. ئێمە بەڕاستی دەبێت بزانین ئەفلاتون خۆیشی بەگشتی گومانی لەفارماکۆن هەیە، تەنانەت ئەگەر پێوەندیشی هەبێت بەو دەرمانانەی کە هەر بەتەواوی بۆ چارەسەرکردن بەکاردێن ، بەنیازێکی باشیش ئامادە کرابن و، لەکۆتاییشدا زۆر سەرکەوتووش بوو بن، ئەو ەر گومانی خۆی هەیە. هیچ دەرمانێك بەبێ زیانی لاوەکی نییە، بۆیە هەرگیز اکرێت ئاوا بەسادەیی فارماکۆنیش بەتەنیا سوودی بێت.

دوو هۆکار هەیە بۆ ئەو بۆچوونەی ئەفلاتون، هەر یەکێکیان قووڵایی دیاریکراوو جیاوازی خۆی هەیە. یەکەم، جەوهەرو لایەنی چاکەخوازانەی فارماکۆن، مانای ئەوە نییە ناکرێت بێ ئێش و بێ ئازار بێت. دیالۆگی پرۆتاگۆراس، فارماکۆنەکان دەخاتە خانەی ئەو شتانەی کە دەکرێت لەیەك کاتدا، هەم باش بن ــ agatha،

هەمیش ناخۆش و ئازاربەخش بن ـ aniara. فارماكۆن بەردەوام ئەم ئاوێتەیەیە ـ summeikton كە دیالۆگی فیلیبۆس قسەی لەبارەیەوە دەكات. بۆ نموونە ئەو ـــ ubris ـــ ە یە، واتا زێدەڕۆییكردنی توندوتیژانە و نەگونجاو لەچێژ وەرگرتن كە پاڵ بەكەسەكەوە دەنێت وەكو شێت هات و هاوار بكات. هەستكردنە بەخۆشی و حەسانەوەیە بۆ ئەو كەسانەی دووچاری گوڕوویی هاتوون، شێلان و چارەسەری هاوشێوەیە، بەبێ ئەوەی پێویستیان بەچارەسەری لەوە زیاتر هەبێت ـ ouk alles deomena pharmaxeos ـ ئەو خۆشییە ئازاربەخشەی پەیوەستە بەنەخۆشی وەكو چۆن پەیوەستە بەچارەسەرەكەی، ئەوە هەر خۆی فارماكۆنە. هەر لەخۆیدا خێرو شەڕە، باش و خراپە. یا بەمانایەكی تر، لەنێو خۆیدا هەموو ئەو دوالیزمییەتانە هەڵدەگرێت و وێنا دەكات.

ئینجا بەشێوەیەكی قووڵترو دوورتر لەئێش و ئازار، ئەوە چارەسەری دەرمانخانەیی ـــ pharmaceutique ـــ خۆی لەخۆیدا زەرەر بەخشە، لەبەرئەوەی دەسكردە. لێرەدا ئەفلاتون پشت بەكولتووری یۆنانی دەبەستێت و دەگەڕێتەوە بۆ ئەم كولتوورە، بەتایبەتیش دەگەڕێتەوە لای پزیشكەكانی دوورگەی كۆس.[1]

فارماكۆن ژیانی سروشتی بێزار دەكات، نەوەكو هەر بەتەنیا ژیان بێزار دەكات، كاتێك هیچ نەخۆشییەك ناگرێت، بەڵكو ژیانی نەخۆشیش، یا بەمانایەكی تر ژیانی نەخۆشییەكەش بێزار دەكات، چونكە ئەگەر بشێت بڵێین، لەبەرئەوەیە كە

---

[1]) كۆس یەكێك بووە لەدوورگەكانی یۆنان و ناوداربووە بەشەڕاب و قوتابخانەی پزیشكی كە هیپۆقرات سەرۆكایەتی دەكرد.

ئەفلاتون بڕوای بەژیانی سروشتی و گەشەکردنی ئاساییانەی نەخۆشی هەیە وەکو ئەوەی بەسەر لۆگۆسدا دێت لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا، بیرمان دێت لەنێو دیالۆگی تیماوسیش، وەکو نەخۆشی سروشتی وایە لەنێو جەستەیەکی زیندوود کە دەبێت ڕێگای پێبدرێت بەپێی پێوەرو شێوەی تایبەتی خۆی گەشە بکات بەپێی ڕیتم و باری جیاوازی خۆی پێبگات و کۆتایی بێت. کەواتە، لەمیانەی بەلاڕێدابردنی بڵاوبوونەوەی سروشتییانەی نەخۆشی، ئەوە فارماکۆن بەگشتی دەبێتە دوژمنی زیندووان، ئینجا ئەو زیندووە ساغ و سەلامەت بێت، یا نەخۆش و پەککەوتە بێت.

پێویستە ئەوەمان بیربێت و ئەفلاتونیش خۆی داوای ئەوەمان لێ دەکات کاتێك نووسین وەکو فارماکۆن پێشکەش دەکات. نووسین، یا ئەگەر حەزمانکرد دەڵێین فارماکۆن، کاتێك پێچەوانەی ژیان بێت، هەڵدەستێت بەگۆڕینی شوێنی ئازارەکە، بگرە ئەو دێت ئازارەکەش زیاتر دەکات. هەر ئەوەشە بەشێوە لۆژیکییەکەی نارەزایی پاشا لەسەر نووسین: بەپاساوی جێگرتنەوەی یادەوەری، نووسین دێت لەبیرچوون زیاتر دەکات، لەبری ئەوەی مەعریفە زیاتر بکات، دێت کەمتری دەکاتەوە.

نووسین بەرسفی پێداویستی یادەوەری ناداتەوە، بەڵکو خۆی لەپێویستی لادەدات. یادەوەری زیندوو ـــ mneme ـــ بەهێز ناکات، بەڵکو هەر تەنیا بیرکەوتنەوەی دروستکراو ـــ hypomnesis ـــ بەرهەم دێنێت. کەواتە، ئەو وەکو هەموو فارماکۆنێك کاری خۆی دەکات، خۆ ئەگەر بونیادی فۆڕمگەرایی ئەم گوتارە، هەر هەمان بونیادبێت کە ئێستا دەیانخەینە بەرانبەر یەك، ئەگەر ئەو

ئریمانەیەش وا بێت کە پۆزەتیف بەرهەم دێنێت و نێگەتیف بەتاڵ دەکاتەوە، ەوە لەهەردوو حاڵەتدا، تەنیا دێت شوێنگەی ئەنجامەکانی نێگەتیف دەگۆڕێت و ـیاتری دەکات لەیەك کاتداو، وا دەکات ئەو کەموکورپییەی کە پاڵنەری ئەو بوون، ـیاتر بێت.

ئەو پێداویستییە لەنێو فارماکۆندا هەیە وەکو هێما کە ڕوبین دێت لێرەدا ـەیکاتە "چارەسەری" و، لەوێشدا دەیکاتە "دەرمان". ئێمە دەڵێین فارماکۆن وەکو هێما، لەوەشدا مەبەستمانە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە مەسەلەکە پەیوەستە بەدالێکی تێکەیشتراو کە خاوەنی مەدلولە.

لەنێو دیالۆگی تیماوسدا کە لەلاپەڕە سەرەتاییەکاندا دەگەڕێتەوە بۆ مەودای ـووری نێوان میسرو یۆنان، وەکو مەودای نێوان نووسین و ئاخافتن "ئێوە ئەی گریکەکان، هەمیشە و تا ئەبەد هەر منداڵن، هەرگیز گریکییەك نابینیت پیر بێت"،[1] لەکاتێکدا لەمیسر دەبینی هەر لەکۆنەوە، هەموو شتێك نووسراوەتەوە": panta gegrammena. ئەفلاتون پیشانمان دەدات کە لەنێو بزاڤ و جوولەکانی جەستەدا، باشترینیان جوولەی سروشتییە ـ ئەوەی کە بەشێوەیەکی خۆڕسك تێیدا سەرهەڵدەدات، لەناوەوەو بەپێی پێداویستی کردەیەکی خۆی.

***" بەڵام لەنێو جوولەکانی جەستەدا باشترینیان ئەوەیە کە خۆی لەمیانەی کردەی تایبەتی خۆیدا سەرهەڵدەدات، چونکە زیاتر هاوشێوەیە لەگەڵ***

---

[1] ) ئەم پەندە میسرییە بۆ ئەوە گووتراوە تاوەکو پیشانی بدەن کە یۆنانییەکان لەڕووی عەقڵییەوە هەمیشە وەکو منداڵ دەمێننەوەو پێناگەن و کەسێکی پیریان نییە خاوەنی حیکمەت و هزرو تێگەیشتن بێت لەئاست منداڵەکاندا. (وەرگێڕی کوردی)

جوولەی زیرەکانە، هەروەها گونجاوە لەگەڵ جوولەی هەموو لەشدا. بەڵام ئەم جوولەیەی پاڵنەرێکی تر مانی دەدات، زۆر خراپە، خراپترینیان ئەوەیە کە لەنێو هەموو ئەم جوولانەدا، بەشێکی تایبەت دەجووڵێنێت لەنێو جەستەیەکی حەساوە بەهۆی فاکتەرێکی دەرەکییەوە. دوای ئەوە، لەنێو هەموو شێوازەکانی پاککردنەوەی جەستەو بووژاندنەوەیدا، باشترینیان ئەوەیە کە ڕاهێنانی جەستەیی بەردەکەوێت. دووەمینیان پاش ئەوەش ئەوەیە کە هەژانی شوێنگەیی نێو بەلەمێك لەنێوماندا دروستی دەکات، یا ئەو کاتەی خۆمان وا لێ دەکەین بەشێوەیەك لەشێوەکان بەبێ ماندوو بوون هەلگیرێین. سێیەمیشیان، کە ڕەنگە هەندێکجار زۆر بەسوودیش بێت، کاتێك مرۆڤ ناچارە بەکاری بێنێت و نابێت هەرگیز پیاوێکی تەندروست لێی پەشیمان بێتەوە، ئەگەر ناچار نەبێت، ئەوەیە کە خۆی بەدەرمانی پزیشکی پاك بکاتەوە (tes pharmakeutikes kathareseos)، چونکە نابێت نەخۆشییەکان لەڕێگای دەرمانەوە زیاتر بووروژێنین (ouk pharmakeiais erethisteon)، بەتایبەتیش ئەگەر ئەو نەخۆشیانە مرۆڤ نەخەنە بەردەم مەترسی گەورەو زۆریش مەترسیدار نەبن.

پێکهاتەی (sustasis) نەخۆشی، بەڕاستی بەمانایەك لەماناکان، هاوشێوەیە لەگەڵ سروشتی بوونەوەری زیندوو (te ton zoon phusei). بەڵام پێکهاتەی بوونەوەری زیندوو، هی هەموو جۆرێك، ماوەیەکی دیاریکراوی هەیە بۆ ژیان. هەر بوونەوەرێکی زیندوو کە لەدایك

***دەبێت، لەنێو خۆیدا هەڵگری ژیانێکە چارەنووسەکەی دەستنیشانکراوە، پاش ئەوەی ئێمە ئەو ڕووداوانە بەلاوە دەنێین کە ئەنجامی زەرورەتن، هەمان شێوەش لەبارەی نەخۆشی هەر ڕاستە. ئەگەر ئێمە بەهۆی دەرمانەوە (pharmakeiais) مەبەستێکمان بۆ نەخۆشییەکە دانا پێش وادەی دیاریکراوی خۆی بوو، ئەوە لەم نەخۆشییە بچووکانەوە نەخۆشی مەترسیدارتر سەرهەڵدەدات، لەنەخۆشی کەمەوە نەخۆشی زۆرتر بەرهەم دێت.***

***پێویست دەکات هەموو شتەکان بەم شێوەیە بخرێنە بەر حوکمی "سیستەمی خۆراك ـ regime" لەو چوارچێوەیەی کە مرۆڤ دەتوانێت پێڕەویان بکات، بەڵام نابێت ببێتە هۆی ورووژاندنی نەخۆشییەکی خراپ بەهۆی خواردنی دەرمانەوە (pharmakeuonta)".***

بێگومان ئێوەش تێبینی ئەمانەی خوارەوەتان کردووە:

١) زۆر جەخت لەسەر زیانەکانی فارماکۆن کراوەتەوە، هەر لەم چرکەساتە دەستنیشانکراوەدا کە تێیدا هەموو سیاقەکە ڕێگا بەوە دەدات وەربگێڕدرێتە سەر "چارەسەری" زیاتر لەوەی "ژەهر" بێت.

٢) نەخۆشی سروشتی بوونەوەری زیندوو وا دەستنیشانکراوە لەجەوهەردا وەکو: هەستناکی ـ allergie، واتا وەکو کاردانەوەیەك بەرانبەر هێرشی توخمێکی نامۆ بۆ سەر لەش. ناسراوترین تێگەیشتنی مرۆڤ بۆ نەخۆشی

لەمیانەی چەمکی هەستناکییەوەیە، مادام ژیانی سروشتی مرۆڤ ملکەچی بزاڤی تایبەتی ناوەوەی خۆی دەبێت.

٣) وەکو چۆن تەندروستی سەربەخۆو auto-nome ڕاستەوخۆیە auto-mate،[١] ئەوە نەخۆشی "سروشتی" ش، لەمیانەی بەرەنگاربوونەوەی هێرشی دەرمان و دەرمانخانەکانەوە کاردانەوەی خۆی پیشاندەدات لەمیانەی گواستنەوەی شوێنی ئازار لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، ڕەنگە ئەو کارە بکات بۆ بەهێزکردنی خاڵی بەرەنگاربوونەوەو فرەکردنی ئەم نەخۆشییەو بڵاوکردنەوەی لەشوێنی تری جەستەدا. نەخۆشی "سروشتی" بەرگری لەخۆی دەکات. کاتێکیش بەم شێوەیە لەو بەربەستانە خۆی ڕزگار دەکات، خۆی لەنەخۆشی هێنی[٢] فارماکۆن ڕزگار دەکات، ئەوە نەخۆشی کاروانی خۆی هەر تەواو دەکات.

---

[١]) بۆ جەختکردنەوە لەدەلالەتی زاراوەکان، جاك دریدا دێت هەردوو زاراوە دەگێڕێتەوە بۆ پێکهاتەی بنەڕەتی خۆیان، لەنێو زاراوەی (autonome ــ سەربەخۆ) سەرەتاکەی (auto) بەمانای خود دێت. لەزاراوەی دووەمیشدا، (nome) لە (nomos) بەمانای نامووس یا یاسا دێت. ئەم زاراوەیەی دواتر لەلایەن عەرەبەکانەوەی لەڕەگورپیشەی یۆنانی کۆنەوە وەرگیراوەو بەعەرەبیکراوە. کەواتە، سەربەخۆ ئەو کەسەیە کە بەپێی یاساکانی خۆی کار دەکات، بەڵام لەحاڵەتی (automate ــ میکانیکی) ئەوە دەبینین دوای (auto) (mate) دێت کە خۆی لە (matas) جوولە وەرگیراوە، بۆیە زاراوەکە دەبێتە ئەوەی کە بەپێی جوولەی تایبەتی خۆی کار دەکات.

٢) مەبەست لێرەدا توانای هێنان و بڵاوکردنەوەو بەرهەمهێنانی نەخۆشییە، یا بوونە هۆکار بۆ بڵاوبوونەوەی نەخۆشی.

٤) ئەنجامی ئەم دیمەنە، ئەوەیە بوونەوەری زیندوو هەر کۆتایی دێت وەکو چۆن نەخۆشییەکەشی کۆتایی دێت، بۆیە دەتوانێت لەمیانەی نەخۆشی حەساسییەتەوە پێوەندییەك لەگەڵ لایەنەکەی تردا دروستبکات، ڕاستە ماوەی ئەم پێوەندییە زۆر سنووردارو دیاریکراوەو، مەرگیش هەر دێت و تازە ناگەڕێتەوە وەکو ئەوەی لەبارەی بونیادی دەرمانیشەوە دەیڵێین لە "سێگۆشەی پێکهاتەکەیەوە". (سێگۆشەی پێکهاتەیی هەر جۆرێك، لەسەرەتاوە وا ئافرێدەکراوە بتوانێت تاوەکو دەگاتە کاتی دیاریکراوی کۆتایی خۆی بەرگە بگرێت. بەڵێ، ناکرێت هەرگیز ژیانیش لەوە زیاتر تێپەڕبێت). نەمری بوونەوەری زیندوو (نە ـ مردنی) و، گەیشتنە حاڵەتی کەمال، لەوەدایە هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ هیچ دەرەوەیەکدا نەبێت، ئەوەش حاڵەتی خوایە. (بگەڕێوە بۆ کتێبی کۆمار). خوا هیچ حەساسییەتێکی نییە، تەندروستی و هێزیش (ugieia kai arête) کە ئەو هەردووکیانی هەیەو بەیەکەوەیان کۆ دەکاتەوە کاتێك مەسەلەکە پێوەندی هەبێت بەجەستە، هەروەها وەکو بەراوردکارییەك بەڕوحیش (بگەڕێوە بۆ دیالۆگی جۆرجیاس)، بەردەوام هەڵقوولاوی ناوەوەن. فارماکۆن ئەو شتەیە کە هەڵقوولاو نییە، بەردەوام لەدەرەوەڕا دێت و وەکو دەرەوەش کار دەکات، دەڵێین هەرگیز خاوەنی هێزێکی تایبەت نییە بشێت دەستنیشان بکرێت. بەڵام چۆن دەتوانین ئەو مشەخۆرە زیادەیە دوور بخەینەوە؟ چۆن دەتوانین ئەو سنوورە بپارێزین، یا با بڵێین ئەو سێگۆشەیە؟

سەمتی ئەم چوار سیمایە، ئەو کاتە سەرلەنوێ پێکدەهێنرێتەوە، کاتێك پاش لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا لەشان و باڵی فارماکۆن وەکو نووسین کەم دەکاتەوە ئەو زاراوەیەی پێویستە هیچ پەلەی لێ نەکەین، لێرەشدا وەکو مەجازێك پێشوازی لێبکەین، مەگەر ئەوە نەبێت رێگا بدەین هەموو وەزی شاراوەو نادیاری توانای مەجازی خۆی نمایشبکات. ڕەنگە ئێستا بتوانین وەڵامەکەی تاموس بخوێنینەوە

***"پاشا وەڵامی دایەوە: ئەی ئەو مامۆستایەی لەهونەردا هاوشانت نییە، ئەی تـووت ـــ o tekhnikotate Theuth، جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو کەسەی دەتوانێت هونەرێك دابهێنێت، لەگەڵ ئەو کەسەی دەتوانێت سوودو زیانەکانی ئەو هونەرە بۆ بەکارهێنەرەکانی ڕوون بکاتەوەو هەڵبسەنگێنێت. ئەوەتا تۆش، لێرە لەم کاتەدا بەو سیفەتەی باوکی پیتەکانی نووسینی ـــ pater on grammaton، لەخۆشەویستییەوە ـــ tounantion کۆمەڵێك سیفەتت پێداوە، تەواو پێچەوانەیەو دژی کاریگەری ڕاستەقینەی خۆیەتی! چونکە ئەنجامی ئەم مەعریفەیە بۆ ئەو کەسانەی وەری دەگرن و فێری دەبن، ئەوەیە کە ڕوحیان فێری لەبیرچوونەوە دەکات، لەبەرئـەوەی چیتر یادەوەری ـــ مێشکی خۆیان بەکارنامێنن ـــ lethen men en psuchais parexei mnemes ameletesia. کاتێك متمانـە بەنووسراو دەکـەن، شـتەکانیان لـەدەرەوەڕا بـیر دەکەونێتـەوە لەمیانـەی هێمـای سـەیرو نـامۆ ـــ dia pistin graphes exothen upallotrion tupon، نەوەکو لەناوەو بەپشت بەستن بەخودی خۆیان ouk endothen autous uphauton ـــ***

*anamimneskomenous. کەواتـــە، تـــۆ چارەســـەرییەکت بـــۆ یادەوەری نەدۆزیوەتەوە، بەڵکو چارەسەریت بۆ بیرکەوتنەوە دۆزیوەتەوە oukoun mnemes alla upomneseos, pharmakon ـ eures. لەبارەی فێربوونیشەوە ـ Sophias de، ئەوە تۆ هەر تـەنیا ڕوخسارەکە بەقوتابیانت دەدەیت ـ doxan، نەوەکو حەقیقەتەکـەی ـ aletheian، کاتێك لەمیانەی تۆوە پڕ دەبن لەمەعریفە، بـەبێ ئـەوەی هیچ شتێك فێربووبن، ئەو کاتە وا دەردەکەون وەکو ئـەوەی بتـوانن بڕیـار بەسەر هەزاران شتدا بدەن، لەکاتێکدا زۆربـەی جارەکـان ئـەوان لەهـەموو توانایـەك بـۆ بڕیـاردان دامـاڵراون. بگـرە لـەوەش زیـاتر، ئەوانـە توانـای گریمانـەکردنیان نابێـت و دەبنـە نیمچە خوێنـدەوار ـ doxosophoi لەبری ئەوەی ببنە پیاوی خوێندەوار ـ anti sophon!".*

بەم شێوەیە پاشا، باوکی ئاخافتن، دەسـەڵاتی خـۆی سـەپاندە سـەر بـاوکی نووسـین. ئـەم کارەشـی زۆر بەتوونـدی ئەنجامـدا، بـەبێ ئـەوەی هـیچ جـۆرە لێبووردنێك و سینگ فراوانییـەك پیشـان بـدات، بـەهۆی ئـەوەی تـووت شـوێنگەی کـوڕی ئـەم داگـیر دەکـات و، بەشـێکە لەمنداڵـەکانی و، سـیمایەکی خواییانـەی خۆیـەتی.[1] تـامووس لێـرەدا پەلـە دەکـات، نـاڕەزایی زۆری خـۆی پیشـاندەدات، دیارە دەیەوێت هیچ هیوایەك بۆ تووت نەهێڵێتەوەو پێی نەدات.[1]

---

[1]) ئـەم زاراوەیـە سـیما، یـا ڕوخسـارو کەسـایەتی ـ caractere گوزارشـت لـەمۆرك و سروشتی کەسایەتی دەکات، لەهەمان کاتیشدا جۆرێکە لـەپیتی نووسـین. ئـەوەی دریـدا

لێرەدا هانای بۆ دەبات و بەکاری دێنێت، گەمەکردنە لەسەر ئەم چەمك و زاراوانەی کە زیاتر لەمانایەك و دەلالەتێکیان هەیە. (وەرگێڕی کوردی)

١) تووت داهێنانێکی تازە ڕادەگەیەنێت، تامووس لەبەردەم فارماکۆندایە، پێویستە لەسەری ڕای خۆی دەربڕێت. بەپێی ئەم میتۆلۆژیایە، نووسین ــ فارماکۆن لەبەردەم پاشاد خراوەتە ڕوو تاوەکو قسەی لەسەر بکات. ئەو داهێنانە جگە لەوەی نووسینە، بەڵام دیارییەکیشە بۆ پاشای خواوەندەکان، بەر لەهەموو شتێکیش داهێنراوێکە بۆ ئەوە خراوەتە ڕوو تاوەکو هەڵبسەنگێنرێت. ئەو داهێنراوە نوێیە توانای کارکردنی هەیە، توانای بیر خستنەوەو هەڵگرتن و پاراستنی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم دیارییە تا ئێستا نەخەملێنراوەو بەهاکەی دیاری نەکراوە، ڕاستە خراوەتە بەردەم پاشا، بەڵام ئەوە پاشایە بەهای پێدەبەخشێت، هەر ئەویش نرخ و بەهاکەی دیاری دەکات. لێرەدا نووسین زیادەیە دەخرێتە سەر ئاخافتن، بۆیە نووسین هیچ بەهایەکی نابێت ئەگەر پاشا بڕیاری پەیڕەوکردنی نەدات، ئەگەر پاشا بڕیاری بڵاوکردنەوەو فێربوونی نەدات، نووسین بۆخۆی بەهایەکی نییە، ئەوە تامووسە بەها بەنووسین دەبەخشێت. تامووس نانووسێت، قسە دەکات، دەدوێت و پێویستی بەنووسینەوە نییە، یەك قسەی ئەو بەسە نەوەکو نووسینەوەی، بەڕەچاو گرتنی ئەو پلەو پایەیە پاشا ـ خواوەند دێت لەبەهای فارماکۆن کەم دەکاتەوە، ئەوە نمایش ناکات کە بێ سوودە، بگرە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەڕەشەیەو زەرەر مەندیشە. خواوەند ــ پاشا کاتێك دەدوێت، وەکو باوکێك قسە دەکات و ڕەفتار دەکات، فارماکۆن ــ نووسین خراوەتە بەردەم باوك، ئەویش ڕەتی دەکاتەوە، چونکە لەلای ئەو بێ بەهایە، باوك گومان لەو مەبەستانە دەکات کە لەپاڵ بەرهەمهێنانی نووسینەوەن. لەکاتێکدا نووسین پێویست نییە، تەنیا گوتەیەکی ئەو بەسە. تەنیا ئاخافتنی ئەو سەرچاوەی پیرۆزییە، ئەی باشە بۆچی تووت دێت نووسین بەرهەم دێنێت، ئەگەر مەبەستی شاراوەو نا ڕاگەیەندراوی بەدواوە نەبێت، ئەگەر مەبەستی ئەوە نەبێت لەپیرۆزی ئاخافتن و گوتەی سەر زارەکی کەم بکاتەوەو، پیرۆزی بەخشین نەبێت بەنووسراو کە خودی خۆی وەکو خواوەندو پاشاو باوك نایزانێت، گومان لەنووسین کەوا دەکات وەکو شتێکی لاوەکی و بێ بەهاو هەڕەشەدار سەیر بکرێت و بەردەوام لەژێر چاودێری دابێت. ئەفلاتون دێت لەپشت و پەنای خستنەڕووی ئەم میتۆلۆژیایەدا

وەکو ئەوەی تاmووس دەڵێت، تاوەکو نووسین ئەم کاریگەرییە "پێچەوانە"یە ـەدی بێنێت، تا دەبێتە ئەم شتەی چارەڕوان دەکرێت، تاوەکو ئەو فارماکۆنەش ـەمیانەی بەکارهێنانیدا ئاشکرا دەبێت زیان بەخشە، ئەوە دەبێت تواناکەی و، هێزی شاراوەی ناوەوەی ــ dynamis ئاڵۆزو شاراوە بێت. وەکو ئەوەی ـەهەریەك لەدیالۆگەکانی بڕوتاگۆراس و فیلیبۆس و تیماوسدا لەبارەی فارماکۆنەوە ئاماژەی بۆ دەکرێت.

بەهەر حاڵ، ئەفلاتون دەیەوێت لەسەر زمانی پاشا کۆنترۆڵی ئەم ئاڵۆزییە بکات و، باڵادەست بێت بەسەر دەستنیشانکردنی لەنێو بەراوردکرنێکی سادەو یەکلاکەرەوەدا: خێرو شەڕ، ناوەوەو دەرەوە، حەقیقەت و ساختە، جەوهەرو ڕوخسار. ئێمە با جارێکی تر بەبڕیارەکەی پاشادا بچینەوەو بیخوێنینەوە، ئەو کاتە زنجیرەیەك لەو دوالیزمییەتانە دەدۆزینەوە. بەم شێوەیەش دانراون و ڕێکخراون بەجۆرێك فارماکۆن، یا ئەگەر ویستمان بڵێین نووسین، تەنیا ئەوەی بۆ دەمێنێتەوە لەنێو بازنەیەکی داخراودا بخولێتەوە. لەڕوخساردا وا دیارە نووسین یادەوەری دەوروژێنێت و فرێشی دەکاتەوە، لەناوەوەڕا لەمیانەی بزاڤی تایبەتی خۆیدا یارمەتی دەدات بۆ زانینی حەقیقەت. بەلام لەنێو ڕاستیدا، ئەوە نووسین هەر لەبنەمادا خراپە، زیانی هەیە بۆ یادەوەری، زانست و مەعریفە بەرهەم

---

گەرەکیەتی ئەسڵی ئاخافتن و دەسەڵاتەکەی، بەتایبەتیش لۆگۆس بۆ شوێنگەی باڵادەستی و باوکایەتی بگێڕێتەوە. پێمان دەڵێت ئاخافتن یەکێکە لەئیمتیازاتەکانی باوکایەتی، لۆگۆسیش لەو دەسەڵاتە پەتریارکی و تیۆکراتییەوە سەرچاوە دەگرێت، کەواتە لۆگۆس لەئاخافتنەوە سەرچاوە دەگرێت. (وەرگێڕی کوردی)

نامێنێت، بەڵکو ڕاوبۆچوون دروست دەکات، حەقیقەت بەرهەم نامێنێت، بەڵکو ڕوخسارێك بەرهەم دێنێت، گوایە ئەمە گوزارشتە لەحەقیقەت. فارماکۆن گەمەی ڕوخسار بەرهەم دێنێت و، لەمیانەیدا فریومان دەدات گوایە ئەوە حەقیقەتە، ... تاد.

لەکاتێکدا ئێمە لەنێو دیالۆگی فیلیپۆس و، دیالۆگی پرۆتاگۆراس، دەبینین فارماکۆن ئازاربەخشە، وا دەردەکەوێت وەکو ئەوەی زیانبەخش بێت، ئەگەرچی بەسوودە. ئەوە لێرەدا، لەنێو دیالۆگی فیدرۆس و دیالۆگی تیماوس، وەکو چارەسەرێکی بەسوود پێشکەش دەکرێت و دەناسێنرێت، لەکاتێکدا خۆی لەحەقیقەتدا زیانبەخشە. مانای وایە پۆشاك و بەرگێکی خراپ، دەخرێتە بەرانبەر پۆشاك و بەرگێکی باش، مەبەستێکی درۆزنانە، بەرانبەر ڕوخسارێکی پەتی. حاڵەتی نووسین مەترسیدارە.

هەر ئەوەندە بەس نییە، بڵێین نووسین لەمیانەی ئەو دوالیزمییەتانە، یا دوالیزمی تر کە وەکو زنجیرە ڕێکخراون، بیری لێکراوەتەوە. ئەفلاتونیش بیریان لێ دەکاتەوەو، هەوڵدەدات لەمیانەی ئەو دوالیزمییەتانەوە تێیان بگات و کۆنترۆڵیان بکات. بۆ ئەوەی ئەم بەها دژکارو ناکۆکانە: خێر ــ شەڕ، حەقیقەت ــ ساختە، ناوەڕۆك ــ ڕوخسار، ناوەوە ــ دەرەوە، .. تاد، دەڵێین تاوەکو ئەوانە بتوانن دژکارو ناکۆك بن، پێویستە لەسەر هەردوولایەن بەسەر یەکتریدا ناکۆك بن، واتا دەبێت یەکێك لەو دوالیزمییەتانە (ناوەوە ـ دەرەوە) پێشتر پەسندکرابێت وەکو ڕەحمی هەموو دوالیزمییەتێك، یا مانای هەموو ناکۆکی و دژکارییەکی مومکین بێت.

دەبێ یەکێك لەو توخمانە سیستەمەکەی، یا زنجیرەی بەدوا یەکداهاتنی وای لێبێت بەشێوەیەکی گشتی، ببێتە بنەمای سیستەمی ئەم زنجیرەیە. ئەگەر ئێمە ڕازی بووین لەسەر ئەوەی شتێکی وەکو فارماکۆن ــ یا نووسین ــ دوور لەوەی ڕێگامان پێبدات کۆنترۆڵی بکەین لەمیانەی ئەم دوالیزمییەتانەدا، توانای خۆی بەکاردێنێت بەبێ ئەوەی قبووڵی بکات ببێتە بەشێك لێی، ئەگەر ڕازی بووین بەوەی شتێکی وەکو نووسین، یا فارماکۆن دەشێت خۆی وا ڕابگەیەنێت کە جیاوازییەکی زۆر سەیر هەیە لەنێوان ناوەوەو دەرەوەدا، ئەگەر ئێمە ڕازی بووین بەوەی بڵێین نووسین وەکو فارماکۆنێك ڕێگا نادات بەسادەیی شوێنگەبەند بکرێت، وەکو ئەوەی خۆی شوێنگەگەرایی دەکات، هەروەها ڕێگا نادات بخرێتە ژێرباری ئەو چەمکانەی لەمیانەیدا بڕیار دەدات، ئەوە هەر تەنیا خەیاڵ و تارمایی ــ fantome خۆی بۆ ئەو لۆژیکە جێبێڵێت کە ناتوانێت ملکەچی بکات، تەنیا مەگەر لەخۆی دەرچووبێت.

خۆ ئەو کاتەش، دەبێت ملکەچی بزاڤ و جوولەی سەیر بکرێت کە چیتر لەتوانادا نییە جارێکیتر بگەڕێینەوەو بەسادەیی ناوی بنێین لۆژیك یا گوتار، بەتایبەتی ئەوەی ئێمە پێش کەمێك ناومان نابوو تارمایی، چیتر ناتوانرێت بەهەمان متمانەوە لەحەقیقەت و لەواقیع و جەستەی زیندوو، .. تاد، جیا بکرێتەوە. پێویستە لەسەرمان قبووڵی ئەوە بکەین کە ئەوەی تارمایی خۆی جێهێشتووە، ئەوە تەنانەت ئەگەر بۆ یەکجاریش بێت، بەشێوەیەك لەشێوەکان هیچ شتێکی ڕزگار نەکردووە.

بێگومان ئەم ڕاهێنانە کورتە، بەس بوو تاوەکو خوێنەر تێبگەیەنرێت دیالۆگ و ئەفلاتون، وەکو ئەوەی لەنێو ئەم دەقەدا وێناکراوە، لەسەرەتادا لەو جۆرە مۆدێلە فەلسەفییانە دوور دەکەوێتەوە کە دانی پێدانراوە بۆ قسەی فەلسەفی و، سەرلەنوێ یەکخستنەوەی ڕێژەگەرایی یا بونیادگەری سەمتێکی دیاریکراو، کە ئەو هەوڵدەدات سەرلەنوێ بەیەکەوەیان ببەستێتەوەو پەسندیان بکات و جەختیان لەسەر بکاتەوە، یا سەراوژێریان بکات. ئەنجامدانی "گەڕانەوەیەك" بۆ ئەفلاتون یا "سەرفکردن و دوورخستنەوەی" لەسەر شێوەی ئەم فرمانەی پێشتر خرایە ڕوو، ئەوەی هەمیشە بەئەفلاتونی دەمێنێتەوە.

مەسەلەکە لێرەدا بەتەواوی پێوەندی بەشتێکی ترەوە هەیە، پێوەندی بەمەو، بەشتێکی ترەوە هەیە. هەر کەسێکیش گومانی لەوە هەیە، پێویستە لەسەری بگەڕێتەوەو برگەکەی پێشووتر بخوێنێتەوە. لەخاڵێکی دیاریکراودا هەموو نموونەکانی خوێندنەوەی کلاسیکی دەبەزێنێت، یا لێیان زیاد دەبێت، بەتایبەتیش لەم خاڵەدا کە پێوەندی بەئێنتیما هەیە بۆ نێو ئەو زنجیرە لەدوالیزمییەت. بەزاندن یا پڕبوون[1] ــ بەڵام ئایا دەتوانین بەردەوام هەروا ناوی ببەین؟ ــ گواستنەوەیەکی دیاریکراوو سنووردارە لەنێو ئەم زنجیرەیەدا، هەروەها گەڕانەوەو

---

[1] ) ئەو فرمانەی دریدا بەکاری دێنێت بریتییە لە ــ exceder، مەبەست لێی بەزاندن و تێپەڕاندن نییە لەمیانەی کردەیەکی دەرەکیدا، بەڵکو مەبەستی تێپەڕاندن و بەزاندنە لەمیانەی زنجیرەیەك توخمی دیالیکتیکی و کردەی نێو خۆیی کە دەیانەوێت خۆیان بخەنە ڕوو و ئاشکرا بکەن و گوزارشت لەخۆیان بکەن، بەوەی چیتر ناتوانن دان بەخۆیاندا بگرن و زیاد دەبن، وەکو چۆن ئاو لەنێو ڕوباردا زیاد دەبێت و شەپۆل دەدات بەرەو لایەکانی و دەڕژێت.

پاشەکشـەیەکی دیـاریکراوە ــ بـەمانای سـتراتیژی ئـەم زاراوەیـە ــ کـە ئێمـە لەشـــوێنێکی دوورتـــردا نـــاوی دەنـــێین "ســـەرلەنوێ تێبینیکردنـــەوە ــــ Remarque"[1] لـــــەنێو زنجـــــیرەی دوالیزمییەتـــــەکان و، تەنانـــــەت دیالیکتیکەکەشیاندا. ئێمە هێشتا نـاتوانین لەمیانـەی چـەمکێکی سـادەدا وەسـفی بکەین و ناوی بنێین و تێـی بگـەین، بـەبێ ئـەوەی هـەر زوو ڕاسـتەوخۆ لەدەسـتی نەدەین. ئەو گواستنەوەو بازدانە خۆی لەهاوشـێوەیی چـەمکی دەلالەتـدار نـادات، بـەو ڕادەیـەی خـۆی لـەجیاوازی دەدات، وەکـو ئـەوەی دەبیـنین "هاوشـێوەیە ــ simulacres"، بۆیـە پێویسـتە ئـەنجامی بـدەین. ئـەو دەنووسـرێتەوە، بۆیـە دەبێت پێشتر بیخوێنینەوە.

ئەگەر نووسین، بەپێی قسەکانی خواوەندو، لەژێر سایەی خۆردا، دەبێتـە هـۆی بەرهەمهێنانی شتێك کە پێچەوانەیە لەگەڵ ئـەوەی بانگەشـەی بـۆ دەکـات، ئەگـەر فارماکۆن زیانبەخشە، لەبەرئەوەیە کە وەکو فارماکۆنی نێو دیالۆگی تیمـاوس هـی ئێرەو ئەم شوێنە نییە. فارماکۆن لەولاوە هاتووە، لەشوێنێکی تر، بۆیـە بـەڕانی و نامۆیە، بەراورد بەم شتە زیندووەی کە لێرە لەناوەوەیە. لۆگۆس ــ zoon وەکـو

---

[1] ) سـەرلەنوێ تێبینیکردنـەوە ــ remarque، زۆرجـار بـە سـەرلەنوێ خوێندنـەوە ناودەبرێـت، ئەگەرچـی لـەڕووی وشـەو زاراوەکـەوە هـەمان مانـا نـادات. هـەموو دەقێـك لـەڕوانینی جـاك دریـدا سـیماو مارکـەو هێمایـە لـەنێو زنجیرەیـەك ئەلتـەناتیف کـە دەق لەوەهمدایـەو بێهـوودە پێـی وایـە دەتوانێـت کـۆنترۆڵ و ئاڕاسـتەی بکـات. هـەموو خوێندنەوەیەکی تازە، دەبێتە هۆی ئەوەی مۆرکێکی تازە بەدەق ببەخشێت، سـەرلەنوێ تێبینـی تـازەی لەبارەیـەوە دەسـبکەوێت و وێنـای تـازەی بـۆ بکرێتـەوەو چـین و توێـژی شاراوەی تازەی لێ بدۆزرێتەوەو خۆڵی لەسەر لابدرێت. (وەرگێڕی کوردی)

ئاژەڵێك دێت نوێنەرایەتی ئەو فارماكۆنە دەكات. مۆری ـــ tupoi نووسین ئەمجارەیان لەشێوەی شەمع لەسەر ڕوحدا دەرناكەوێت، وەكو ئەوەی تیماوس گریمانی دەكات، بەوەش دەبێتە بەرسڤی ئەم بزاڤە خۆڕسك و خۆجێییەی ژیانی دەروون. لەبەرئەوەی دەزانێت توانای ئەوەی هەیە لەهزرەكانی دووربكەوێتەوە، یا دووریان بخاتەوە بەرەو دەرەوە، بەرەو كۆگا، بەرەو هێمای فیزیایی، هێمای ئاسمانی كە لەسەر تەخت ڕادەخرێن، بۆیە ئەوەی خاوەنداریێتی پیشەی نووسین بكات، دەتوانێت لێی دڵنیابێت و بحەسێتەوە. دەتوانێت لەوە دڵنیابێت توانای ئەوەی هەیە خۆی ون بكات، بەبێ ئەوەی مۆرەكانی واز لەوە بێنن لەوێ ئامادە بن. دەتوانێت ئەم لەبیریان بكات، بەبێ ئەوەی ئەوان لەخزمەتكردنی بووەستن. نووسین هەر نوێنەرایەتی ئەم دەكات، ئەگەر ئەو خۆیشی لەبیری بكات، ئەم نووسینە هەر بەزمانی ئەو قسەدەكات و، هەڵگری وشەكانی ئەوە، ئەگەر ئەم خۆیشی چیتر لێرە نەبێت تاوەكو بیبووژێنێتەوەو زیندووی بكاتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەم كەسە مردووش بێت. تەنیا فارماكۆن دەتوانێت خاوەنداریێتی ئەم توانایە بكات، توانای كۆنترۆڵكردنی مەرگ، بەڵام بێگومان بەهاوكاری لەگەڵ خۆیدا. كەواتە، فارماكۆن و نووسین، بەردەوام پرسی ژیان و مەرگن.

ئایا دەتوانین بەبێ جێهێشتنی چەمكەكانی سەردەمێك ـــ بەبێ ئەوەی لەخوێندنەوەدا دووچاری هەڵەی گەورە هاتبین ـــ بڵێین مۆرەكان نوێنەرو نمایندەی فیزیاییانەی دەروونی كەسی نا ئامادەن؟ كەواتە، وا باشترە بیر لەجێكەوتی نووسراو بكرێتەوە، وەكو ئەوەی چیتر ناچێتە ژێرباری فیزیاییانە، چونكە زیندوو نییە.

ئەم گەشە ناكات، وەكو چۆن ئەو شتانەش گەشە ناكەن كە نایانپیتێنین ــ وەكو ئەوەی پاش كەمێكی تر سوقراتیش ئاماژەی بۆ دەكات ــ كە لەمیانەی قامیش یا قەڵەمدا ــ kalamos دەیانپیتێنین و بەرهەمیان دێنین. ئەم دێت تووندوتیژ بەرانبەر بەسیستەمی سروشتی و سەربەخۆی یادەوەری ــ mneme ئەنجام دەدات، كە تێیدا سروشت ـ physis و دەروون ــ psuche ــ ناكۆك و دژكار نەبن. ئەگەر نووسین بگەڕێتەوە بۆ سروشت و سەر بەسروشت بێت، ئەی باشە لەنێو ئەم چركەساتەی ژیانی سروشتدا، ئەو بزاڤە پێویستە ڕوونادات كە دەبێتە هۆی ئەوەی حەقیقەتەكەی خۆشتربێت، یا ئەو كردەیەی لەمیانەیدا خۆی بەرهەم دێنێت، ببێتە هۆی ئەوەی وەكو هیراكلیتس ئاماژەی بۆ دەكات: هانا بباتە بەر ناوەوەی خۆی؟ نووسینی ڕەمزدار ـ Crypotogramme لەنێو یەك زاراوەدا، وتەزایەكی ئاخنراو چڕ دەكاتەوە.[1]

بۆیە ئەگەر بڕوامان بەقسەی پاشا كرد لەبارەی ئاخافتن، ئەوە فارماكۆنی نووسین دێت تاوەكو ئەم ژیانەی یادەوەری گەشەپێبدات، ئەوەش لەمیانەی كێشكردن و پاڵ پێوەنانی بۆ دەرچوون لەخودی خۆی و، بیخاتە نێو حاڵەتی

---

١) لێرەدا گەڕانەوەیە بۆ گوتەیەكی ناوداری هێراكلیتس لەبارەی ئەوەی كە سروشت تاوەكو بوون بەرهەم بێنێت، چێژ لەوە وەردەگرێت هەندێكجار خۆی لەنێو شوێنگەی نهێنی خۆیدا بئاخنێت. مادام هەموو نووسینێك لەبنچینەدا نهێنی و ڕەمزدارە، بەپێی كۆدی تایبەتی خۆی كار دەكات، ئەوە بێگومان وەكو ئەنجامێك، كۆمەڵێك تێخزان و زێدەڕۆیی ئاخنران لەم چركەساتەی سروشتدا ڕوو دەدات كە تێیدا سروشت ئارەزوو دەكات بەرەو شوێنگەو ئەشكەوتی نهێنی خۆی بكشێتەوە. هەر لەزاراوەی ئەشكەوت ــ Cryptc سیفەتی ڕەمزدار یا كۆدی نووسراو ـ Crypte وەرگیراوە.

**ڕاکشـــان لـــەنێو جێکەوتـــدا.[١] دڵنیایـــە لەبـــەردەوامی مـــۆرك[٢] و جـــێ پەنجـــەو سەربەخۆیی، یادەوەری وا لێدەکات ڕابکشێت و پشوو بدات، چیتر وەکو خۆی نامێنێتـەوە، ئـەویش زۆر نایـەوێت بەڕاکشـاوی لەپشـوودا بمێنێتـەوەو، زۆر نزیـك لەحەقیقەتی ئەو شتانەی بوونیان هەیە، ئامادەیە.[٣] ئـەم کاتێـك لەسـەر دەستی**

---

١) زاراوەی جێکەوت زاراوەیەکی فارماکۆنیە، بەڵام لەسیاقی نووسیندا دیارە بەچەند مانایەکی جیاوازیش بەکاردێت، هەم لەلایەن نووسـەرو هـەمیش لەلایـەن وەرگێـڕی عەرەبییـەوە کـە هەندێکجار هەوڵیداوە ڕوونی بکاتەوە بۆمان. یەکەم، جێکـەوت بـەمانای کـاری هونـەری و پیشـەی دەسـتی ــ oeuvre. دووەم، جێکـەوت بـەمانای پاشمـاوەی ئـەم شـتەی کـە دەمێنێتەوە پێش ئەوەی بەتەواوی ون بێـت و لەناوبچێت ــ trace. سـێیەم، جێکـەوت بـەمانای مۆنۆمێنـت و شـوێنی یـادوەری ــ monument. چـوارم، جێکـەوت بـەمانای کاریگـەری شـتێك بەسـەر شـتێکی تـرەوە، یـا کـارلێکردن و ئەنجامەکـەی ــ effet. (وەرگێڕی کوردی)

٢) زاراوەی مۆرك ـ type بـەلاتینی دەبێتـە typus، بـەیۆنانیش tupos بـەکۆش دەبێتـە topoi. ئەم زاراوەیەش مانای فرەو جیاوازی هەیەو دریدا هەر جارێك بۆ شێوە گـرتن و کۆنترۆڵکردنێکی نمایندەی شێوەکانی نووسین بەکاری دێنێت. لەنموونـەی لاتینیـدا، ئـەم زاراوەیە بەمانای نموونە، یا وێنە، یا بونیـادی ئەسـڵی، یـا ڕەمـز بـەکاردێت کـە پێویسـت دەکات لاسایی بکرێتەوە، ئەم قاڵبەیە کە پێویستە سەرلەنوێ بەرهەم بهێنرێتەوە. بـەمانا یۆنانییەکەشی، دەکاتە هەیکەل، یا ئـەو مـۆرك و شـێوازەی دەگیرێتەبـەر بـۆ کـۆپیکردنی چەند دانەیەکی تر لەهەمان شت. لێرەدا بەمانای لەقاڵبدان و مۆرك بەخشـین و فـرە بـوون بەکاردێت.

٣) تـووت بـۆ ئـەوەی بـازار بـۆ کاڵاکـەی خـۆی بدۆزێتـەوە، دێـت بـەو شـێوەیە فارمـاکۆن دەشـێوێنێتن شـتێك دەڵێـت تـەواو پێچـەوانەی ئەوەیـە کـە نووسـین ئـەنجامی دەدات. ژەهرێکـی خسـتۆتە ڕوو، گوایـە دەرمـان و چارەسـەرییە. لـەلای دریـدا کاتێـك فارمـاکۆن دەخرێتـە ڕوو وەکـو ئـەوەی مانـای چارەسـەری ببەخشـێت، جگـە لـەوەی ڕێـز گرتنـە لەمەبەستەکەی تووت و ئەفلاتون، لەهەمان کاتیشدا خستنەڕووی ئەو مەبەستەیە کە پاشا

بانگەشەی دەکات، گوایە تووت بانگەشەی بۆ کردووە. لێرەدا دیارە زیرەکایەتی تووت بەچ ئەندازەیەك بووە، بەجۆرێك توانیویەتی نووسین بگەیەنێتە ئاستێك بتوانرێت لەنێو جیهانی ئەو کاتدا قبوول بکرێت، ئەوەش لەسایەی وازی کردنی زمانەوانی لەسەر خودی وشەی فارماکۆن. پاشا دێت وازییەکە گەرمتر دەکات و، فارماکۆن دەخاتەوە نێو سیستەم و، سیاقی مانایی خۆی وەکو موفرەدەیەك کە هەڵگری دژکارییە لەنێو خۆیدا ژەهر ــ دەرمان. هەنجەتی پاشا ئەوەیە کە نووسین دێت شوێنی یادەوەری مرۆڤ دەگرێتەوە بەجۆرێك ڕاستەوخۆ کار دەکاتە سەر مێشکی مرۆڤ و بێهێزی دەکات، چونکە مرۆڤ چیتر بیر ناکاتەوە، بەڵکو دێت پەنا دەباتە بەر نووسراو تاوەکو یادەوەرییەکانی خۆی بیر بکەوێتەوە. با لێرەدا کەمێك بگەڕێینەوە سەر دیالۆگەکەو، بزانین پاشا چۆن وەڵامی تووت دەداتەوە:" ئەی ئەو مامۆستایەی لەنێو هونەردا هاوشانت نییە. ئەی تووت، جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئەو کەسەی دەتوانێت هونەرێکی نوێ بەرهەم بێنێت، لەگەڵ ئەو کەسەی دەتوانێت سوودو زیانەکانی ئەم هونەرە بخەملێنێت بۆ ئەو کەسانەی بەکاری دێنن. تۆ لەو کاتەدا بەو سیفەتەی باوکی پیتەکانی نووسینی، لەخۆشەویستییەوە هەندێك سیفاتت پێ بەخشیوە تەواو دژکارە لەگەڵ کاریگەرییە ڕاستەقینەکەی، چونکە ئەنجامی ئەو مەعریفەیە بۆ ئەو کەسانەی بەکاری دەهێنن، ئەوەیە ڕۆحیان دووچاری بیرچوونەوە دەکات، ئەوانە چیتر یادەوەری خۆیان بەکار ناهێنن بۆ بیرکردنەوەو، بڕواو متمانەی خۆیان بەنووسراو دەبەخشن. لەسایەی هەندێك متمانەی سەیرەوە، لەدەرەوەڕا، شتەکانیان بیر دەکەوێتەوە، نەوەکو لەناوەوەی خۆیان و بەپشت بەستن بەخودی خۆیان بێت. تۆ چارەسەرییەکت بۆ یادەوەری نەدۆزیوەتەوە، بەڵکو چارەسەریت بۆ یادکردنەوە دۆزیوەتەوە. سەبارەت بە فێربوونیش، تۆ تەنیا فێربوون بەقوتابیانت دەبەخشیت، نەوەکو حەقیقەتی فێربوون، کاتێك لەسایەی تۆوە پڕ دەبن لەمەعریفە، بەبێ ئەوەی هیچ شتێك فێر ببن، وا دەردەکەون کە دەتوانن حوکم بەسەر هەزاران شتدا بدەن، کەچی زۆرجار ئەوانە لەهەموو حوکمێك داماڵراون، بگرە لەوەش زیاتر، توانای ئیحتیمالیان نامێنێت، چونکە دەبنە نیوە فێربوو، لەبری ئەوەی ببنە پیاوی فێرکراو".

لێرەدا باوکی ئاخافتن دەسەڵاتی خۆی بەسەر باوکی نووسیندا سەپاند. ئەفلاتونیش گەرەکیەتی لەپشت زمانی ئاخافتنی پاشاوە ئەو ئاڵۆزییە قووڵتر بکاتەوەو کۆنترۆڵی

پاسەوانەکانی خۆیدا گەمارۆ دراوەو، لەلایەن ئاماژەو هێما تایبەتییەکانی خۆی، ئەو مۆرك و قاڵبانەی داوایان لێکراوە پاسەوانی لەمەعریفە بکەن و بیپارێزن، چیتر ڕێگای پێنادرێت لەم چوارچێوەیە بێتە دەرەوە، ئەم خۆیشی ڕێگا بەوە دەدات لەلایەن لیتیَ ـ Lethe[1] قووت بدرێت و بچێتە نێو نامەعریفەیی و لەیادچوون و لەبیرچوونەوە. لێرەدا پێویستە یادەوەری و حەقیقەت لەیەکتری جیا نەکەینەوە، بزاڤی حەقیقەتی بەرجەستەبوو ــ aletheia، هەر هەمووی بەتەواوی بریتییە لەبڵاوبوونەوەی یادەوەری. یادەوەری زیندوو، یادەوەری بەو سیفەتەی بریتییە لەژیانی دەروونی لەسنووری ئەوەی کە بەرەو خودی خۆی پێش دەکەوێت. هێزەکانی لیتیَ لەیەك کاتدا، دێن بوارەکانی مەرگ و، ناحەقیقەت و، نامەعریفە، پێکەوە دوو ئەوەندە دەکاتەوە. لێرەوە نووسین، بەلایەنی کەم وەکو ئەوەی

---

بکات، بەشێوەیەکی وا دەستی بەسەر دابگرێت بتوانێت دەستنیشانی ماناکەی بکات (خێر ـ شەڕ، ناوەوە ـ دەرەوە، ساختە ــ حەقیقی، جەوهەرو ــ ڕوخسار ... تاد). بڕیاری پاشا هەڵگری هەموو ئەو مانایانەیە، ئەفلاتونیش ماناکانی لەو بڕیارە پاشاییانە وەرگرتووە بەجۆرێك نووسین ــ فارماکۆن وا خراوەتە ڕوو کە لەنێو بازنەیەکی بۆش و بەتاڵی دەلالیدا دەخولێتەوە. لەدەرەوەڕا، نووسین یارمەتی مێشك و یادەوەری دەدات، لەناوەوەشدا نووسین خراپەو زانست بەرهەم ناهێنێت، بەڵکو تەنیا ڕاوبۆچوون بەرهەم دێنێت. حەقیقەت بەرهەم ناهێنێت، بەڵکو ڕوخسارێکی فریودەرەو هەڵمان دەخەڵەتێنێت و ڕوخسارمان لێدەکات بە حەقیقەت. (وەرگێڕی کوردی)

[1]) لیتیَ ــ Lethe خواوەندی بیرچوونەوەو لەبیرکردنە لەلای یۆنانییەکان. ناوی ئەم ڕووبارەیە کە لەجیهانی خوارەوەو ژێر زەویدا، ڕوحی مردووەکان دەچن ئاوی لێ دەخۆنەوە تاوەکو ژیانی خۆیان لەنێو دونیای سەرەوەیان لەبیر بچێتەوە، هەروەها ئەم ڕوحانەی تریش کە بەڵێنی ژیانێکی تریان پێدراوە تاوەکو بیرکردنەوەی مەرگ و مردنیان لەیادبچێت و لەبیریان نەمێنێت.

ڕوحەكان وا لێ دەكات لەیادیان بچێتەوە، ئەوە بەرەو لایەنی چەقبەستووی نا زیندوو و نامەعریفی ئاڕاستەمان دەكات.

بەڵام ناكرێت، بەلایەنی كەم لەئێستادا، بڵێین جەوهەرەكەی دێت تێكەڵاوی دروست دەكات لەنێوان مەرگ و ناحەقیقەتدا، چونكە نووسین خۆی جەوهەرێك و بەهایەكی تایبەتی نییە، ئینجا پۆزەتیڤ، یا نێگەتیڤ بێت. نووسین دێت خۆی وەكو هاوشێوە[1] پیشاندەدات، لاسایی قاڵبەكەی دەكاتەوە، لاسایی یادەوەری و، مەعریفەو، حەقیقەت و، ... تاد. بۆیە نووسەران لەبەردەم خواوەندا دەوەستن، وەكو زانایەك ــ sophoi و خوێندەوارێك نا، بەڵكو لەڕاستیدا، وەكو كەسانێك كە بانگەشەی ئەوە دەكەن گوایە زاناو فێربوون ــ doxosophoi. ئەوەش لەلای ئەفلاتون پێناسەی سۆفیستەكانە، چونكە ئەم شێوە دادگاییكردنەی نووسین، لەبنەمادا ئیدانەكردنی سۆفیستەكانەو دەشێت وا تەماشای بكەین كە بەشێكە لەم دادگاییە بێكۆتاییەی، بەردەوام ئەفلاتون بەناوی فەلسەفە، بەرانبەر بەسۆفیستەكان دایدەمەزرێنێت.

ئەم كەسەی كە پشت بەنووسین دەبەستێت و شانازی بەوە دەكات گوایە كۆمەڵێك تواناو مەعریفەی تایبەتی هەیە دەبنە هۆی ئەوەی بتوانێت ئەم كارە

---

[1] ) هاوشێوە ــ simulacre، بەزمانی یۆنانیش ــ simulakra، بەمانای وێنە، یا بت دێت. لەزمانی ئەدەبیشدا، ئەم وێنەیە كە لەبارەی شتێكەوە پیشاندەدرێت، بەبێ ئەوەی شتەكە خۆی بێت، وەهم، فیلْ، خەیاڵ، سێبەر، تارمایی، شێوەی شتەكەیە، نەوەكو خۆی بێت. لێرەدا ئێمە بەم مانایە وەری دەگێڕین تاوەكو جیای بكەینەوە لەلێكچوو، كە زۆر لێی نزیكە لەماناو ناوەڕۆكداو گوزارشتە لەلاساییكردنەوەی شتێك تا ئەو ڕادەیەی دەبێتە كۆپی ئەم شتە.

بکات، کەسێکی خۆ نمایشکەرە وەکو ئـەوەی تـامووس پـەردەی لەسـەر لادەدات. خـاوەنی هـەموو سـیماو سـیفەتەکانی سۆفیسـتەکانە، ئێمـەش لـەنێو دیـالۆگی سۆفیستەکاندا، دەبیـنین چـۆن وا وەسـف دەکرێـت بـەوەی گوایـە، لاسـایی زانـاو بیریاران دەکاتەوە ـ minetes tou sophou. ئەم کەسەش کە دەتوانین ناوی بنێین "ئەوەی لەمیانەی نووسینەوە بۆتە دەسەڵاتدار"،[1] هەر دەڵێـی برایـەتی و. زۆر لەهیپپیاس دەچێت وەکو ئەوەی لەنێو دیـالۆگی هیپیاسـی بچـووکدا دەبیـنین. کاتێك شانازی بەوە دەکات گوایـە هـەموو شـتێك دەزانێـت و، لەتوانایدایـە هـەموو کـارێکیش بکـات. بۆیـە دەبیـنین کاتێـك سـوقرات لـەنێو دوو دیالۆگـدا، دووجـار بەگاڵتەجارییەوە، خۆی واپیشاندەدات گوایە لەژمارەدا هەندێك شـتی بیرچـۆتەوە، ئەوە دەبینین هیپیـاس دێـت خـۆی وانمـایش دەکـات کـە لەهـەموو کەسـێك زیـاتر دەزانێت یارمەتی یادەوەری و بیرکەوتنەوەو بـەهێزکردنی بـدات، بگـرە ئـەوە ئـەم دەسەڵاتەیە کە لەهەموو شتێك زیاتر دەستی پێوە دەگرێت:

***"سوقرات: کەواتە لەئەنجامدا، لەنێو فەلەکناسیش مرۆڤ خودی خۆیەتی کە قسەی ڕاست دەکات، یا فێڵ و درۆ.***

***هیپیاس: ئەم قسەیەت پێدەچێت ڕاست بێت.***

***سوقرات: باشە، هیپیاس تا بەم شێوەیە بەرانبەر هەموو زانسـتێك ڕەفتـار بکە، دەبینیت کە لەلای هەموان هەر هەمان شـتەو، تـۆش لـەنێو هـەموو***

---

[1]) جاك دریدا ناوی دەنێت ـ graphocrate وەکو چۆن بەم کەسانە دەڵـێن تـەکنۆکرات کە لەمیانەی تەکنیك و مەعریفەوە، بەناوی تەکنیك و مەعریفە دەسەڵات دەگرنە دەسـت و پلەو پایە وەردەگرن.

زانستەکان، لەهەمووان بەتواناتری ـ sophotatos. من خۆم قسەی تۆم بیستووە کاتێك بارەشێنەیەکی ئێرەیی لابردنت نمایش دەکرد لەنێو کورەپانی گشتی لەنزیك دوکانی پارە گۆڕینەوەکاندا؟ لەوەش زیاتر، تۆ دەتگوت گوایە دەتوانیت هۆنراوەو، داستان و، تراژیدیاو، نازانم چەند شتی تریش و کۆمەڵێك گوتاری زۆرو نووسینی زۆرتریش لەهەموو جۆرێك بەرهەم بێنیت. لەبارەی ئەم زانستانەشەوە کە پێش کەمێك قسەم لەبارەیانەوە دەکرد، ئەگەر بیرم مابێت، تۆ گوتت لەهەموو کەس زیاتر سەرە دەری لێ دەردەکەیت، هەروەها گوتت گوایە لەبارەی ڕیتم و مەقامە مۆزیکییەکانیش دەزانیت، شتێکی زۆر لەبارەی سێنتاکس و زۆر شتی تریش دەزانیت. ئۆو!، پێم وایە من بەهێزکردنی یادەوەریم لەبیرچوو کە لەهەموو شتێك زیاتر شانازی پێوە دەکەیت و باسی لێوە دەکەیت، بێگومان زۆر شتی تریش هەن کە من هەوڵدەدەم، بەڵام بیرم ناکەوێتەوە! ئا، ئەوەتا دەمویست ئەوە بڵێم: لەنێو هەموو ئەم زانستانەی کە تۆ دەیانزانیت، کە زۆر زۆریشن! لەگەڵ هەموو زانستەکانیتر، ئایا ئێستا دەتوانی پێم بڵێیت، پاش ئەم هەموو شتەی ئێمە بەیەکەوە تێبینیمانکردن و، قسەمان لەسەر کردن، ئایا زانستێك دەزانی کە تێیدا ئەو کەسەی بەڕاستی دەدوێت، کەسێکی تربێت جگە لەوەی فێڵ و ساختەچێتی دەکات، باشە ئەوە هەر هەمان کەس نییە؟ فەرموو، بەهەموو تواناو فڕت و فێڵەکانی خۆتدا بگەڕێ، هەر شتێك کە حەزت لێیەتی. ئەی هاوڕێم، هیچ زانستێکی وا نادۆزیتەوە، چونکە زانستی وا بوونی نییە. ئەگەر پێت وایە هەیە، پێم بڵێ.

***هیپپاس: تا ئەم چرکەساتە ئەی سوقرات من هیچ زانستێکی وا بەدی ناکەم.***

***سوقرات: پێم وانییە هەرگیز ڕۆژێك لەڕۆژان زانستێکی لەم شێوەیە ببینیت. ئەگەر ڕاستم گوتبێت، ئەوە ئەی هیپپاس بزانە ڕۆژێك دێت ئەم قسانەی منت بیردەکەوێتەوە.***

***هیپپاس: ئەی سوقرات، بەوردی تێناگەم مەبەستت چییە؟***

***سوقرات: ڕەنگە لەبەرئەوە بێت کە تۆ تەکنیکەکانی خۆت لەبارەی یادەوەری بەکارنامێنیت ....".***

کەواتە، سۆفیست دێت هێماو ئامارژەکانی زانست دەفرۆشێت، نەوەکو خودی یادەوەری ــ mneme، دێت شوێنەوارو ــ hypomnemata، ئەرشیفی تۆمارکراوو، دۆکیۆمێنتەکان و، وێنەو، چیرۆك و، لیست و، تێبینییەکان و، کۆپی و، ڕۆژژمێرو، سەرچاوەو، درەختی نەسەب، دەفرۆشێت. یادگارییەکان دەفرۆشێت، نەوەکو یادەوەری. بەوەش وەڵامی داواکاری مرۆڤە دەوڵەمەندەکان دەداتەوە، لێرەشەوە زۆرترین چەپڵەی بۆ لێدەدرێت. دوای ئەوەش کە دان بەوە دادەنێت گوایە زۆرینەی هەواداره گەنجەکانی بەرگەی گوێگرتنی ناگرن، کاتێك دێت باسی لایەنی هەرە پاك و بێگەردی زانستەکەی خۆی دەکات ــ دیالۆگی هیپپاسی گەورە ـ ئەوە سۆفیست وا هەست دەکات پێویستە لەسەری هەموو نهێنییەکان بۆ سوقرات بدرکێنێت و باسیان لێوە بکات:

***" سوقرات: دەی خۆت پێم بڵێ، ئەم بابەتانە چین کە گوێت لێ دەگرن و چەپڵەت بۆ لێ دەدەن، من ناتوانم بیانخەمڵێنم.***

***هیپیاس: درەختی نەسەب ئەی سوقرات، درەختی نەسەبی پاڵەوان و پیاوەکان، چیرۆکی کۆنی چۆنییەتی دامەزراندن و بونیادنانی شارەکان، هەموو شتێك کە بەگشتی پێوەندی بەشتی کۆن و ڕابردووەوە هەبێت، بۆیە من بەهۆی ئەمانەوە، پێویستبوو لەسەرم بێم لێکۆڵینەوە لەهەموو ئەم بابەتانەدا بکەم.***

***سوقرات: شانست هەیە ئەی هیپیاس کە ئەوان حەز بەزانینی لیستی دەسەڵاتدارانی شارەکان[1] ناکەن هەر لەسۆلۆنەوە تاوەکو ئیمڕۆ، چونکە کارێکی زەحمەتە بتوانیت ئەم هەمووە ئەزبەر بکەیت و بیانخەیتە نێو مشێکت.***

***هیپیاس: بۆچی ئەی سوقرات؟ هەر ئەوەندە بەسە بەیەکجار پەنجا ناو ببیستم، تاوەکو هەموویان ئەزبەر بکەم.***

***سوقرات: ئەمە ڕاستە، بیرم چوو کە تەکنیکەکانی یادەوەری و بیرکەوتنەوە بواری کاری خۆتە ....".***

لەڕاستیدا، سۆفیست بانگەشەی ئەوە دەکات کە هەموو شتێك دەزانێت. فرەیی مەعریفەکەشی کە لەمیانەی چەند ڕوخسارێکدا دەردەکەوێت، لەسنووری ئەوەی کە نووسین یارمەتی پێشکەش دەکات بۆ بیرکەوتنەوە، نەوەکو بۆ یادەوەرییەکی زیندوو، بۆیە ئەمیش نامۆیە لەبەرانبەر زانستی ڕاستەقینەو پرۆسەی بیرکردنەوە لەجوولە تەواو دەروونییەکەیدا. هەروەها لەبەرانبەر

[1]) سوقرات باسی ئەرخۆنتەکان دەکات کە کۆی ئەرخۆنت ـ archonte دەکات، واتا سەرۆکی ئەنجومەنی شارەوانی شارەکانی یۆنان.

حەقیقـەتیش بـۆ سـەیرورەتی ئامادەگی و ئامـادەبوون ـــ یـا سـەیرورەتی ئامادەکردنی ئەم خۆی. نووسین دەتوانێت لاسایی هـەموو ئەمانـە بکاتـەوە، لەمـە زیاتری پێناکرێت.

ئێمە دەتـوانین ئـەوە ڕوون بکەینـەوە، بـەڵام خۆمـان لـەم فراوانبوونـە بـەدوور دەگرین. ئەوەی ئیمڕۆ لێرەدا نووسین ڕادەکێشێت بـەرەو پرسـیاری حەقیقـەت ـ تـاوەکو حەقیقـەت بخاتـە ژێـر پرسـیار، هـەروەها تـاوەکو هـزرو ئاخـافتنیش کـە پەیوەستن پێیەوە بخاتە ئەم خانەیە، پێویسـتە لەسـەری، واتـا لەسـەر کێشـەکە. زیندوو بێتەوە بەبێ ئەوەی لەگەڵ ئەم یـا ئـەو یـەکبگرێت، بـەبێ ئـەوەی پیشـانی بـدات و ئاماژەیـەکی هـەبێت لەسـەر جـەنگ لـەنێوان سوفیسـتەکان و فەلسـەفە. بەگشتیش دەکرێت بڵێین هەموو ئەو بنەمایانەی کە ئەفلاتونیزم ڕایگەیاندوون.

ئێمە لەزۆر ڕوانگەوەو لەزۆر گۆشەوە کاتێك هەموو مەیدانەکەمان لێ دیار نییـە، ئیمڕۆ دێـین ئێوارەخـوانێکی ئەفلاتونییانـە ئامـادە دەکـەین ـ واتـا پـێش ئـەوەی خواردنەکە دەسپێبکەین. ئێوارەخوانێك، ئەگـەر بەشـێوەیەکی سروشـتییانە بـیری لێبیکەینـەوە، دەبێتـە نیوەڕۆخـوانێکی هێگلییانـە. ئـا لـەم خاڵـەدا، هـەر یـەك لەفەلسەفەو ئەپستیم ـ مەعریفـە، سـەراوژێرو ڕەتکـراوەو کـۆنترۆڵکراوو .... تـاد، نـابن بـەناوی شـتێك کـە ڕەنگـە نووسـین بێـت، بگـرە ئەمانـە هـەردووکیان تـەواو بەپێچەوانەوەو بەپێی ئەم پێوەندییەی کە فەلسەفە ناوی دەنێت هاوشـێوەیی، یا بەپێی ئـەم پڕبوونـە[1] زۆرو زیرەکانـەی ئێسـتای حەقیقـەت، مەعریفـەو فەلسـەفە

---

[1]) لێـرەدا ئـەوەی دریـدا ئامـاژەی بـۆ دەکـات لەمیانـەی بـەکارهێنانی زاراوەی پڕبـوون ـــ excesـ، بریتییە لەهەموو ئەم جووڵەو بزاڤە زیادو توندڕەوانەی شتێك دەبـەزێنن و تێـی

خۆیـان دەبیننــەوە کــە پێـی هەڵدەســتن، لەهــەمان کاتیشـدا گواسـتراونەتەوەو دواخراون بۆ بوارو کایەیەکی تەواو جیاواز کە هــەر ئەوەنـدەمان هەیـە ئێمـە تێیـدا لاسـایی مەعریفـەی ڕەهـا بکەینـەوە وەکـو ئـەوەی جۆرج باتـای ــ Georges Bataille ئاماژەی بۆ دەکات، لێرەدا ناو هێنانی جۆرج باتای یـەك لیسـتی دوورو درێژ سەرچاوەمان لەکۆڵ دەکاتەوە.

هێڵـی گـەرمی جـەنگ کـە بەتوونـدی لـەنێوان ئەفلاتونییـەت و سوفیسـتەکاندا کێشراوە، دوورە لـەوەی یـەککگرتوو و، بـەردەوام بێـت وەکـو ئـەوەی لـەنێوان دوو جهیانی گونجاودا هـەبێت. بەشـێوەیەك کێشـراوە لایەنـە نـاکۆك و دژەکـان پارچـە پارچە نەکات، بەهۆی نا ـ دەستنیشانکردنیشی بەدوایەکدا هاتووشـدا، بـەردەوام شوێنگەکانی خۆیان دەگۆڕن و لاسایی شێوەو فۆڕمـەکانی لایـەنی دژ دەکەنـەوەو،

---

دەپەڕێنن، یا لەگەڵیدا هاوشان دەبن و دەڕۆن. وەکو ئەوەی پێشتریش لەپەراوێزێکدا هەر لەم بەشە ڕوونمان کردەوە، ئەوە جوولەو بزاڤێـك نییـە لـەدەرەوەڕا سـەپێنرابێت، بـەڵکو ئـەنجامی پڕبـوونی شـتەکەیە تـا ڕادەی نقوومبـوون لـەناوی بـەجۆرێك چـیتر توخمـەکانی جێگایـان نابێتــەوە، ئــەوەش پاڵیــان پێــوە دەنێــت بــۆ پڕبــوون و شــکاندنی ســنوورو چوارچێوەکان. مەبەست لەزاراوەی پڕبوون لـەنێو ئـەم بڕگەیـەدا، شـیکردنەوەی ڕەوشـی ئێسـتای فەلسـەفەیە، چـونکە زیـادەو پڕبـوونێکی زۆری حەقیقـەت هەیـە کـە ئـەنجامی کەڵەکـەبوونی هــەوڵ و کۆششــی زۆری فەلســەفییە، بــەجۆرێك لەئێســتادا بەشـێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بزاڤی پڕبوون سەرهەڵدەدات لەنێویدا و دەیبەزێنێت. ئەم حاڵەتە لەلای جۆرج باتای بریتییە لەفرەیی ڕۆشنایی کە لەئەنجامی حاڵەتی کوێرایی و نا زانستی دادەبارێـت و مرۆڤ بەرەو گەمژەیی دەبات. ئا لەم ئاستەدا، دەشێت لاسـایی مەعریفـەی ڕەهـای هێگڵـی بکەینەوە، بەبێ ئەوەی بەتـەواوی لێـی شـارەزابین، مـادام وەهمـی خـۆی بەرهـەمهێناوە، جوولەو بزاڤێك کە دەتوانێت ببیبەزێنێت و لێی تێپەڕێنێت و لێی پڕبێت.

ڕێگاکانی ئەو دەگرنەبەر. بۆیە، ئەم شێوە جێگۆڕکێیەی نێوانیان مومکینە. ئەگەر پێویست بێت لەسەری لەبوارو کایەیەکی هاوبەشدا وێنابکرێت، ئەوە دابڕانەکە بەشێوەیەك دەبێت هەموو جۆرە جیاوازییەك لەسۆفیستیزم و ئەفلاتونیزم، بەرەو تاریکی ڕەهایان دەبات.

بەپێچەوانەی ئەم ڕایەی ئێستا خستمانە ڕوو، ئێمە هۆکاری باشیشمان هەیە بۆ ئەوەی وا بیربکەینەوە ئەو دادگاییکردنەی بۆ نووسین دابەستراوە، بەپلەی یەکەم سۆفیستەکانی نەکردۆتە ئامانج. بەڵکو بەپێچەوانەوە، هەندێکجار وا دێتە بەرچاو وەکو ئەوەی ئەم حاڵەتە لەخودی سۆفیستەکانەوە سەری هەڵدابێت. ئەری باشە ڕاهێنانی یادەوەری لەبری خۆبەستنەوە بەجێکەوتی دەرەکی، ئەوە تاکە ئامۆژگارییە گرنگ و کلاسیکییەکەی سۆفیستەکان نەبووە؟ کەواتە، ئەوەی ئەفلاتون لێرەدا وەکو هەر جارێکیتر دەیکات، بریتییە لەهەڵگێڕانەوەی پاساوێك کە لەبنەمادا هی سۆفیستەکانە، بۆیە لێرەدا دەشێت هەڵیبگێڕێتەوەو بەرانبەریان بەکاری بێنێتەوە. لەشوێنێکی دوورتریشدا لەپاش بڕیاری شاهانە، ئەوە هەموو گوتاری سوقرات کە دواتر یەکە بەیەکە وردیان دەکەینەوە، دەبینین لەوێنەو چەمکێك هەڵچنراوە کە خۆی لەلایەن سۆفیستەکانەوە دەرچووە.

کەواتە، پێویستە بەوردی سنووری جیاکارو دابڕاو بناسین، باش ئیدراکی ئەوە بکەین، ئەم خوێندنەوەیە بۆ ئەفلاتون، بڕیارێك نییە لەهیچ چرکەیەکدا، لەژێر دروشمی "گەڕانەوە ـ بۆ ـ سۆفیستەکان" درابێت.

بەم شێوەیە، لەهەردوو حاڵەت و لەنێو هەردوو بەرەدا، گومانێك هەیە لەنووسین و، ئامۆژگارییەك هەیە بۆ وریابوونێکی ڕاهێنراوی یادەوەری. بۆیە،

ـەوەی ئـەفلاتون ڕەخنـەی لێ دەگرێـت لـەلای سۆفیسـتەکان، گەڕانـەوە نییـە بـۆ یادەوەری، بەڵکو شێوەی ئەم گەڕانەوەیەیە کە وا دەکات چالاککردنی یادەوەری، جێگای یـادەوەری زینـدوو بگرێتـەوە، وەکـو ئـەوەی شـتێکی ئەلتـەرناتیڤ بێـنێن ناوەکو جێگای شتە ئەسڵییەکە بگرێتەوە، ئـەوەی لێـرەدا هەڵـەو لادانـە، بریتییـە لەم کردەیەی ئالوگۆڕی ئەسڵی بەکۆپی، هێنانی ئەزبەرکردنی میکانیکییانـەی نێـو دڵ، تـاوەکو جێگـای بیرکردنـەوەی تـازەو، بەرهـەمهێنانی مەعریفـەو، سـەرلەنوێ دروستکردنەوەی ئەم مەعریفەیە لەئێستادا، بگرێتەوە.

سـنوورو جیـاوازی نێـوان نـاوەو دەرەوە، نێـوان زینـدوو و مـردوو، بەئاسـانی لەمیانـەی جیاکـاری نێـوان نووسـین و ئاخافتنـدا دروسـتناکرێت، بـەڵکو لـەنێو یادەوەریشدا دەبێت وەکـو ئـەوەی کـە ئامادەگی بەرهـەم دێنێتـەوە، سـەرلەنوێ بیرکردنەوەو یادکردنەوە بەرهەم دێنێتەوە وەکو دووبارەکردنەوەیەك بـۆ جێکـەوت لـەنێوان هێمـاو حەقیقـەت، بوونـەوەرو قاڵـب. سـنوورەکانی دەرەوە، بـەم شـتانە دەست پێناکات کە ئێمە ئیمڕۆ ناویان دەنێین لایەنی دەروونی و جەستەیی، بەڵکو لەو خاڵەوە دەست پێدەکات کە تێیـدا ڕێگـا بـەیادەوەری دەدرێـت لـەبری ئـەوەی خودی خۆی ئامادە بێت لەنێو ژیانی خۆیـدا وەکـو بزاڤێـك بـۆ حەقیقـەت، دەڵـێین ڕێگا بەوە دەدات ئەرشیف بێت جێگـای ئـەم بگرێتـەوەو، هێمـای بیرکەوتنـەوە — re-memoration دووری بخاتەوەو بەلاوەی بنێت.

پانتـایی نووسـین، پانتـایی وەکـو نووسـینێك، لەبـەردەم ئـەم کـردەو پرۆسـە توونـدوتیـژەی نوێنـەراتیکردن و جیـاوازی نێـوان یـادەوەری و یادکردنـەوە — بیرکەوتنـەوە، ئـەوە پانتـایی نووسـین دەکرێتـەوە. دەرەوە، پێشـتر لـەنێو کـاری

یادەوەریدا هەبووە، خراپیش دزە دەکاتە نێو پێوەندی یادەوەری بەخودی خۆی و شێوازی ڕێکخستنی گشتی پرۆسەی یادەوەری. یادەوەری خۆی لەجەوهەرد بێکۆتایی نییەو سنوورداره، ئەفلاتونیش دان بەوە دادەنێت کاتێك ژیانی پێدە بەخشێت. بینیمان چۆن وەکو هەر کیانێکی هەستی سنووری بۆ دەکێشێت. ئینجا هەر یادەوەرییەك بێ سنوور بێت، نابێتە یادەوەری، بەڵکو دەبێتە ناکۆتایی ئامادەگی لەنێو خوددا. سەرئەنجام، یادەوەری بەردەوام پێویستی بەهێماو ئاماژە هەیە تاوەکو نا ـ ئامادەگی ڕاکێشراو بۆ خۆی بیر بکەوێتەوە، بەڵگەش لەسەر ئەم بۆچوونە، بزاڤی دیالیکتیکە.

بەم شێوەیە یادەوەری، ڕێگا بەیەکەم دەرەوەی خۆی دەدات، یەکەم جێگری خۆی، کە بریتییە لەپرۆسەی بیرکەوتنەوە، بۆ ئەوەی بیبەزێنێت و دژایەتی بکات. بەڵام ئەوەی ئەفلاتون بیری لێ دەکاتەوە، بریتییە لەیادەوەرییەك بەبێ هێما، واتا بەبێ زیادە، یادەوەرییەك بەبێ بیرکەوتنەوە، بەبێ فارماکۆن. ئەوە لەهەمان ئەم چرکەساتەداو لەبەر هەمان هۆکاریش کە پاڵی پێوەدەنێن، تێکەڵاوی نێوان گریمانەیی و نا گریمانەیی لەنێو سیستەمی ماتماتیکیدا بەخەون ناو ببات.

بەڵام بۆچی زیادە ـ Le supplement مەترسیدارە؟ ئەگەر بکرێت بشێت بڵێین، خۆی لەخۆیدا مەترسیدار نییە، لەوەشدا مەترسیدار نییە وەکو بوونێك ـ ئێستا لەشتێك نزیك دەکەوێتەوەو خۆی نمایش دەکات، چونکە لەم حاڵەتەدا دەبێتە جێگای دڵنیایی. زیادە لێرەدا بوونەوەر نییە، بوونی نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، ناتوانین بڵێین نییە. جێگۆڕکێ و خزینی، لەنێوان ئامادەگی و نا ئامادەگیدا، ئێرە جێگای مەترسییەو ئەوەیە وا دەکات زۆرجار وەهمی ئەوە

بەرهەم بێنێت گوایە ئەسڵە. هەر کاتێك دەرەوەی زیادەیەك کرایەوە، بەردەوام بونیادەکەی وا دەخوازێت خۆی لەقاڵب بدات بەپێی پێویست و، خۆی بگۆڕێتەوە بەهاوشێوەکەی و، ببێتە زیادەی زیادە، ببێتە کارێکی مومکین و پێویست. پێویست، چونکە ئەم جوولەو بزاڤە هەوا ڕووداوێکی هەستی هەڕەمەکی نییە، بەڵکو پەیوەستە بەئایدیالییەتی ئایدیا ـ eidos وەکو توانای دووبارەکردنەوەی هەمان شت.

نووسین لەلای ئەفلاتون ـ دوای ئەمیش بۆ هەموو ئەم فەلسەفەیەی کە لەنێو ئەم بزاڤەدا دروست دەبێت ـ دەڵێین وەکو ڕاکێشانێکی بەناچاری وایە بۆ دوالیزم: زیادەی زیادە، دالی دال، نوێنەری نوێنەر، ... تاد، زنجیرەیەك کە هێشتا پێویست ناکات هیچی لێ ببڕین و کەم بکەینەوە، بەڵام دواتر ئەم کارە دەکەین، بەوەی دێین زاراوەو چەمکی یەکەم دەسڕینەوە، یا بابڵێین بونیادی یەکەم و، پیشانی دەدەین کە توانای کورتکردنەوەی تێدا نییە. ئاساییە کە بونیادی نووسینی دەنگی و مێژووەکەی، ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەیان بینیوە لەدەستنیشانکردنی نووسین وەکو هێمایەکی دوالیزمی ـ دووانە، وەکو هێمایەك بۆ هێما، دالێك بۆ دالی دەنگی. لەکاتێکدا دەنگ لەنزیکیدا خۆی وەکو ئامادەگی زیندوو لەنێو یادەوەری و دەروونی نمایش دەکات، ئەوە دالی نووسراو کە ئەم بەرهەم دێنێت و لاسایی دەکاتەوە، بەڕادەی یەك پلە دوور دەکەوێتەوەو دەکەوێتە دەرەوەی ژیان، بەم شێوەیەش لەگەڵ خۆیدا ئەمیش ڕادەکێشێت بۆ دەرەوەی خودی خۆی و دەیخاتە حاڵەتی بێهۆشی لەنێو هاوشێوە لاساییکراوەکەیەوە. ئالێرەدا ئەم دوو زیانەی فارماکۆن دەردەکەوێت: لەلایەك یادەوەری پەك دەخات، ئەگەر فریاگوزاریش

بێت، هەر ناتوانێت یارمەتی یادەوەری بدات بۆ بیرکەوتنەوە. لەبری ئەوەی لەئەسڵدا ژیان بەئاگا بێنێت، لەکەسایەتیدا، هەر ئەوەندەی لەدەست دێت پاشماوەکانی چاك بکاتەوە.

ژەهرێکە یادەوەری لاواز دەکات، چارەسەرییەکە بۆ چاکردنەوەی هێما دەرەکییەکان، بۆ سیماکانی ـ symptomes، لەگەڵ هەموو ئەم مانایانەی کە ئەم وشەیە لەنێو زمانی یۆنانیدا هەڵگریەتی: ڕووداوێکی لەناکاو، شتێکی تێپەڕو کاتی، ڕووداوی کەوتن بەگشتی، داڕمان و داڕووخان، جیاکاری، وەکو ئاماژەیەك بۆ ئەوەی ئاماژەی بۆ دەکات. "نووسینەکەت تەنیا دەتوانێت شتە تێپەڕو لابەلاکان چاك بکاتەوە"، ئەوە قسەی ئەم پاشایەیە کە ئێمە قەرزاری ئەوین لەو مەعریفەیەی هەمانە لەبارەی جیاوازی نێوان جەوهەری تێپەڕو، جەوهەری ئاماژە بۆ کراو، بەوەی کە نووسین دەگەڕێتەوە بۆ سیستەمێك لەدوالیزمی.

بەم شێوەیە، لەگەڵ ئەوەی نووسین بەڕانییە[1] بەپێوانە لەگەڵ یادەوەری کە جەوانییە،[2] ئەگەرچی بیرکەوتنەوە یادەوەری نییە، بەڵام خۆی لێ دەخشێنێت و

---

[1]) وەرگێڕی عەرەبی ئەم زاراوەیەی بەکارهێناوە، ئێمەش لێرەدا بۆ گەیاندنی ماناکەی، هەمان زاراوەمان داناوەتەوە. بەڕانی زاراوەیەکە لەئەسڵی بر ـ خاك، یا زەوی وەرگیراوە، بەو مانایەی بەرانی دەبێتە خاکی، یا لایەنی دەرەکی و ڕوخساری پرسێك. (وەرگێڕی کوردی)

[2]) وەرگێڕی عەرەبی ئەم زاراوەیەی بەکارهێناوە، ئێمەش لێرەدا بۆ گەیاندنی ماناکەی، هەمان زاراوەمان داناوەتەوە. جەوانی زاراوەیەکە لەئەسڵی جوـ ئاسمان وەرگیراوە، بەو مانایەی جەوانی دەبێتە پێچەوانەو ناکۆك لەگەڵ زاراوەی بەڕانی و بەمانای ناوەوە بەکاردێت. ناوەڕۆکی شتێك، ناوەوەی. (وەرگێڕی کوردی)

ەناوەوەی خۆیدا دەیخەوێنێت. ئەوە کاریگەری ئەم فارماکۆنەیە. مادام نووسین ەڕانییە، ئەوە پێویستە خۆی لەناوەڕۆکی یادەوەری دەروونی نەخشێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا، وەکو ئەوەی ڕۆسۆو سۆسێر پێی هەڵدەستن بەپێی پێویستی کارەکەیان و، بەبێ ئەوەی ئاماژە بۆ ئەوە بکەن کە پێوەندی تر هەیە لەنێوان جەوانی و بێگانەدا، ئەوە ئەفلاتون جەخت دەکاتە سەر بەڕانییەتی نووسین و، توانای لەسەر دزەکردنی زیانبەخشانە کە دەتوانێت خۆی بگەیەنێتە قووڵایی، یا تەنانەت زیان بەدوژمنەکانیشی بگەیەنێت.

فارماکۆن ئەم زیادە مەترسیدارەیە کە لەمیانەی دزەکردنێکی تێکشکێنەرانەدا خۆی دەگەیەنێتە ئەم شتەی کە پێشتر دەیویست دەسبەرداری بێت، ئەم شتەی کە لەهەمان کاتدا، ڕێگای پێدەدات بیبڕێت و توونودتیژی بەرانبەر ئەنجام بدات، خۆی لێ تێربکات و جێگای ئەمیش بگرێتەوە.

ئێمە لەبری ئەوەی بێین لەم بونیادە ڕابمێنین کە وا دەکات ئەم زیادەیە مومکین بێت، بەتایبەتیش لەبری ئەوەی ڕابمێنین لەم کورتکرنەوەیەی هەر یەك لەئەفلاتون و ڕۆسۆو سۆسێر، [1] بێهوودە دەیانەوێت لەنێو بیرکردنەوەیەکی نامۆدا

---

[1]) دریدا، لەپاڵ گرنگیدانی بەڕۆڵی ئەفلاتون لەبارەی زمان، لێرەدا ئاماژە بۆ ڕۆڵی گرنگی هەریەك لەڕۆسۆو سۆسێر دەکات، چونکە توێژینەوە زمانەوانییەکان لەبەرەو پێشڤەچوونی خۆیاندا زۆر چەمك و دەلالەتی کۆنیان نەوەکو هەر بەلاوە نا یا گۆڕی، بەڵکو سەراوژێریان کردەوە، ئەو توێژینەوانەی لەبنەچەدا بۆ جان جاك ڕۆسۆی هزرڤانی فەرەنسی دەگەڕێتەوە، پاش ئەوەی لەهەنگاوێکی بوێرانەدا، کتێبی (بنەچەی زمانەکان) ی نووسی. دواتریش توێژینەوە زمانەوانییەکان هەر بەردەوام بوون، بەڵام خاڵی سێنتەرو پڕ لەگۆڕانی

ملکەچی بکەن، ئەوە ئێمە هەر بەوەندە دەوەستین کە بێین دژکاری لۆژیکی ڕوونبکەینەوە. لێرەدا پێویست دەکات شارەزایی پەیدا بکەین لەبارەی "لۆژیکی داس" کە ناسراوەو فرۆید لەنێو کتێبی "شیکردنەوەی خەونەکان" بەکاری دێنێت بۆ ڕوونکردنەوەی لۆژیکی خەون. ئەو کەسەی کە بەرگری دەکات لێرەدا، دەیەوێت هەموو دەرفەتەکان لەبەردەم خۆیدا بکاتەوەو بەکراوەیی بەجێیان بێلێت، بۆیە دێت کۆمەڵێك پاساوی دژکار کەڵەکە دەکات:

١) ئەم داسەی بۆتی دێنمەوە، تازەو نوێیە.

٢) ئەم کونانەی کە تێیدایە، هی پێش ئەم کاتەیە کە من بیبەم.

٣) ئینجا تۆ هەرگیز داست نەداوەتە من.

بەهەمان شێوە، ئێمە دەبینین کە:

١) نووسین بەتەواوی بەڕانییە و ئاستنزمە، بەپێوانە لەگەڵ یادەوەری و ئاخافتن کە زیندوون، ئەوانەی کە هەرگیز ناکەونە ژێر کاریگەری ئەم.

٢) زیانبەخشە بۆ یادەوەری و ئاخافتن، چونکە لەدووری نووسین ئەوان سەلامەت دەبن. چیتر کون و کەلەبەر لەنێو یادەوەریدا بوونی نابێت. لەنێو ئاخافتندا نابێت ئەگەر نووسین نەبێت.

٣) ئەگەر ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ بیرکەوتنەوەو نووسین، لەبەرئەوە نییە کە بەهایەکی تایبەتیان هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە یادەوەری زیندووی

---

بابەتە زمانەوانییەکان لەگەڵ فردیناند دی سۆسێر دەست پێدەکات، بەتایبەتیش کتێبە ناودارەکەی (زمانزانی گشتی). (وەرگێڕی کوردی)

سنووردارەو هەر لەسەرتاوە كۆمەڵێك كون و كەلەبەری تێدایە، پێش ئەوەی نووسین لەمیانەی جێكەوتەكانیدا مۆری بكات. نووسین هیچ كاریگەرییەكی بەسەر یادەوەریدا نییە شایانی باس بێت.

مانای وایە بەرانبەر یەكتری دانانی یادەوەری و بیركەوتنەوە، دەگەڕێتەوە بۆ مانای نووسین. ئەوەش ڕوون دەكەینەوە كە چۆن ئەم جۆرە بەرانبەریەكتری دانانە سیستەمێكی تازە پێكدێنێت بۆ هەموو بەرانبەریەكتری دانانە بونیادییە گەورەكان، هەر لەسەردەمی ئەفلاتونەوە تا ئێستا. ئەوەی لێرە لەم سنوورەدا بڕیاری لەسەر دەدرێت لەنێوان ئەم دوو چەمكەدا، وەكو مەزنترین بڕیاری فەلسەفە وایە، ئەوەی كە لەسایەی ئەم بڕیارەوە دژكاری دادەمەزرێت و بەرهەم دێت و گەشە دەكات.

سنووری نێوان یادەوەری و بیركەوتنەوە، نێوان یادەوەری و زیادەكەی، بەردەوام زەحمەتە ببنرێت و دەسگیربكرێت. لەئەم پەڕی سنوورەكەوە تا ئەو پەڕی سنوورەكەی، كۆی گشتی پرسەكە پێوەندی بەدووبارەبوونەوە هەیە. یادەوەری زیندوو ئامادەیی ئایدیا دووبارە دەكاتەوە، حەقیقەتیش خۆی بریتییە لەتوانای دووبارەبوونەوە لەمیانەی بیركەوتنەوەوە. حەقیقەت دێت پەردە لەسەر ئایدیا، یا هەبووی حەق ـ ontos on لادەدات، واتا ئەوەی دەشێت لاسایی بكرێتەوەو سەرلەنوێ بەرهەم بهێنرێتەوەو لەناسنامەیدا دووبارە بكرێتەوە. بەڵام لەبزاڤی بیرخستنەوەی حەقیقەتدا، پێویستە لەسەر ئەم شتەی كە دووبارە دەكرێتەوە، وەكو خۆی لەنێو دووبارە بوونەوەكەدا ئامادەگی هەبێت، وەكو ئەوەی دەبێت خۆی هەبێت. شتی حەقیقی خۆی دووبارە كراوەیە، دووبارە

کراوەیە لەدووبارە کردنەوەو نمایندەی نمایندەکراوە لەنێو نمایندەدا. حەقیقەت دووبارە کراوەی دووبارە بوونەوە نییە، دالی دەلالەت نییە، بەڵکو حەقیقی بریتییە لەئامادەگی ئایدیای دەلالەت لێکراو.

ئەویش هەر وەکو دیالیکتیک کە بریتییە لەبڵاوبوونەوەی بیرکەوتنەوە، سۆفیستیزمیش کە بریتییە لەبڵاوبوونەوەی بیرکەوتنەوە، ئەمیش گریمانی توانای دووبارە بوونەوە دەکات. بەڵام ئەمجارەیان لەلایەنەکەی ترەوە ئەم دووبارە کردنەوەیە ئەنجام دەدات. ئەگەر بشێت بڵێین، لەلایەن و ڕوخسارەکەی ترەوە، لەلایەنی دەلالەتەوە. ئەوەی دووبارە دەبێتەوە، هەر خۆی دووبارە بۆوەیە، لاساییکراوەیە، دالە، نمایندەیە، ئەگەر بۆنەکەش پێویست بکات، ئەوە لەمیانەی نا ئامادەگی شتەکە خۆی کە وا دەردەکەوێت وەکو ئەوەی هەموو ئەمانە دووبارەی دەکەنەوە، بەبێ زیندەداری دەروونی و یادەوەرییانە.

لەم ڕوانگەیەوە، ئەوە نووسینە وا دەکات دال بەتەنیا خۆی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکییانە بتوانێت دووبارە بێتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ ڕوحێکی زیندوو پشتگیری بکات و پاڵپشتی بێت لەم دووبارە بوونەوەیەیدا، واتا بەبێ ئەوەی حەقیقەت بێتە پێشەوەو ئامادەگی هەبێت لەهیچ شوێنێکدا. لێرەدا، هەر یەك لەسۆفیستیزم و بیرکەوتنەوەو نووسین، جیاکراوەو دابڕاو نین لەفەلسەفە و دیالیکتیك و یادکردنەوەو ئاخافتنی ڕاستەوخۆ، تەنیا بەو ڕاددە تەنکە نەبێت کە نابینرێت، خەریکە نابێت، کاغەزێك کە بوونی هەیە لەنێوان دال و مەدلولدا. "کاغەز": ئەم خوازەیەی پێویستە وریابین لەوەی خۆی خوازەیەکی دالییە، یا بەمانایەکی تر، خوازراوێکی ڕوخساری دالە، مادام ئەم کاغەزەی ڕوخساری هەیە،

هەر لەسەرەتاوە خۆی وا ڕادەگەیەنێت کە ڕوخسارێکە هەڵگری نووسینە. بەڵام لەهەمان کاتیشدا، ئایا یەکێتی ئەم کاغەزە، یەکێتی سیستەمی ئەم جیاوازییەی نێوان دال و مەدلول، ئەمیش نابێتە هۆی ئەوەی ئەستەمی بکات سۆفیستیزم و فەلسەفە دابېڕێن و لەیەکتری جیا ببنەوە؟ بێگومان جیاوازی نێوان دال و مەدلول ئەو وێنە ئاراستەکراوەیە کە لێیەوە ئەفلاتونیزم دادەمەزرێت و دژکاری خۆی لەگەڵ سۆفیستیزم دیاری دەکات. فەلسەفەو دیالیکتیك کاتێك دێن بەم شێوەیە دەسپێدەکەن، ئەوە لەمیانەی ئەم دەستنیشانکردنەدا، خۆیشیان دەستنیشان دەکەن.

ئەنجامی یەکەمی ئەم تێوەگلانە قووڵەی دابڕان: دیالۆگی فیدرۆس لەدژی نووسین، دەتوانێت هەموو سەرچاوەکانی خۆی لەئیزۆقرات ــ Isocrate، یا ئەلسیداماس ــ Alcidamas بخوازێت، لەم چرکەساتەدا کە دێت چەکەکانی خۆی بەرەو سۆفیستیزم وەردەگێڕێت. ئەفلاتون دێت لاسایی لاساییکەرەوەکان دەکاتەوە، تاوەکو حەقیقەتی لاساییکردنەوەی خودی حەقیقەت لاسایی بکاتەوە. بەڕاستیش هەر تەنیا حەقیقەت وەکو ئامادەگی ئامادەبوون، لێرەدا توانایەکی جیاکارییانەی هەیە. ئەم توانا جیاکارییەی حەقیقەتە کە دەتوانێت جیاوازی نێوان دال و مەدلول، ئاراستە بکات. یا ئەگەر پێتان خۆشە دەڵێین ئەم جیاوازییە لەلایەن ئەمەوە ئاراستە دەکرێت و بەردەوامیش دەبێت و ئەستەمیشە لێی جیابکرێتەوە. بەهەرحاڵ، خودی ئەم جیاکارییە ونتردەبێت تاوەکو لەکۆتاییدا وای لێ دێت ناتوانێت خودی شتەکە لەخودی خۆی جیابکاتەوە، لەم هاوشێوەییە

جیای بکاتەوە کە ئەستەمە دەستنیشان بکرێت. بزاڤێکە، هەر هەمووی بەتەواوی لەنێو بونیادی ئاڵۆزی فارماکۆن و هەڵگەڕانەوەکەیدا ڕوو دەدات.[1]

پیاوی دیالیکتیك،[2] چۆن قسە لەگەڵ ئەم کەسە دەکات کە خۆی وا ئیدانەی دەکات گوایە پیاوێکی لاساییکەرەوەیە، پیاوێکی هاوشێوەیە؟ لەلایەك سۆفیستەکان خۆیان وەکو ئەفلاتون، خەڵکیان ئامۆژگاری دەکرد ڕاهێنان بەیادەوەرییان بکەن. ئەمان ئەم کارەیان دەکرد، چونکە وەوك بینیمان لەپێناو توانای ئاخافتن و قسەکردن بوو، بەبێ ئەوەی مەعریفەیان هەبێت، گێڕانەوەیەك بەبێ حیکمەت، بۆ بەدەستهێنانی خاڵ بوو نەوەکو خۆسەرقاڵکردن بە بەدەستهێنانی حەقیقەت. بگرە ئەمان دەیانویست هێماو خاڵ بەخەڵك بفرۆشنەوەو خۆیان دەربخەن، بەمەش سۆفیستەکان بەڕاستی پیاوی نووسین بوون، ئەوە لەکاتێکدا خۆیان ئەمە ڕەتدەکەنەوە. بەڵام لەلایەکی تریشەوە، ئەرێ باشە ئەفلاتون خۆیشی ئەم کارە ناکات؟ لەبەرئەوەنا کە ئەم نووسەرە، ئەوەش پاساوێکی زۆر لاوازە دواتر ڕوونی دەکەینەوە، لەبەرئەوەش نا کە ناتوانێت، ئەو بەکردەوەو بەڕاستیش، ناتوانێت دیالیکتیك ڕوون بکاتەوە، بەبێ ئەوەی هانا بۆ نووسین ببات، لەبەرئەوەش نا کە پێی وایە دووبارە بوونەوەی هەمان شت پێویستە بۆ بیرکەوتنەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی پێی وایە ناکرێت دەسبەرداری بێت

---

[1] ) هەر کاتێك باسی هەڵگەڕانەوەی فارماکۆن دەکرێت، مەبەست لێی ئاوەژوو بوونەوەو توانای هەڵگەڕانەوەیەتی بەسەر یەکێك لەماناکانی خۆیدا کە ڕەنگە دژیش بێت.

[2] ) لێرەدا جاك دریدا ئەفلاتون بەپیاوی دیالیکتیك ناو دەبات وەکو نازناوێك بۆی بەکاردینێت. (وەرگێڕی کوردی)

وەکو وێنەیەکە لەسەر قاڵبێك، یا نەخشێکە ـ ئەوەی جێگای سەرنجە، ئەوەیە کە قاڵب (tupos) بەتەواوی دەگونجێت لەگەڵ مۆری نووسراو (قاڵبی پیتی نووسراو) وەکو ئایدیایەکیش کە مۆرك و تەرزێکە دەشێت پێڕەو بکرێت. لەم بارەیەوە نموونە زۆرە، بڕوانە کتێبی (کۆمار) ی ئەفلاتون.

ئەم پێویستییە یەکەم بۆ سیستەمی یاسا دەگەڕێتەوە، وەکو ئەوەی لەنێو دیالۆگی (یاساکان) دا خراوەتە ڕوو. لەم حاڵەتەدا، ناسنامەی جێگیرو چەقبەستووی نووسین ناخرێتە سەر ئەم یاسایەی کە هەیە، یا ئەم یاسایەی وا وەسفکراوە گوایە نیمچە لاڵ و گەمژەیە، بەڵکو ئەوەیە کە گرێنتی بە بەردەوامبوونی دەدات ـ واتا بنەماو یاسا ـ و ناسنامەی وشیاری و ئاگادارییەتی پارێزەرەکەیەتی کە دەیپارێزێت. نووسین ئەم جۆرە پارێزەرەیە، پارێزەرو پاسەوانێکی تری یاسایە کە گرێنتی ئەوەمان بۆ دەکات هەر کاتێك حەزمانکرد، بگەڕێینەوە سەری، هەر چەندجاریش کە بمانەوێت بگەڕێینەوە بۆ ئەم شتە ئایدیالییەی کە ناوی یاسایە.

بەم شێوەیە ئێمە دەتوانین بیپشکنین، بەقسەی بێنین، ڕاوێژی پێبکەین، بیخەینە ئاخافتن بەبێ ئەوەی ناسنامەکەی تێکبدەین و لەباری ببەین. ئەوەش هەمان ئەم قسانەیە، بەتایبەتیش یارمەتی و بەهاناوەهاتن، یا فریاکەوتن — boetheia کە لەنێو گوتاری سوقرات لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا گوزارشتی لێ دەکرێت و ئاوەژوو دەبێتەوە:

*" کلینیاس: ئینجا ئێمە ناتوانین بۆ یاسادانانێکی بەهێزو باش — nomothesia، بەهاناوەهاتنێکی ـ boetheia گەورەتر بدۆزینەوە،*

*مـــادام حوكمـــەكانی ـــــ promomothesia یاســـا كاتێـــك بەنووســـین دەســـپێردرێت ـــ en grammasi tethena، تـــاوەكو بـــۆ هـــەموو سەردەمی داهاتوو ئامادەبێت بۆ شیكردنەوە، مادام هـەرگیز ناجوولێـت و چەقبەستووە. بەم شێوەیە، ئەگەر پێشووتریش ئەستەم بێت تێگەیشتراو بوو‌بێـت، ئـەوە نابێـت ترسمـان لـەم حاڵەتـە هـەبێت، چـونكە تەنانـەت خەڵكانێكیش كە درەنگ تێدەگەن، هەر دەتوانن چەندجارێك لێی رابمێنن و بگەڕێنەوە سەری، ئەگەر بەسوود بێت، نەوەكو هـەر تـەنیا درێژییەكـەی، ئەوەش پاساوی ئەوەمان پێدەداتەوە كە من پێم وایە ئێمە تێناگەین، جا ئەوە هەر پیاوێك بێت وا بكات: دەسبەرداربوون لەوەی یارمەتی پێویست ببەخشرێتە ئەم پاسـاوە ـــ to me ou boethein toutois tois logois، ئەوەی كە توانای بەسەردا هەیە".*

ئەم زاراوە یۆنانییەی كە زۆر بەجوانی جەختیان لەسەر دەكرێتەوە، پیشانمانی دەدەن كە فەریزەكانی یاسا، ناكرێت بەیاسا بكرێن، تەنیا لەنێو نووسـیندا نـەبێت ـــ en grammasi tethenta. یاسـادانان خـۆی یـا بـەدۆكۆمینتكراوە، یـا نووســراوە، یاســادانەریش خــۆی نووســەرە، دادوەریــش خوێنــەرەو یاســاكان دەخوێنێتەوە. بابچینە سەر كتێبی دوازدەیەم:

*" لەســەر هــەموویان پێویســتە چــاو لــەم دادوەرە بكــەن كــە دەیــەوێت دادوەرییــەك بســەپێنێت بێلایەنانــە بێــت، پێویســتە لەســەری دەقێكــی نووسراوی هـەبێت ـــ grammata تـاوەكو لێـی بخوێنێـت. بەڕاسـتیش لــەنێو هــەموو زانســتەكاندا، ئــەوەی كــە دەبێتــە هــۆی بــاڵاكردن و*

***بەرزکردنەوەی ئاستی هزری هەرکەسێك، یاساناسییە، بەمەرجێك ئەم زانستە بەپووختی و بەتووندی دارێژرابێت".***

بەپێچەوانەشەوە، گوتاربێژەکان چاوەڕوانی ئەفلاتونیان نەکرد تاوەکو نووسین دادگایی بکەن. لەڕوانگەی ئیزۆقراتیس[1] و ئەلسیداماس، ئەوە لۆگۆس خۆیشی

---

[1]) ئەگەر لەگەڵ ڕۆبین بڕوامان وابێت کە دیالۆگی فیدرۆس سەرەڕای هەندێك لەڕوخسارەکانی، بەڵام دادگاییکردنێکە دژی ڕەوانبێژی ئیزۆقراتیس ــ بڕوانە پێشەکی کتێبی فیدرۆس کە لەلایەن بۆدیێ بڵاوکراوەتەوە. هەروەها ئەوەی کە ئیزۆقراتیس هەرچییەك بڵێت، بەڵام هەر زیاتر بەلای ڕای باودا دەچێت نەوەکو مەعریفە ــ episteme. ئەگەر گەیشتینە ئەم بڕوایە، ئەوە چیتر ناونیشانی گوتارەکەی دووچاری سەرسوڕمانمان ناکات (لەدژی سۆفیستەکان)، هەروەها ئەوەش دووچاری سەرسوڕمانمان ناکات شتێکی لەم شێوەیە ببینین کە نزیکە لەوەی هاوشێوەی وتووێژو دیالۆگی سوقراتی بێت کە مرۆڤ کوێر دەکات "ئەوە ئەمان نین، بەڵکو ئەوانەن کە بەڵێنی ئەوە بەخەڵك دەدەن فێری قسەزانیان بکەن لەنێو پانتایی گشتیدا، ئەوانە دەبێت ڕەخنەکاری بکرێن، چونکە ئەمانە بەبێ ئەوەی هیچ خۆیان سەرقاڵبکەن بەحەقیقەت، پێیان وایە زانست ئەوەیە زۆرترین خەڵك کێش بکەیت بۆ لای خۆت بەکەمترین پارە. دەبێت ئەوە بزانین ئیزۆقرات پارەیەکی زۆر زۆری وەردەگرت، باشە نرخی ڕاستی چەند بوو کاتێك لەلایەن ئەمەوە دەخرایە ڕوو ....". ئەمانە خۆیان زۆر وریاو زیرەك نین و پێیان وایە خەڵکیش وەکو ئەمان وایە، بۆیە دەچن گوتارەکانی خۆیان خراپتر لەوە دەنووسن کە نەزانێکیش بیخوێنێتەوەو.

لەگەڵ ئەوەشدا، بەڵێنی ئەوەیان پێدەدەن لەم قوتابیانەیان گوتاربێژی زۆر بەتوانا دروستبکەن، بەجۆرێك لەنێو پرسەکانیاندا هیچ جۆرە بەڵگەیەك فەرامۆش ناکەن. لەم دەسەڵاتەشدا هیچ بەشێك بۆ ئەزموون و توانا سروشتییەکانی قوتابی ناهێڵنەوەو بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە وەکو چۆن فێری زانستی نووسینیان دەکەن، ئاواش دەتوانن فێری زانستی گوتاربێژیان بکەن. من پێم سەیرە ئەم جۆرە خەڵکانە شایانی ئەوە بن قوتابیان هەبێت، خەڵکانێکی وا بەبێ ئاگایی جۆرێك لەنموونەیان خستۆتەڕوو

بوونەوەرێکی زینـدووە ــ zoon کـە سـامان و هێـزو نـەرم و نیـانی و زینـدەداری سنووردارو مەحکومە، بەچەقبەستوویی هێمای نووسراو ـ نووسین.[1]

---

بەپێی کۆمەڵێك ڕێوشوێنی چەقگیر، گوایە ئەمە هونەرێکی پڕ داهێنانە. باشە لەوانە زیـاتر کەس هەیە نەزانێت کە پیتەکان چەقبەستوون و، خـاوەنی هـەمان بـەهای خۆیـانن کاتێـك هەمان پیت بۆ خودی شتێك بەکاردێت، لەکاتێکدا ئەم پرسە تـەواو پێچـەوانەیە لەحاڵـەتی ئاخافتندا؟ کاتێك کەسێك قسەیەك دەکات و دەڵێـت، بـۆ ئـەم کەسـەی دوای ئـەوە قسـە دەکات، سوودێکی زۆری نەماوە تازە، باشترین کەس لەم هونەرەدا، ئەوەیە کە دەتوانێت بەپێی پێویستی بابەتەکە گوزارشت لەخودی خۆی بکات، بەڵام لەمیانەی گوزارشتی تەواو جیاواز لەوانەی پێشتر خەڵکیتر بەکاریان هێناوە. ئەوەش باشترین سەلماندنە بۆ جیاوازی نێوان ئەم دوو بابەتە: گوتارەکان ناتوانن جوان بن ئەگەر گونجـاو نـەبن لەگـەڵ بـارودۆخ، هاوشان نەبن لەگەڵ بابەتەکە، پڕ نەبن لەجددییەت، کەچی پیتەکان، هـەرگیز پێویسـتیان بەم شتانە نییە. بـەکورتی: ئـەوەی دەیـەوێت بنووسـێت، پێویسـتە پـارە بـدات. هـەرگیز نابێـت ئـەهلی نووسـین دادگـایی بکـرێن. کـارێکی ئایدیالییانـە دەبێـت ئەگـەر لـەگیرفانی خۆیانــەوە پــارە بــدەن، بــەڵێ، بابیــدەن، مــادام پێویســتیان بەیارمــەتی و هاوکـاری مامۆسـتاکانی لۆگـۆس هەیـە. بـەم شـێوەیە پێویسـتە لەسـەر بەکارهێنـەرانی ئـەم جـۆرە نموونانە، پیت ـ paradeigmasin بڕێك پارە بدەن لەبری ئـەوەی وەربیگـرن، مـادام ئەمانەی پێویستیان بەچاودێری تایبەت هەیە، خۆیان کاردەکەن بـۆ ئـەوەی خـەڵکانی تـر پەروەردە بکەن".

١) ئێمە لەگەڵ دریدا لەنێو ئەم توێژینەوەیە، دەگەینە ئەو باوەڕەی ئاخافتن مانای ئامـادەگی دەگەیەنێت و نووسینیش مانای نا ئامادەگی. بۆیە لۆگۆس کاتێك لەنێو ئەو دیالۆگانەدا ـ مەبەستمان دیالۆگەکانی تری ئەفلاتونیشە خاوەنی باوکە، ئـەوە دیـارە بـەمانای ئاخـافتن دێت، لۆگۆس نابێتە لۆگۆس، ئەگەر خاوەنی باوك نەبێت. لۆگۆس بوونـەوەرە، گیانـدارەو کوڕی بوونەوەرێکیشە. ئەگەر زیاتر ورد بینەوە، دیارە دەبێـت ئـەو بوونـەوەرە زینـدووش بێـت، بوونـەوەرێك بێـت لـەدایك دەبێـت و گەشـە دەکـات. کـاتێکیش ئـەفلاتون لۆگـۆس بەئاژەڵ نـاو دەبـات، ئـەوە شـوێنکەوتووی گوتاربێـژو سۆفیسـتەکانە کاتێـك چـەقگیری و

قاڵب بەتەواوی خاوەندارێتی پێدراوەکانی سروشتی پڕ لەگۆڕانکاری ڕەوشی ئێستا ناکات، هەمووجارێکیش ناتوانێت خاوەندارێتی ئەم پێدراوانە بکات. ئەگەر ئامادەگی بریتی بێت لەشێوەو فۆڕمی گشتی بوونەوەر، ئەوە ئامادە لەلای خۆیەوە هەمیشە دەبێتە ئەویترێکی تر. بەڵام نووسراو وەکو ئەوەی دووبارە دەبێتەوەو لەنێو قاڵبدا هاوشێوەیە، لەنێو هەموو ئاڕاستەکاندا نییەو جیاوازی نێوان ئامادەبووەکانیش بەلاوەنانێت، خۆیشی ناخاتە ژێر باری پێداویستی گۆڕدراوەو ئێستایی پسیکاگۆجیا ـ گەمەکردن بەڕوحەکان. بەڵام ئەوەی دەدوێت، ئەوە بەپێچەوانەوە ناچێتە ژێر باری هیچ ڕێوڕەسمێکی پێشووتر، ئەم دێت هیماکانی خۆی بەشێوەیەکی باشتر ئاڕاستە دەکات. لێرەشدا دێت تاوەکو

---

وەستاوی نووسینیان بەراورد کردووە بەبزاڤتنی ئاخافتن و قسەی زیندوو بەردەوام پەیوەستە بەئاستی دەربڕین و بەرزی و نزمی دەنگ و سمیاو ڕوخساری دەم و چاوو پرسیارو وەڵامەکانیان. لۆگۆسێك بۆ ئەوەی زیندوو بێت، دەبێت سەرو دەست و قاچ و ناو قەدی هەبێت. ئاخافتن وەکو لۆگۆسێك زیندووەو خاوەنی هەموو ئەو پارچانەیە. ئایا نووسین کە مردووە، یا نیوە مردووەو، بێ باوکە، یەتیمە، خاوەنی هەموو ئەو ئەندامە ئۆرگانیانەیە؟ سوقرات ئاماژە بۆ ئەوە دەکات و دەڵێت:" هەموو گوتارێك دەبێت لەسەر شێوەی بوونەوەرێکی زیندوو دامەزرابێت، جەستەیەکی هەبێت کە جەستەی خۆیەتی، بەشێوەیەك بێ سەرو بێ قاچ نەبێت، هەروەها خاوەنی ناو قەد بێت، لەهەمان کاتیش خاوەنی دوو دەست بێت بەشێوەیەك لەگەڵ یەکتری و لەگەڵ هەمووودا بگونجێت". ئەو جەستەیە ئافرێدەکراوە، دەبێت لەجیناتێکی باشیش بێت، ئەوەش مەسەلەیەکە سوقرات جەختی لەسەر دەکاتەوەو ناویان دەبات بەئافرێدەکراوی نەبیل، کەواتە سیستەمێکی گوتاری مادام ئافرێدەکراوێکی نەبیلە، دەبێت سەرەتا و کۆتایی هەبێت، بەسەرەتا دەست پێبکات و بەکۆتایی کۆتایی بێت. گوتاری دەربڕاو، وەکو کەسێکی پاڵپشت لێکراوو ئامادە ڕەفتار دەکات، لۆگۆسێك وەکو بوونەوەرێك خاوەنی باوکی خۆیەتی.

جەختیان لێ بکاتەوە، کۆنترۆڵیان بکات یا بەرەڵڵایان بکات، ئەوەش بەپێی پێداویستییەکانی چرکەساتی ئێستاو، سروشتی جێکەوتی پێویست کە ئەم کەسەی دیالۆگ دەکات دەیخاتە ڕوو، بەوەی دێت فریای هێکامانی دەکەوێت لەنێو کاردا.

ئەوەی بەدەنگ کار دەکات، زۆر بەئاسانتر دەچێتە نێو ڕوحی قوتابییەکانی و، جێکەوتی هەمیشەیی و بەردەوامیان بەسەردا جێ دێڵێت. بەم شێوەیە ئاڕاستەی دەکات وەکو ئەوەی هەر کات پێی خۆشبوو، خۆی لەنێویدا جێنشین بێت. بۆیە ئەوەی سۆفیستەکان بەعەیب و عاری نووسینی دەزانن، توندوتیژییە زیانبەخشەکەی نییە، بەڵکو بێ توانایی و نەدارییەکەیەتی بەرانبەر بەم خزمەتکارە نابینایەو بزاڤە گەمژەکانی. ئەوەش پاڵ بەقوتابخانەی ئەتیکە ــ گۆرگیاس و ئیزۆقراتیس و ئەلسیداماس ــ دەنێت بڕوا بەهێزی لۆگۆسی زیندوو بێنن، یا وەکو ئەوەی گۆرگیاس لەنێو (ستایشی هیلانە) دا وەسفی دەکات و ناوی دەنێت مامۆستای مەزن و دەسەڵاتی مەزن ــ logos dunastes mengas estin.

بنەماڵەی ئاخافتن دەتوانێت زۆر توندوتیژتربێت لەبنەماڵەی نووسین. دزەکردنەکەشی دەکرێت قووڵترو تیژتربێت، فرەو بەمتمانەتر بێت. تەنیا ئەم کەسانە هانا بۆ نووسین دەبەن و خۆیانی لەپاڵ دەشارنەوە، کە ناتوانن قسەکەری باش بن. ئەلسیداماسیش باسی ئەمە دەکات لەنێو هەردوو نامەکەیدا (لەبارەی ئەوانەی گوتار دەنووسن) و (لەبارەی سۆفیستەکانەوە). نووسین وەکو چارەسەرێك بۆ ئاخافتنی لاواز، وەکو قەرەبووکردنەوەیەك.

سەرەڕای ئەم لێکچوونانە، ئیدانەکردنی کتێب لەلای گوتاربێژەکان، ئەوەندە کاراو کاریگەر نییە، وەکو ئەوەی لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا هەیە. ئەگەر شتی نووسراو بێزراو بێت، لەبەرئەوە نییە کە فارماکۆنەو هاتووە بۆ ئەوەی یادەوەری و حەقیقەت تێکبدات و لەباریان ببات، بەڵکو لەبەرئەوەیە لۆگۆس فارماکۆنێکی خۆرەیە ـ گۆرگیاس بەم شێوەیە ناوی دەبات.

لۆگۆس وەکو فارماکۆنێک، لەیەک کاتدا، هەم سوودبەخش و هەمیش زیانبەخشە، هەر لەسەرەتاوە بەئاڕاستەی خێرو حەقیقەت کار ناکات، لەنێو ئەم ئالۆزییەدا، لەنێو ئەم دەستنیشان نەکردنە مەتەڵدارەی لۆگۆسدا، دوای ئەوەی دانی پێدادەنرێت، واتا دان بەوە دادەنرێت کە دەستنیشان نەکراوە، ئەوە دەڵێین گۆرگیاس دێت تاوەکو حەقیقەت وەکو جیهان دەستنیشان بکات کە خاوەنی بونیادو سیستەمێکە، کۆسمۆسێکە ــ Kosmos بۆ لۆگۆس. بێگومان کاتێک گۆرگیاس ئەم کارە دەکات، ئەوە مزگێنی هاتنی بزاڤەکەی ئەفلاتون دەبەخشێتەوە.

پێش ئەم کاتەش، پێش ئەم دەستنیشانکردنەی لۆگۆس، ئێمە هێشتا لەنێو پانتاییەکی ئاڵۆزو ناڕۆشنین، هێشتا زۆر دیار نییە لەبارەی فارماکۆنەوە، هێشتا لۆگۆس نەبۆتە خاوەن توانا، هێشتا نەبۆتە زمانێکی شەفاف بۆ مەعریفە. ئەگەر ئێمە دەسەڵاتمان هەبێت لەنێو گوتەزای دواتردا دەسگیری بکەین، لەنێو مێژووی کراوەی لەم شێوەیەدا، گوتەزای دوای بڕیارەکان، ئەوە پێویستە لێرەدا قسە لەبارەی ناعەقڵانییەتی لۆگۆسی زیندوو بکەین، توانای لەسەر سیحرو فیتنەبازی و وەرچەرخانی کیمیایی کە بەساختەو سیحری دەبەستێتەوە، سیحرو پسیکۆلۆجیا

بەیەکەوە. ئەم شتانەی بۆ ئاخافتن بەکاردێت، ئەم فارماکۆنە تۆقێنەرە. لەنێو (ستایشی هیلانە) دا،[1] گۆرگیاس ئەم زاراوانە بەکاردێنێت بۆ داتاشینی هێزی گوتار:

***" ئەم ئینسیحارانەی کە خوا لەمیانەی ئاخافتنەوە وەکو سرووش دەیگەیەنێت ـ ai gar entheoi dia logon epoidai، لەگەڵ خۆیاندا خۆشی دێنن و پرسە دەردەکەن. لەمیانەی توانەوەی خێرای لەنێو ئەوەی ڕوح بیری لێ دەکاتەوە، ئەوە هێزی ئینسیحار دەیوروژێنێت و ـ ethalexe ڕایدەکێشێت و بەهۆی فیتنەیەکەوە ـــ goeteiai دەیگۆڕێت. تەکنیکارانی سیحرو فیتنە، شێوازی گومراکردنی ڕوح و فریودانی هزریان دۆزیوەتەوە، بۆیە هیچ ڕێگرییەك نییە لەوەی ئومنۆس ـ umnos بتوانێت هیلانە کۆنترۆڵ بکات و بیرفێنێت، بەهەمان ئەم شێوازە توندوتیژەی لەکاتی ڕفاندندا بەکاردەهێنرێت. ئاخافتن، ئەوەی دەتوانێت ڕوح بڕواپێ بێنێت ـ فریوی بدات، کە ئەم فریوی دابوو، ناچاری کرد ملکەچ بکات بۆ ئەم قسانەی دەگوترێن و ئەم شتانە قبووڵ بکات کە دێنەپێشی.***

---

١) هیلانە ژنی مێنێلاس ـــ Menelas ی برای ئاگامینۆن ـــ Agamenon پاشای ئەسپارتە بوو، کچی خواوەند جوپیتەر بوو لەژنێکی مرۆڤ بەناوی لیدا ـ Leda. ڤینۆسی خواوەند بەقسەی خۆش دەیخەڵەتێنێت و داوای لێ دەکات شووەکەی جێ بێڵێت و بچێت لەگەڵ پاریس کوڕی بچووکی پریام ـ Priam شای تەڕوادە ـ Troad بژی. بەم شێوەیە هیلانە قسەکان قبووڵ دەکات و شووەکەی جێ دەهێڵێت. بەهۆی ئەم کارەوە ئاگامینۆن سوپایەکی گەورە دەباتە سەر شاری تەڕوادە، جەنگێك دەست پێدەکات (١٠) ساڵ دەخایەنێت و بەخاپوورکردنی تەڕوادە کۆتایی دێت. (وەرگێڕی کوردی)

***ئەوەی کاری فریودان و خەڵەتاندن دەکات، بەهەڵەدا چووە بەوەی کارێکی کردووە بەزۆری بووە، ئەوەی فریویش دراوەو فێڵی لێکراوە، مادام ناچار بەئاخافتن و قسەکردن کراوە، ئەم خراپەیەی لەبارەی ئەم بڵاوبۆتەوە، هیچ بنەمایەکی نییە".***

ڕەوانبێژی ڕازیکەر ـ peitho، دەسەڵاتی بڕین و ڕفانـدن و ڕاکێشـانی جـەوانی هەیە، ئەم، هەر خۆی، هێزێکی ڕفێنەرە. بەڵام کاتێك گۆرگیاس پێمان دەڵێـت کـە هیلانـە ملکەچیکردووە بـۆ توونیدوتیـژی ئاخـافتن و قسـەکردن ـــ ئایـا لەبـەردەم نووسینێکی نووسراو لەسەر کاغەزدا، ئاوا لاواز دەبـوو؟ ـــ کاتێـك گۆرگیـاس دێـت ئـەم قوربانییـە بـێ تـاوان پیشـاندەدات، ئـەوە دێـت لەهـەمان کاتیشـدا توانـای درۆکردنی لۆگـۆس ئیدانـە دەکـات و تۆمـەتباری دەکـات، بـەوەی کـە لۆژیکێـك ـــ logismon بـەگوتار ـ toi logoi دەدات، ئـەوە دەیـەوێت لەیـەك کاتـدا، هـەم کۆتایی بەتۆمەتبارکردنی ژنێـك بێنێـت کـە نـاوو ناوبـانگی خراپـی هەیـە، هـەمیش بیسـەلمێنێت کـە ئـەم کەسانەی لۆمـەی ئـەم ژنـەیان کـردووە، بەهەڵـەدا چـوون، ئـەوەش لەمیانـەی دانـانی سـنوورێك بـۆ جـەهل، لـەڕێگای خسـتنەڕووی حـەق و ڕاستیدا.

بەڵام، پێش ئەوەی لەلایەن سیسـتەمی حەقیقەتـەوە کـۆنترۆڵ و مـاڵی بکرێـت، ئـەوە لۆگـۆس خـۆی زینـدووێکی دڕندەیـە، ئـاژەڵێکی ئـاڵۆزو شـێواوەو هێزێکـی سـیحری دەرمانخانـەیی هەیـە ـــ phamaceutique[1] کـە بۆتـە بەشـێك لـەم

[1] لێرەدا بۆیە لەبەرانبەر دەرمانخانە، وشەکە بەزمانی فەڕەنسی دەنووسینەوە کە لەئەسڵدا یۆنانییە، تاوەکو ئـەوەمان بیربکەوێتـەوە کـە ئـەم وشـانە یـەك ڕەگوڕیشـەی زمانـەوانیان

ئاڵۆزییە، هەر ئەوەشە وا دەکات گونجان نەبێت لەنێوان ئەم هێزەو ئەو شتە ئاسانەی کە ئاخافتنە:

" ئەگەر قسەکردن فریوی دابێت و ڕوحی گومڕا کردبێت، ئەوە زەحمەت نییە بەرگری لێبکرێت و، بەڵگەکانی ئیدانەکردنیشی پووچ بکرێنەوە: ئاخافتن دەسەلاتێکی زۆر بەکاردێنێت، ئەگەرچی شتێکی سادەو ئاسانەو هەرگیز نابینرێت، بەلام بەراستی دەتوانێت کاریگەری خواییانەی هەبێت. بەو ڕادەیەی کە دەتوانێت هێمنمان بکاتەوەو سەرسوورمانمان لێ دووربخاتەوە، بەو رادەیەش خۆشی و شادی لەگەڵ خۆیدا دێنێت و بەزەیی زیاتر دەکات ...".

براوپێهێنان، یا فریودان و گومڕاکردن، نهێنی بەرەو ناوەوەی ڕوح لەمیانەی گوتار، ئەوە فارماکۆنە، ئەوەش ئەم ناوەیە کە گۆرگیاس بەکاری دێنێت:

" هێزی گوتار ـ tou lougon dunamis، هەمان پێوەندی هەیە ـ ton logon auton de بەحاڵەتی ڕوح ـ pros ten tes psuches taxin کە حاڵەتی دەرمان ـ ton pharmakon taxis لەنێو سروشتی جەستەکاندا هەیەتی ـ ten ton somaton physin. وەکو چۆن هەندێك دەرمان دەتوانن میزاج لەنێو لەش وەدەر بنێن، هەر دەرمانێك، ئەم میزاجەی کە بۆی دروستکراوە، هەندێکیان نەخۆشی ڕادەگرن و هەندێکی تریشیان ژیان. هەندێك گوتاریش، بەهەمان شێوەی ئەم دەرمانانە، ناخۆشی و خۆشی لەگەڵ خۆیاندا دێنن. هەندێکیان زەندەقی گوێگران دەبەن، هەندێکی تریش سەرگەرمی زیاتریان

---

هەیەو فارماکۆنیش بێگانە نییە لەنێو ئەم زمانانەدا، چونکە ئێمە لەم کتێبەدا کار لەسەر ئەم چەمکە دەکەین.

بێدەدەن، هەندێکی تریش ڕوح لەهۆش خۆی دەبەن و سڕی دەکەن و سیحری لێ دەکەن ـ ten psuchen epharmakeusan kai axegoeteusan".

بێگومان ئێوەش بیرتان لەوە کردۆتەوە کە پێوەندی هاوشێوەیی نێوان لۆگۆس ــــ ڕوح، پێوەندی نێوان فارماکۆن ــــ جەستە، هەر خۆی وا دەستنیشانکراوە وەکو لۆگۆسێك. واتا ناوی ئەم پێوەندییە، هەر هەمان ناوی یەکێك لەلایەنەکانییەتی. فارماکۆن خۆی لەنێو بونیادی لۆگۆسدایە، ئەم لەناو بوونەش باڵادەستی و بڕیارە.

# بەشی حەوتەم

## فارماکووس[1]

*"بەڕاستی ئەگەر هیچ نەخۆشییەك نەگرین، ئەوە پێویستیمان بەفریاگوزاری نییە، ئەوەش دەردەکەوێت کە نەخۆشی دەبێتە هۆی ئەوەی تەندروستی ـ taghaton لەلامان خۆشەویست و بەنرخ بێت. چونکە ئەمەی دوایی خۆی دەرمانی ـ pharmakon ئەم پەتایە بوو، وەکو ئەوەی هەر خۆیشی پەتاکە بێت. بەڵام هەر کات پەتایەکە لەناوبردرا، چیتر دەرمان پێویست نابێت ـ ouden dei pharmakeu، ئایا هەمان شت ڕاستە لەبارەی تەندروستیشەوە؟ گوتی: پێدەچێت، ئەوە ڕاست بێت".*

*(لیسیاس)*

---

[1] ) لێرەدا جاك دریدا فارماکووس بەکاردێنێت و دەنووسێت، ئەوەش چەکێکی ترە، تاوەکو جیای بکاتەوە، هەم لەفارماکۆن، هەمیش لەفارماکۆس کە دواتر دێتە سەری و باسی لێوە دەکات.

ئەگەر بەم شێوەیە بێت و لۆگۆس زیادەیەکی دەستڕۆیشتوو بێت، ئەوە سوقرات "ئەم پیاوەی کە نانووسێت"[1] ئەمیش خۆی نابێتە سەروەرو گەورەی فارماکۆن؟ باشە بەم کارەی، تاڕادەیەکی زۆر کە ئەستەمە جیابکرێتەوە، بەسۆفیست ناچێت؟ بەفارماکووس ـ pharmakeus؟ بەسیحربازو فێڵباز، بگرە بەژەهربەخشێك؟ تەنانەت بەم کەسە تەڵەکەبازانەش کە گۆرگیاس ئیدانەیان دەکات؟ هێل و داوی ئەم پڕۆسە ئاڵۆزە ئەستەمە لەیەکتری جیابکرێتەوە.

زۆرجار لەنێو دیالۆگە ئەفلاتونییەکاندا، سوقرات ڕوخسارێکی فارماکووسانەی هەیە.[2] ئەم ناوە لەلایەن دیۆتیمەوە بەخشراوە بەئیرۆس، بەڵام ئێمە لەمیانەی ئەم ناوو وێنەیەی ئیرۆسدا دەتوانین سیمای سوقرات ببینین، وەکو ئەوەی دیۆتیمە کاتێك تەماشای ئیرۆسی کردووە، وێنەی سوقرات، بەسوقرات خۆی دەبەخشێت، پۆرترێتی کەسایەتی خۆی. ئیرۆس نە دەوڵەمەند بوو، نەجوان، نە ناسك و هەستناك، هەموو ژیانی خۆی لەفەلسەفەکاری دەبردە سەر ـــ philosophon dia pantos tou biou، سیحربازێکی مەترسیدار بوو ـ deinos geos، فارماکووس و ـ pharmakeus سۆفیست ـ sophistes بوو. بوونەوەرێك بوو هیچ لۆژیکێك نەیدەتوانی لەنێو دەستنیشانکردنێکی

---

1) "ئەم پیاوەی کە نانووسێت" وەسفی نیچەیە بۆ سوقرات.

2) لێرە لەگەڵ دەسپێکی ئەم بەشەی کتێبەکەدا، جاك دریدا زیاتر کار لەسەر کەسایەتی سوقرات دەکات لەنێو دیالۆگەکاندا، کار لەسەر کاریگەری فارماکۆن دەکات لەسەر کەسایەتی سوقرات لەژیانیداو، لەچرکەساتی نۆشینی فارماکۆن و کەش و هەوای فارماسیێ. لێرە بەدواوە گەمەی سەرەکی دریدا دەست پێدەکات لەگەڵ دەق و ئێمەش ئەم گەمەیە بەڕوونی دەبینین.

نادژكارانەدا، دەسگیری بكات. بوونەوەرێك لەبنەماڵەی شەیتان، نە خواوەند بوو، نە مرۆڤ، نە نەمر بوو، نەدەمردیش، نە زیندوو بوو، نە مردوو، دەسەڵاتەكەی بریتی بوو لەوەی پاڵ بەتەنجیم و فالگرتنەوەو هونەری ڕەهبانەكان لەبارەی قوربانی پێشكەشكردن و بەخشین ئاراستەو ڕێكبخات، پێشبینی ڕەوشی گشتی بكات و سیحر ـ thusias-teletas-epodas-manteian ئاراستە بكات.

لەنێو هەمان ئەم دیالۆگەدا، ئەگاتۆن سوقرات بەوە تۆمەتبار دەكات كە ویستوویەتی سیحری لێبكات و ئازاری بدات لەڕێگای سیحرو جادووەوە ــ pharmattein boulei me o Sokrates. ئەم وێنەیەی ئیرۆس كە دیۆتیمە دەیكێشێت، بەردەوام لەنێوان گلەیی و سكاڵای ئەم و، ئەم وێنەی سوقرات كە ئەلیسیپیادیس كێشاویەتی، دێت و دەچێت. ئەو پیاوەی بانگەشەی ئەوە دەكات گوایە سیحری سوقراتی لەڕێگای لۆگۆسەوە بەبێ هیچ ئامێرێك كار دەكات، لەمیانەی دەنگ كار دەكات بەبێ هیچ ڕتووش و ماكیاجێك، بەبێ نایەی ئەلستێر مارسیاسیش[1]:

***" ئینجا تۆ دەڵێی: بەڵام من نای ژەن نیم! تۆش موزیكژەنێكی زۆر لەوانەش باشتری كە ئێمە مەبەستمانە. ئەی نابینی ئەم پێویستی بەئامێر هەبوو تاوەكو سیحر لەمرۆڤەكان بكات بەم توانایەی كە لێی هەڵدەقوڵێت. ئاوازەكانی، تاكە شتن كە مرۆڤ بەرەو حاڵەتی هێمن بوونەوەو جێگیری***

---

[1]) ئەلستێر مارسیاس بوونەوەرێكی ئەفسانەیی یۆنانییە، نیوەی سەرەوەی مرۆڤەو نیوەی خوارەوەی بزنە، كاری ئەوە بووە نایە بژەنێت و موزیك لێبدات. لەنێو هەندێك فیلمی خەیاڵی و ئەفسانەیی وەكو كاراكتەرێك بەكارهاتووە.

***دەبەن، لەمیانەی ئەم ئاوازانەوە پیاوەکان هەست بەوە دەکەن کە پێویستیان بەخواوەندو قسەکانیان هەیە، چونکە ئەم ئاوازانە خۆیان خواین. کەچی تۆ، هیچ لەم جیاوازتر نیت، تەنیا ئەوە نەبێت تۆ هیچ ئامێرێك بەکارنامێنیت ـ aneu organon، تەنیا بەم قسانەت کە هیچ شتێکیشیان لەگەڵدا نییەو دەنگێکی ڕووتە ـ siopsilois log،[1] بەڵام هەمان کاریگەری جێدەهێڵن ....".***

ئەم دەنگە ڕووتەی کە هیچ ئامێرێکی موزیکی لەپشتەوە نییە، مرۆڤیش ناتوانێت ڕێگای لێبگرێت نەچێتە نێو قووڵایی، ناتوانێت گوێچکەکانی خۆی بگرێت و دایانبخات وەکو ئەوەی یۆلیۆس کردی، تاوەکو گوێبیستی ئەم بانگەوازانە نەبێت.

فارماکۆنی سوقراتی وەکو ژەهرێکیش کار دەکات، وەکو پێوەدانێك، پێوەدانی مارێکی ژەهراوی. پێوەدان و گەزەی سوقراتی، لەپێوەدان و گەزەی مار سەختترە، چونکە کاریگەرییەکەی ڕاستەوخۆ دەچێتە نێو ڕوح. بەهەرحاڵ، ئەوەی لەنێوان قسەی سوقرات و ئازاری ژەهر هاوبەشە، بریتییە لەوەی هەردووکیان بەنەرمی ڕۆدەچنە نێو قووڵایی لایەنی شاراوەی نێو ڕوح و جەستەو، تێیدا بڵاودەبنەوەو داگیری دەکەن. قسەکانی ئەم کەسەی بانگەشەی موعجیزە دەکات، قسەیەکی شەیتانییانە، بەرەو هەوەسی فەلسەفەو وڕێنەی دیۆنیسیمان دەبات. کاتێکیش ئەگەر ئەم پێوەدانە "دەرمانخانەییە" ی سوقرات وەکو ژەهری

---

[1]) دەنگی ڕووت، ئەم دەنگانەن کە هەر خۆیانن و هیچ شتێکیان لەگەڵ نییە. لێرەدا هەر تەنیا وەکو پاساوو بەڵگەیەکی سادە بەکارهاتووە بۆ گوزارشتکردن.

مار کاری نەکرد، ئەوە دەبێتە هۆی جۆرێك لەشڵەژان و سڕکردن وەکو ئەم بڕە لەتەزووی کارەبا کە ماسی کارەبایی ـ narke لەکاتی بەریەککەوتندا دەیدات:

***" مینۆن: ئەی سوقرات، پێش ئەوەی بتبینم و بتناسم، زانیومە خەڵك دەڵێن تۆ هیچ ناکەیت، تەنیا دۆزینەوەی زەحمەتی و ئاستەنگی نەبێت لەهەموو شوێنێکداو، نمایشکردنیان لەبەردەم خەڵکانیتر.[1] ئێستا، ئا لەم چرکەساتەدا، نازانم بەچ سیحرێك و بەچ دەرمانێك و بەچ دوعایەکت، ئاوا سیحرت لێکردووم، بەشێوەیەك ئێستا کەڵلەی سەرم پڕ بووە لەگومان ـ goeteueis me kai pharmatteis kai atekhnos katepadeis, oste meston aporias gegonanai (بێگومان ئێوە دەزانن ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ وەرگێڕانەکەی بۆدیی) ـ خۆ ئەگەر ڕێگام بدەیت، ڕەنگە ئازایەتی بکەم و نوکتەیەکیش بڵێم، بڵێم تۆ بەشێوەو ـ eidos بەهەموو شتێکت، زۆر لەو جۆرە ماسییە دەریاییە گەورەیە دەچیت کە ناوی (narke) یە. ئەم ماسییە هەموو ئەم کەسانە سڕ دەکات کە دەستی لێبدەن و لێی نزیك بکەونەوە، تۆش هەمان دەسەڵات و کاریگەریت بەسەرمندا سەپاند. بەڵێ، بەڕاستی من دووچاری سڕبوون هاتووم، هەم لەجەستەم و، هەمیش لەڕوحم، بەشێوەیەك ئێستا ناتوانم وەڵامت بدەمەوە. بڕوام پێبکە، تۆ لەسەر حەقی کە ناتەوێت گەشت***

---

١) لەهەندێك وەرگێڕانی تردا بەم شێوەیەیە:" ئەی سوقرات، پێش ئەوەی بتبینم لەبارەی تۆەوە زۆرم بیستووە، بیستوومە تۆ هیچ ناکەیت تەنیا ئەوە نەبێت کە خۆت دەخەیتە نێو گومانەوەو لەگەڵ خۆتدا خەڵکانی تریش تووشی ئەم گومانانە دەکەیت". (وەرگێڕی کوردی)

***بکەیت و لێرە دوور بکەویتەوە، لەنێو شارێکی بێگانەو نامۆدا، بەم شێوە ڕەفتارەت، وەکو سیحربازێك ـ goes دەسگیرت دەکەن". [١]***

سوقرات وەکو سیحربازێك دەسگیر کراوە ــ goes ou pharmakeus: با لەمە ڕابمێنین و پەلە نەکەین.

باشە چۆن تەماشای ئەم لێکچوونە بکەین کە بەبێ دابڕان هەوڵدەدات فارماکۆنی سوقراتی ئاڕاستەی فارماکۆنی سۆفیستەکان بکات؟ دەیەوێت وەکو پێوانە بەیەکەوەیان بپێوێت و بەراوردیان بکات، وامان لێ دەکات بێکۆتایی لەیەکێکیانەوە بالاَبین بەرەو ئەویتریان؟ چۆن دەتوانین لەیەکتریان جیا بکەینەوە؟

گاڵتەجاڕییەکە[١] لەبەتاڵکردنەوەی سیحری سۆفیستەکاندا نییە لەمیانەی شیکردنەوەو لێپرسینەوەدا. لەسەر هەڵوەشاندنەوەی فارماکووسی سیحرباز

---

١) لێرە لەنێو قۆناغی یەکەمی ئەم دیالۆگەدا، مینۆن هەست بەسڕبوون دەکات، ئەوەش یەکەم چرکەساتی داماڵینی دەسەڵاتە لەبەرانبەر لەلایەن سوقراتەوە. مینۆن زۆر فێڵبازانە ئەم چرکەساتە بەشێوەیەکی تر شرۆڤە دەکات بەجۆرێك ئەو تۆمەتە بەبیر سوقرات دێنێتەوە کە بەردەوام ئاڕاستەی دەکرا، تێکدانی لاوان و سیحرو جادووکەری. ئەوەش لێرە لەلای دریدا خاڵی جەوهەرییە وای لێکردووە ئەم بەشەی ئەم دیالۆگە بخوازێت و لێرە دایبنێت و شرۆڤەی بکات و خوێندەوەی بۆ بکات. ئینجا ئاماژە بەدەرنەچوونی سوقرات دەدات بۆ دەرەوەی شار، ئەگەر ئێمە ئەم قسەیە ببەستینەوە بەم پێشنیارەی کە پێش ژەهرخواردنی پێشکەشی کرا، لەبری ئەوەی بکوژرێت، نەفی بکرێت بۆ شارێکی ترو ناوچەیەکی تر. ئەوەش ماناو دەلالەتی تایبەتی خۆی هەیە، هەم لەنێو قسەکانی مینۆن هەمیش لەلای دریدا. (وەرگێڕی کوردی)

لەلایەن دەستەیەکی دادگاییکردنەوە دانەمەزراوە، کار بۆ عەقڵێکی شەفاف و لۆگۆسێکی بێتاوان بکات. گاڵتەجاڕی سوقراتی وا دەکات فارماکۆنێك بخاتە بەریەککەوتن لەگەڵ فارماکۆنێکی تردا. یا بەمەنایەکی تر، دەسەڵاتی فارماکۆن لەناو دەبات و سەراوژێری[2] دەکات. بەم شێوەیە خۆی بەدی دێنێت، لەمیانەی پۆلێنکردنی فارماکۆن وەکو شتێك کە خاوەنی تایبەتمەندی نا تایبەتمەندی بێت، ئەم خودەی بەدرەوام دەتوانێت بەسەر خۆیدا هەڵبگەڕێتەوە.

---

[1]) لێرەدا زاراوەی گاڵتەجاڕی، بەمانای گاڵتەجاڕی ڕاستەقینە بەکارنایەت، بەڵکو مەبەست لێی گاڵتەجاڕی سوقراتییە کە ناسراوە بە مایۆتیك، ئەم میتۆدە سوقراتییەی کە لەمیانەیدا وا دەکات ڕاستییەکان لەسەر زمان و لەلایەن ئەم کەسانە ئاشکرا بکرێت کە دیالۆگی لەگەڵدا دەکەن، ئەوەش لەمیانەی پرۆسەیەك کە تێیدا پرسیار هێدی هێدی باڵاتر دەبێت تاوەکو دەگاتە ڕاستی کاتی، ئینجا پرسیاری تر دێت ئەم ڕاستییە دەسڕێتەوەو ڕاستییەکی تر بەرهەم دێنێت و پرۆسەکە بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت تاوەکو هەموو ڕاستییەکان دەدرکێنرێت.

[2]) لەهەمان کاتدا ـ هێدی هێدی ئەم پرۆسەیە ئەنجام دەدات. فارماکۆنی ئەفلاتونی لەیەك کاتدا دوو کار ئەنجام دەدات، دوالیزمییانەیە، دەیبەستێت و بەئاگا دێنێت. سڕ دەکات و هەستەکانیشی دەبزوێنێت. دڵنیایی دەبەخشێت و، دڵەڕاوکێش لەگەڵ خۆیدا دێنێت. سوقرات ئەو ماسییە سڕکەرەیە، لەهەمان کاتیشدا سەری دەرزییەو دەچەقیت بەلەشدا. با مێش هەنگوینەکەی فیدۆنمان لەبیربێت. لەشوێنێکی تریشدا دواتر، دێین (بەرگری سوقرات) بەسەر پشتتدا دەکەینەوە، لەو خاڵەدا کە سوقرات خۆی بەم مێشوولەیە دەشوبهێنێت کە پێوەدەدات. بەم شێوەیە ئەم فۆرمە سوقراتییە وا دەردەکەوێت وەکو ئەوەی جیهانی ئاژەڵ بێت. ئایا سەیرە ئەگەر شەیتان خۆی لەنێو جیهانی ئاژەڵ حەشار بدات؟ ئا لەم خاڵەی دوالیزمی هاوسەنگی نێوان ئاژەل ـ دەرمانخانە، لەمیانەی ئەم هاوشێوەیی و لێکچوونە سوقراتیەدا، سنوورەکانی شتە مرۆییەکان دەستنیشان دەکرێت.

لەنێو ئەم دڵەدا، پرسەکە پێوەندی بەزانست و مەرگەوە هەیە. ئەوانەی بەیەکەوە خراونەتە نێو یەك قاڵب لەنێو بونیادی فارماکۆندا، ناوی ئەم بڕەی کە دەبێت چاوەڕوان بکرێت، دەبێت بگاتە ئاستێك شایانی ئەمە بێت، وەکو خودی سوقرات خۆی.

(٢)

بەکارهێنانی سوقراتییانە بۆ فارماکۆن، بەئامانجی گرێنتیکردنی هێزی فارماکوس نییە. تەکنیکی بڕینی تێکشکێنەرو پەکخستن، ڕەنگە مومکین بووبێت بەڕوویدا هەڵبگەڕێتەوە، ئەگەرچی پێویستە لەسەرمان بەردەوام بەپێی میتۆدی نیچەیی،[1] دەستنیشانی لایەنی ئابووری و سەرمایەگوزاری و، سوودی دواخراو بکەین، ئەوەش لەمیانەی قوربانیدان و دەسبەرداربوونی شەفافانەدا.

---

١) مەبەستی جاك دریدا لەمیتۆدی نیچەیی، بریتییە لە سیمپتۆماتیك symptomatique کە ئەنجامی ئاماژەو کاریگەری نەخۆشییە بەسەر مرۆڤدا، وا دەکات مرۆڤ هەندێك ڕەفتار بکات و، هەندێك ڕا دەرببڕێت کە دەشێت وەکو حەقیقەت تەماشا بکرێن، ئەگەررچی ئەنجامی نەخۆشییە. ئەم بۆچوونە پێی وایە دەکرێت لەم کاتانەدا مرۆڤەکان کۆمەڵێك نهێنی بدرکێنن لەناوشیارییەوە بێت، بۆیە دەبێت سوود لەم ڕایانە وەربگیرێت و وەکو حەقیقەت مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت. ئالێرەدا، دریدا ئاماژە بۆ دەسبەرداربوونی سوقرات دەکات لەوەی بەرگری لەخۆی بکات لەکاتی دادگاییکردنیدا، بەوەی قوربانی بەخۆی دەدات لەپێناو خەڵکی ئەسینادا، وەکو ئەوەی چاوەڕوانی خۆشییەکی دواخراو بکات، سەرکێشییەك بەنیازی بەروبوومێك. بۆ نموونە، خەڵکی ئەسینا خۆیان بێن بەرگری لێبکەن، یا نەوەکانی داهاتوو لێی ڕازی بن و ستایشی بکەن.

ڕووتبوونەوەی فارماکۆن و دەنگی ڕووت و پەتی ــ psilos logos، جۆرێک لەباڵادەستی بەسەر دیالۆگدا دەسەپێنن، بەمەرجێك سوقرات بانگەشەی ئەوە بکات کە دەسبەرداری سوودەکانی بووەو نازانێت چ شتێك مەعریفەیە بەهێزو چێژ. بەمەرجێك بەوشەیەك ڕازی بێت لەسەر مەرگ. مەرگی جەستە. بەهەرحاڵ ئەوە نرخی حەقیقەتی بەرجەستەبوو ــ aletheia و مەعریفەیە ــ episteme کە هەردووکیان خاوەن دەسەڵاتن.

ترس لەمەرگ و مردن، دەروازەیەکی بەپیت دەرەخسێنێت بۆ هەموو جۆرە دەرمانێکی سیحری، فارماکوسیش گەمە لەسەر ئەم ترسە دەکات. لەم چرکەساتەوە، دەرمانخانەی سوقراتی کار بۆ ئەوە دەکات لەم ترسە ڕزگارمان بکات، وەکو دوعاو نووشتە وایە کاتێك بیری لێ دەکرێتەوە کە گوایە لەلایەن خواوەندەوەو، لەڕوانگەی ئەمەوە ئاڕاستە دەکرێت. دوای ئەوەی پرسیار دەکات کە ئایا هیچ خواوەندێك دەرمانێکی وای داوەتە مرۆڤ تاوەکو ئەم ترسە دروستبکات ــ phobou pharmakon، ئەوە دەبینین لەنێو دیالۆگی یاساکاندا ئەم گریمانەیە بەلاوە دەنێت و ڕەتیدەکاتەوە:

***" بابگەڕێینەوە بۆ یاسادانەرەکەمان تاوەکو پێی بڵێین: باشە، بێگومان بۆ هەبوونی ترس، هیچ خواوەندێك ئەم جۆرە دەرمانەی ــ pharmakon بەمرۆڤ نەداوە، ئێمەش خۆشمان ئەم شتەمان دانەهێناوە، چونکە سیحربازەکان ئەوکەسانە نین کە ئێمە هامووشۆیان بکەین، بەڵام بۆ دروستکردنی نا ئامادەگی ئەم ترسە ــ aphobias، بۆ ئەوەی***

***ئازایەتیمان هەبێت، ئایا هیچ شەڕابێك هەیە تا بیخۆینەوە؟ یا دەبێت بەدوای شتێکی تردا بگەڕێین؟".***

ئەوەی لەنێوماندایە، منداڵیمانە کە دەترسێت، ئەوکاتە سیحربازو جادووگەر نامێنن کاتێك ئەم منداڵەی لەنێوماندایە دەسبەرداری ترس بێت لەمەرگ، ئەو ترسەی منداڵ لەداهۆڵی مەترسیدار هەیەتی. پیویستە هەموو ڕۆژێك دووعاو نووشتەی زۆرتر بخوێنین تاوەکو بتوانین ئەم منداڵە لەم ترسە دەربێنین:

***" سیپیس: کەواتە، کار بۆ ئەوە بکە جارێکیتر ئەم منداڵە نەگەڕێتەوە، ئەوەی لەمەرگ دەترسێت ـ بەڵام سوقرات دەڵێت ئەوەی پێویستە بۆ ئەم کارە، هەموو ڕۆژێك نووشتەیەکە بۆ ڕزگارکردنی لەم نووشتەیە. باشە ئەی سوقرات، ئێمە نووشتەو دوعای لەم شێوەیە لەکوێ بێنین کە دژی هەموو جۆرە ترسێك بێت؟ ئێستا کە تۆ دەڕۆیت و جێمان دەهێڵیت، ئێمە ئەم سیحربازە زیرەك و بەتوانایە ـ epodon لەکوێ بێنین؟". (دیالۆگی فیدۆن).***

لەنێو دیالۆگی کریتۆنیشدا، سوقرات دیسان ملکەچبوون بۆ کۆمەڵانی خەڵك ڕەتدەکاتەوە، ئەو خەڵکانەی کە دەیانەوێت " بمانترسێنن وەکو چۆن منداڵ لەداهۆڵ دەترسێت، بانگەشەی ئەوە دەکەن گوایە دەمانگرن و زیندانیمان دەکەن و ئازارو ئەشکەنجەمان دەدەن".

دوعاو نووشتەی پێچەوانە، هەمووی لەنێو دیالۆگ و وتووێژی دیالیکتیکانەدایە. لەبەرانبەر ئەم قسانەی سیپیس، سوقرات وەڵام دەداتەوە کە نابێت بەتەنیا

بەدوای سیحربازدا بگەڕێن، بەڵکو دەبێت ـ ئەوەش نووشتەو دوعـای بـەهێزترە ـ ڕاهێنان بکەن لەسەر وتووێژی دیالیکتیکانە:

*" پارەو وزەی خۆتان خەرج مەکەن لەگەڕان بەدوای ئەم سیحربازەدا. بەخۆتان بڵێن هیچ شتێك ئەوە نامێنێت پارەی لەپێناودا خەرج بکەن، بەڵکو بڕۆن خۆتان بخەنە نێو قووڵایی ـ ئەوەش کارێکە پێویستە بیکەن ـ گەڕانێکی هاوبەش، ڕەنگە زەحمەت بێت کەسێك بدۆزنەوە لەئێوە بەتواناتر بن لەسەر ئەنجامدانی ئەم کارە" . (دیالۆگی فیدۆن).*

ڕۆچوونە نێو گەڕانێکی هاوبەش، هەوڵدان بۆ ناسینی خود لەمیانەی ئەویترو زمانی ئەویتردا، ئەوە ئەم ڕێوشوێنەیە کە سوقرات نمایشی دەکات و ئامۆژگاریانی پێ دەکات، ڕێنماییەکانی دیلفییان بیردەخاتەوە ـــ Delohikou tou grammatos، دەیخاتە بەردەم ئەلسیپیادیس وەکو ئەوەی ژەهرێکی دژە ژەهر بێت ـ alexipharmakon. لەنێو دەقی دیالۆگی یاساکانیشدا کە ئێمە تازە بەشی خۆمان لێی برد، کاتێك پێویستی هێمای نووسراو بەهێزەوە خرابووە ڕوو. کوتانی دەقەکان ـ grammata بریتی بوو لەخستنە نێو ڕوحی دادوەر وەکو ئەوەی ئەمینترین شوێن بێت، بۆیە دەسپێدەکەینەوەو دەبینین نووسراوە:

*" لەنێو هەموویاندا، پێویستە لەسەر ئەم دادوەرەی دەیەوێت دەست بەدادپەروەری بێلایەنییەوە بگرێت، دەبێت دەقە نووسراوەکەی لەبەردەستدابێت تاوەکو لێی بکۆڵێتەوەو بیخوێنێتەوە. بەڕاستی لەنێو هەموو زانستەکاندا، ئەوەی دەبێتە هۆی باڵاکردن و بەرکردنەوەی ئاستی هزری کەسێك، بریتییە لەیاساناسی، بەمەرجێك بەجوانی و پتەوی*

دانرابێت. ئەگەر ئەم چاکەیەی نەبێت بۆمان، ئەوە دیارە ئێمە بێهوودە ناوێکمان بەخشیوەتە یاسا خوابیە جوانەکان هاوشێوەی ناوی مزریێت ــ nomos-nous. هەموو ئەوەی دەمێنێتەوە، ئینجا ئەم مۆنراوانە بێت کە دانراون و ستایش دەکەن، یا رەخنەدەگرن و سەرزەنشت دەکەن، مۆنراوەی سادەبێت، یا گوتاری نووسراو، یا دیالۆگی رۆژانەی ئازاد بێت کە تێیدا بێنەو بەردەی توونده هەیە، هەموو ئەمانە، لەنێو نووسینەکانی کەسی یاسادانەردا راستی و دروستی خۆیان دەنوێنن ــ ta tou nomothetou grammata.

دادوەری باش، پێویستە ئەمانە لەنێو روحی خۆیدا ئەزبەر بکات ـ a dei auto en kaktemenon، وەکو دژە کوتانێك ــــ alexipharmaka بۆ گوتارەکانی تر. بەم شێوەیە دادوەری باش لەراستەرێی خۆی و شاریش دڵنیا دەبێت، گرێنتی ئەوە دەکات مافەکانی خەڵکی باش دەپارێزێت و گەشەی پێدەدات، هەموو یارمەتییەکی پێویستیش پێشکەش بەشەرخوازو پیاوخراپەکان دەکات تاوەکو دەستبەرداری گەمژەیی و کاڵفامی خۆیان بن، تاوەکو واز لەزوڵم و زۆرداریيان بێنن، مادام هێشتا بوار هەیە هەڵەکانیان چاك بکەنەوە. بەڵام ئەوانەی هەڵەکانیان دەبێتە هۆی ئەوەی چارەنووسیان بخاتە مەترسییەوە، ئەوە کاتێك دادوەرەکان و سەرۆکی دادگاکان بڕیار دەدەن کە مەرگ تاکە چارەسەری ئەم جۆرە کەسانەی لەم شێوەیەیە، ئەگەر بشێت لەتواناماندا

***بێت دووبارەی بکەینەوە، ئەوە بەتەواوی دادپەروەرییەوە دەڵێین پێویستە هەموو شار ئاوا بەرەنگاریان ببێتەوە".***

وتووێژی گێڕانەوەخوازانە ـ anamnese،[1] وەکو ئەوەی دووبارەکردنەوەی ئایدیایە ـ eidos، جیاکردنەوە لەمەعریفە بەخودو کۆنترۆڵکردنی قبووڵ ناکات. ئەوانە ئەم دوو نووشتەو دوعایەن کە پێویست دەکات بیانخەینە بەرانبەر ترسی منداڵ، لەئاست مەرگ و جادووگەری و داهۆڵی ترسناکدا. کاری فەلسەفە بریتییە لەدڵنیاکردنەوەی بچووکەکان، واتا توانای ئەوەیان پێبدات لەدەست منداڵی خۆیان ڕزگاربن و، ئەم منداڵییەیان بیر بچێتەوە. یا بەپێچەوانەوە، لەنێو هەمان بزاڤدا، یەکەمجار فێری ئاخافتن بکرێت، ئینجا دیالۆگ و وتووێژ تاوەکو ترسی نەمێنێت و ئارەزووی هەبێت.

دەتوانین لەنێو چنراوی دیالۆگی سیاسیدا یاری بکەین بەپۆلێنکردنی ئەم جۆرە لەپاراستنەی ــ amunterion کە ناونراوە وتووێژی دیالیکتکی، وا تەماشای بکەین کە پەرچە کردارو دژە. لەنێو ئەم بوونەوەرانەی کە دەشێت بەڕووکەش ناویان ببەین، ئینجا سروشتی بێت یا دەستکرد، بێگانە بەردەوام دەتوانێت شێوازەکانی کار لەیەکتری جیابکاتەوە، هەوڵدان بۆ دەسکەوت ــ poiein لەگەڵ

---

[1] ) گێڕانەوەو باسکردن و خستنەڕووی ڕابردوو بەمەبەستی لەبیرکردن و لێخۆشبوون و کۆتاییهێنان بەم ڕابردووەیە، وەکو ئەوەی لەکاتی گۆڕینی سیستەمی حوکم لەباشووری ئەفریقیا لەسەر دەستی نیلسۆن ماندێلا ڕوویدا، کاتێك تاوانباران هێنرانە بەردەم تاوان لێکراوان و لەبەردەمیاندا دانیان بەتاوانەکانیاندا هێناو، تاوان لێکراوانیش لێیان خۆشبوون، بەهیوای ئەوەی ئەم یادکرنەوەو یادخستنەوە کۆتایی بەم بیرەوەرییانە بێنێت. (وەرگێڕی کوردی)

هۆکارەکانی پاراستن ـ amunteria کە دەبێتە هۆی بەرگرتن لەئازارو تلانـەوەو ئێش ـ tou me paskhein. لەنێو ئازارو تلانەوەو ئێشدا، ئێمە دەتوانین:

١) برینـی پێچـەوانەو دژ ـ alexipharmaka دەستنیشـان بکـەین کـە دەکرێـت مرۆڤانـەبێت، یـا خـوایی، دیـالیکتیکیش لێـرە لـەم لایەنـەدا کەینوونەتی برینـی پێچەوانەو دژە بەگشـتی، پـێش ئـەوەی دابەشـبکرێت بەسەر هەردوو لایەنی خوایی و مرۆڤانە. دیالیکتیـك، بریتییـە لـەو پـردەی ئەم دوولایەنە بەیەکەوە گرێدەدات و دەبەستێتەوە.

٢) کێشـەکان ـ problemata، ئـەوەی لەبەردەممانداپـە ـ بەربەسـت، پەناگـە، حەشـارگەیە، بـۆ ئـەوەی خـۆی لەبـەردەم برینـی پێچـەوانەو دژ بپارێزێت. مرۆڤی بێگانە دێت بەدوای دابەشبوونی ئەم کێشانەدا دەگەڕێت کە دەشێت وەکو سنوورو بەربەست و شـوورا کاربکـەن ـ phragmata لەشـێوەی پـارێزەرو پاراسـتن ـ alexteria لەبەرانبـەر گـەرماو سـەرما، دەشێت ئەمانە ڕۆڵی سەقف و لێفە ببینن بۆ ئەوەی بمانپـارێزن، لێفەیـەك بشێت ڕابخرێت، یا بتوانێت دەوروبەری جەستە داپۆشێت و بیگرێـت. بـەم شێوەیە دابەشبوون بەسەر کۆمەڵێك تەکنیکی جیاوازی پیشەسازی لێفـەو دۆشەکی دەوروبەرمان بـەردەوام دەبێـت و، لەکۆتاییـدا دەگاتـە پۆشـاکی بەرمان کە چنراوە، دەگاتە هونەری ڕستن و چـنین. شـێوە پـۆلێنکراوێکی کێشەداری پاراستنمان. بۆیە ئەم هونەرە، ئەگەر ئێمە بمانەوێت بـەردەوام بین لەسەر ئەم پرۆسەی دابەشکردنە، دەگەڕێتەوە بۆ دژە کوتانەکان، بـۆ ئەم جۆرە، یا ئەویتریان، یا بۆ فارماکۆنی ئاوەژووکراوەی نێو دیالیکتیـك.

دەق خۆی دیالیکتیک بەلاوە دەنێت، لەگەڵ ئەوەشدا، دەبێت بەباشی جیاکاری بکرێت لەنێوان دوو چنراودا، کاتێک بیر لەوە دەکەینەوە کە دیالیکتیک خۆیشی هونەرێکی چنراوە لەپاڵ هونەری چنین و دووریندا ـ sumploke.

کەواتە، سەراوژێرکردنی دیالیکتیکییانەی فارماکۆن، یا زیادەی مەترسیدار، وا دەکات مردن لەیەک کاتدا هەم قبوولکراوبێت، هەمیش سڕاوەو بەلاوەنراو. قبوولکراو، لەبەرئەوەی سڕاوەیە. کاتێک نەمری ڕوح کە وەکو جەستەیەکی پێچەوانەو دژ، بەشێوەیەکی باش پێشوازی لەمردن دەکات، ئەوە ئەم ترسە زۆرەی خۆی دەڕەوێنێتەوە. فارماکۆنی ئاوەژووکراوە کە هانی ڕاکردن دەدات لەداهۆڵەکان، هەر خۆی ئەسڵی مەعریفەیە ـ episteme، ئەسڵی کرانەوەیە بەرەو حەقیقەت وەکو توانای دووباربوونەوەو ماڵیکردنی "ترسەکانی ژیان". ماڵیکردنی لەبەردەم یاسا ـ خێر، باوک، پاشا، سەرۆک، سەرمایە، خۆر، نەبینراوو شاراوە. هەمان ئەم یاسایانە خۆیان لەنێو دیالۆگی کریتۆندا داوای پیشان نەدانی ئەم ترسە دەکەن لەژیان، بەوەش گرنگترین یاساکان پەراوێز دەخەن.

ئەوەی سوقراتیش دەیڵێت کاتێک سیپیس و سیمیاس داوای لێ دەکەن سیحربازێکیان بۆ بدۆزێتەوە، ئەم دێت بانگەشەیان دەکات بۆ دیالۆگ و وتووێژی فەلسەفی، بۆ بابەتێکی گرنگتر کە بریتییە لەحەقیقەتی ئایدیا ـ eidos وەکو ئەوەی حەقیقەتێکە هاوشان و هاوشێوەی خودی خۆیەتی، هەر هەمیشە خۆیەتی، بۆیە سادەیەو لێکدراو نییە ـ asuntheton، چارەسەر ناکرێت و گەندەڵیش نابێت. ئایدیا ئەم شتەیە بەردەوام دەشێت دووبارە ببێتەوە وەکو ئەوەی هەر

هەمان شتە ـــ le meme. ئایدیالییەتی ئایدیا و نەبینراوییەکەی، ئەمانە دوو توانای ئەمن لەسەر دووبارە بوونەوە. بەهەرحاڵ، یاسا بەردەوام یاسای دووبارە بوونەوەیە، دووبارە بوونەوەش بەردەوام گوێڕایەڵییە بۆ یاسا. کەواتە، مەرگ ئایدیا دەکاتەوە وەکو چۆن یاسا دەبێتە دووبارە بوونەوە.

لەکاتی بانگەشەکردنی یاساکان لەنێو دیالۆگی کریتۆندا، سوقرات داواکراوە لەیەك کاتدا، هەم قبووڵی یاساکە بکات، هەمیش بڕیاری مەرگی خۆی. بۆیە پێویستە لەسەری دان بەوە دابنێت کە نەوە، یا کوڕو نمایندە ـــ ekgonos، تەنانەت کۆیلەی ـ doulos یاسایە، ئەم یاسایەی بەهۆی بەیەکەوە کۆکردنەوەو بەستنەوەی باوك و دایکی وایکردووە ئەم بێتە دونیاو بوونی هەبێت. کەواتە، توندوتیژی زۆرترە کاتێك بەرانبەر بەیاسای نیشتیمان ـــ دایك مومارەسە دەکرێت، لەوە زیاتر کە باوك دایك زامدار دەکات. بۆیە یاساکان ئەوە بیری سوقرات دەخەنەوە کە دەبێت هاوشێوەو گونجاو لەگەڵ یاساکان بمرێت، لەم شارەدا کە هەرگیز حەزی نەکردووە لێی بچێتە دەرەوە:

***" سەیرە! باشە حیکمەتی تۆ ڕێگات پێدەدات ئەوە نەزانی کە لەسەر مرۆڤ پێویستە وڵاتی خۆی لەدایك و باوك و هەموو باپیرەکانی زیاتر خۆشبووێت، وڵات لەهەموو شتێك پیرۆزترو بەرزترەو، پێگەیەکی باڵاتریشی هەیە لەبڕیاری خواوەندەکان و مرۆڤە عاقڵەکاندا. کەچی توندوتیژی گونجاو نییە بەرانبەر بەدایك و باوك و، زیاتریش بەرانبەر بەنیشتیمان.***

***ئەی سوقرات، بەڵگەی بەهێز هەیە کە ئێمە جێگای ڕەزامەندی تۆ بووین، ئێمەو دەوڵەتیش ـ polis. تۆش لەهەموو کەسێکی ئەسینا زیاتر خۆت***

*لەنێو ئەم شارەدا زیندانی نەدەکرد، ئەگەر لەهەموو شارێك زیاتر بۆت گونجاو نەبووایە، بۆیە تا ئەم ڕادەیە پێیەوە پەیوەستبووی بەجۆرێك هەرگیز تەنیا بۆ یەکجار چوویتە بەندەر بۆ ئامەنگێك و، بۆ یەکجاریش نەچوویتە وڵاتێکی بێگانە، مەگەر لەهەڵمەتی سەربازیدا نەبووبێت. تۆ وەکو خەڵکانیتر گەشتت نەکردووە بۆ وڵاتانی تر، حەزی ئەوەشت نەبووە بچیت شارێکی ترو یاسایەکی تر بناسیت و بەتەواوی ئێمەو ئەم وڵاتەت ـ polis بەس بووە، لەبەرئەوەی ئێمەت پێ لەهەموو شتێك باشتر بووە، لەبەرئەوەی هەمیشە بەوە ڕازی بوویت لەژێر سایەی سەروەری ئێمەدا بژیت".*

ئەوەیە قسەی سوقراتی، ناچارە جێنشین بێت، هاوڵاتی بێت، لەژێر چاودێریدابێت لەنێو چوارچێوەیەکی خۆجییەتی و خۆماڵیدا. لەنێو شار، لەژێر یاسادا، لەژێر چاودێری توندی زمانەکەی خۆی. ئەوەش دواتر تەواوی مانای خۆی وەردەگرێت کاتێك نووسین وا وەسف دەکرێت کە ونبوونی خودە، بێدەنگ و ڵاڵە لەئاست هەموو جۆرە دوژمنکارییەکدا. نووسین هەرگیز لەنێو هیچ شتێکدا، جێنشین و جێگیر نابێت.

ئایدیا، حەقیقەت، یاساو مەعریفە، دیالیکتیك، فەلسەفە، ئەمانە ناوە جیاوازەکانی تری فارماکۆنن کە دەبێت بخرێنە بەرانبەر فارماکۆنی سۆفیستەکان و ترس لەمردن کە سەرنجی هەمووان ڕادەکێشێت. فارماکووسی سیحرباز لەدژی فارماکووس، فارماکۆن لەدژی فارماکۆن. بۆیە سوقرات گوێ لەیاساکان دەگرێت

وەكو ئەوەی دەنگی یاساكان ئەمیان خستبێتە ژێر كاریگەری سیحرێكی تەلقینی و دەنگدارو بڵاو، دەنگێك ڕوح دەبڕێت و شۆڕدەبێتەوە بۆ نێو قووڵاییەكانی.

***" ئەرموو، با باش بیزانیت ئەی كریتۆنی ئازیز كە من گوێم لەچییە، وەكو چۆن كاهینە وەستاوە ئالگرەوەكانی سیپیل وا هەست دەكەن گوێبیستی دەنگی نای دەبن. بەڵێ، دەنگی ئەم وشانە ـ e eke touton ton logon لەنێو مێشكمدا دەزرنگێتەوەو ڕێگای ئەوەم لێ دەگرن هیچ شتێكی تر ببیستم".***

كاهینی ئالگرتنەوەی سیپیل و نای، هەموو ئەمانە ئەلسیپیادیس لەنێو دیالۆگی خواندا ئامادەیان دەكاتەوە تاوەكو بیرۆكەیەكمان پێشكەشبكات لەبارەی جێكەوتی قسەی سوقرات:" كاتێك گوێبیستی دەبم، ئەوە دڵم زیاتر لەوە لێ دەدات كە كاهینەكانی سیپیل لەكاتی هەڵچوون و چێژ وەگرتندا دڵیان لێ دەدات".

سیستەمی فەلسەفی و ئەپستیمی لۆگۆس، هێزێكە خراوەتە نێو ئابووری گشتی و نا لۆژیكییانەی فارماكۆن. ئەم قسەیەی ئێمە زێدە شرۆڤەیەك نییە بیخەینە سەر قسەكانی ئەفلاتون، بۆیە با پێكەوە تەماشای ئەم قسانە بكەین كە كریتیاس دەیكات و تێیدا دەڵێت:" با دوعا لەخوا بكەین تاوەكو خۆی باشترین تریاكمان پێبدات ـ pharmakon teleotaton كە باشترین جۆرەكانی تریاكە ـ ariston pharmakon، ئەویش مەعریفەیە ـ epistemen". دەتوانین لەنێو دیالۆگی خارمیدسیش، بەتایبەتی لەدیمەنی یەكەمدا، كە پێویست دەكات چركە بەچركە لەگەڵیدا بڕۆین، دەبینین سوقرات كە سەرسامە بەخارمیدیس، سەرسامە بەڕوحی ئەم كوڕەی كە حەزی بەفەلسەفەیە. دەبینین كاتێك دەگەڕێن

بۆ ئـەوەی خارمیـدیس ببەنـە لای پزیشـکێك بتوانێـت لەسەریەشـەکەی چـاکی بکاتـەوە، ئـەوە سـوقرات ڕازی دەبێـت خـۆی وا نمـایش بکـات گوایـە چارەسـەری سەریەشـەی لایـە. ئـەوەی لێـرەدا دەیبیـنین نزیکـە لەهـەمان دیمـەنی فیـدرۆس لەشاردنەوەی فارماکۆنێکی دیاریکراو لەژێر عەبادا:

***" ئینجا کاتێك کریتیاس پێی دەڵێت گوایە من خاوەنی دەرمانی چارەسەریم ـ o to pharmakon epistamenos، بەڕوانینێك تەماشای کـردم کـە نـاتوانم وەسـفی بکـەم و بەشـێوەیەك جوولایـەوە کـە بیـەوێت بەقسـەم بێنێت، کاتێکیش خەڵکانی تر هاتن وەکو بازنەیـەك لـەدەورمان دانیشـتن و کۆبوونـەوە، ئـەم کاتـە، ئـەی هـاوڕێی بـەڕێزم، لـەنێو درزێکـی عەباکەیـدا جوانییەکم بینی سەرسامی کردم و مێشکم لەلای خۆم نەما. لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێك لێی پرسیم ئەگەر من دەتوانم چارەسەری سەریەشە بکەم ـ to tes kephales pharmakon، وەڵامم دایەوە کـە ئـەوە گیایەکـە هەنـدێك شتی تری تێکەڵ دەکرێت لەگـەڵ دەرمانەکـە، ئینجـا کاریگـەری دەبێـت.[1]***

***ئەویش گووتی: زۆرباشە من ئەم شتانە دەنووسم کە تۆ دەیانڵێیت".[2]***

---

١) ئەوەی لێرەدا دەیبینین سوقراتی پزیشکەن کاتێك ڕێگا بەخۆی دەدات نـەخۆش چارەسـەر بکات و دەرمان ـ فارمـاکۆنی بـۆ بنووسـێت بـۆ چارەسـەری. دریـدا ئـەم دەقـە بـۆ ئـەوە دێنێتەوە یادمان تاوەکو بتوانێت ئالۆزی و فرەیی کەسایەتی سوقراتمان پێ نیشـان بـدات کە چۆن دەتوانێت ڕۆڵی تریش بگێرێت، ئەوەش جۆرێکە لەنزیکی لەڕۆڵی کەسایەتی تووت ـ تەحووت لەنێو میتۆلۆژیا میسرییەکاندا. (وەرگێڕی کوردی)

٢) بێگومان لێرە لەم دیمەنەدا تێبینی هەبوونی سەدایەکی نامۆو سەراوژێرو هاوشانی دیمـەنی فیدرۆس دەکـەن. دڵ، ئـەم یەکەیـەی لـەژێر عـەباوە دەنێردرێـت، دەقێـك و فارماکۆنێـك،

بەڵام خۆ ناكرێت سەر بەتەنیا چارەسەر بكرێت. پزیشكە زیرەكەكان هەمووی بەیەكەوە چارەسەر دەكەن، "كاتێك سەرقاڵی چارەسەركردنی هەموون، ئەوە لایەنە نەخۆشەكەش چارەسەر دەبێت". ئینجا خۆی وا پیشاندەدات كە شارەزایی لەپزیشكێكی تراسی ــ مەبەست ناوچەی تراسیایە ــ وەرگرتووە " یەكێك لەقوتابییەكانی زالموكسیس، ئەوانەی دەڵێن گوایە حاڵەتی كەسانی نەمر دەزانن"، سوقرات ئاماژە بۆ ئەوە دەكات كە جەستە چاك نابێتەوە تەنیا لەسەرچاوەی هەموو خۆشی و ناخۆشییەكانیەوە نەبێت، ئەویش ڕوحە. " بەڵام دەرمانی ڕوح بریتییە لەهەندێك باڵابوون ــ epodais tisin. ئەم باڵابوونە لەم وتارە جوانانەدایە كە ڕوح لەنێو حیكمەتدا بەرهەمیان دێنێت ــــ sophrosunen. كاتێك ڕوح بۆ یەكجار دەبێتە خاوەنی حیكمەت و ئەزبەری دەكات، ئەو كاتە ئاسانە سەرو هەموو لەش تەندروستی وەربگرن". ئینجا دوای

---

یەكێكیان لەنێو ئەویتریان، پێشتر نووسراوە لەنێو فیدرۆسدا. فارماكۆن دەقێكی نووسراوە لەسەر دەستی بەتواناترین نووسەرەكانی ئێستا، لەنێو خارمیدیسیشدا نووسراوە (دەرمانی فارماكۆن كە لەسەر دەستی سوقرات نووسراوەو لەلایەن ئەمەوە دانراوە). ئەم دەرمانەی سوقرات لێرەدا زارەكییە، گوتارەكەش هاوشانی فارماكۆنە وەكو مەرجێك. پێویستە ئێمە ئەم دیمەنەو باكگراوندەكەی دووبارە بكەینەوە لەنێو دڵی دیالۆگی سیاسیدا، خوێندنەوەی ڕەخنەی ئەم دەرمانە پزیشكییەی كە نووسراوە، جێكەوتی نووسراو ــ hypomnemata graphein، كە چەقگیرییەكەیان لەگەڵ دەگمەنی و پێشفەچوونی نەخۆشییەكە ناگونجێت: نموونەیەكی ڕوونكراوە بۆ كێشەی سیاسی لەنێو یاسا نووسراوەكاندا. وەكو چۆن پزیشك دەگەڕێتەوەو سەردانی نەخۆشەكانی خۆی دەكات، پێویستە یاسادانەریش بتوانێت هەمواری دەقە یاساییە بەراییەكانی خۆی بكاتەوە.

ئەمە، دەچنە سەرباسی جەوهەری حیکمەت، باشترین فارماکۆن و چارەسەری سەرەکی.

بەم شێوەیە، فەلسەفە ڕووبەڕووی ئەویتری خۆی دەبێتەوە ــ نافەلسەفە ــ لەمیانەی ئەم وەرچەرخانەی دەرمان ـ عەقار ـ بۆ دەرمان،[1] ژەهر بۆ ژەهرێکی دژو پێچەوانە. ئەم پرۆسەیە مومکین نابێت ئەگەر فارماکۆن ــ لۆگۆس لەنێو خۆیدا کۆنترۆڵی ئەم هاوکارییە نەکات لەنێوان بەها دژەکان و، ئەگەر فارماکۆن بەگشتی پێش هەموو جیاکارییەك، ئەم شتە نەبێت کە وەکو چارەسەری پێشکەش دەکرێت، بەڵام دەکرێت بگۆڕێت و ببێتە ژەهر، یا ئەوەی وەکو ژەهر پێشکەش دەکرێت. دەکرێت وا پیشانبدرێت کە چارەسەرییەو دەرمانە، بەڵام دواتر ئەم چارەسەرییەی خۆی وەکو حەقیقەتێك بەرجەستە بکات. ماهییەتی فارماکۆن لەوەدایە کە هیچ ماهییەتێکی جێگیری نییە، هیچ تایبەتمەندییەکی تایبەتی نییە، جەوهەرێك ــ substance نییە بەهیچ مانایەك لەماناکانی ئەم زاراوەیە (میتافیزیکی، فیزیکی، کیمیایی).

فارماکۆن هیچ ناسنامەیەکی ئایدیالی نییە، نە ماهییەتی هەیە نە ئایدیا ــ aneidetique، چونکە تاك ئایدیا نییە بەو مانایەی کە فیدۆن لەبارەی ئایدیاوە قسە دەکات وەکو ئەوەی سادەو لێکنەدراو بێت ـ monoeides. ئەم دەرمانە

---

[1]) لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە دەرمان ــ عەقار بۆ خۆی چارەسەرییەکی وەهمییە، هێمن دەکاتەوەو وا پیشاندەدات کە چارەسەر دەکات، لەبری ئەوەی بەڕاستی چارەسەری پێشکەشبکات.

توخمێکی سادە نییە، بەڵام مانای ئەوەش نییە کە پێکهاتەیەکی ـ suntheton هەستی یا هەڕەمەکییە لەجەوهەری فرەی سادە بەرهەم هاتبێت.

بەگشتی بریتییە لەم نێوەندەی پێشوو کە جیاوازی و لێکدابڕانی تێدا ڕوو دەدات، بەرانبەر یەکتردانانی ئایدیایە لەگەڵ ئایدیایەکی تر. ئەم نێوەندەی هاوشێوەیە لەگەڵ ئەوەی کە دواتر بەدی دەکرێت، دوای بڕیاری فەلسەفی و بەپێی ئەم بڕیارەی خەیاڵی ترانسندنتالی، ئەم هونەرە شاراوەیەی نێو قووڵایی ڕوح، کە نە ئەنجامی هەستناکییەو، نە ئەنجامی ماقووڵییە. نە هەڵقووڵاوی نێگەتیڤەو، نە کارایی. ئەم نێوەندەی ــ توخمە سادەیە بەردەوام هاوشێوەی نێوەند ــ تێکەڵەیە. بەجۆرێك لەجۆرەکان، ئەفلاتون بیری لەم ئیشکالییەت و ئالۆزییە کردۆتەوە، بۆیە هەستاوە دایڕشتۆتەوە. بەڵام، بەشێوەیەکی تێپەڕ ئەم کارەی کردووە، بەنهێنی، لەبارەی یەکێتی دژەکان لەنێو چاکەکاریدا، نەوەکو یەکێتی چاکەکاری و دژەکەی:

***" بێگانەکە: تەنیا لەنێو سروشتی خۆڕسك کە ئەنجامی پەروەردەیە، دەکرێت ئەم جۆرە یاسایانە بێنەبوون، هەر بۆیە هونەر ئەم دەرمانەی دۆزیوەتەوە ــ pharmakon، وەکو پێشتر گوتمان، بەڕاستی ئەوە نیعمەتێکی خواییە کە دەبێتە هۆی ئەوەی لایەنەکانی چاکەکاری یەکبخات، هەرچەندە سروشتیان ناکۆك و دژکار بێت و بەرەو خولیای جیاوازیش بڕۆن" . (دیالۆگی سیاسی).***

ئەم نا ــ جەوهەرە دەرمانخانەییە، بەتەواوی متمانەوە ڕێگا بەوە نادات چارەسەری بکات، نە لەنێو کیانیدا ــ مادام خاوەنی کیان نییە، نە لەنێو

کارابیەکەی، مادام دەتوانێت بەبێ دابڕان ڕووگەی خۆی بگۆڕێت. بەم شێوەیە، کاتێك لەلایەن تووت، نووسین دەبێتە مزگێنی بەخشێك وەکو دەرمان، وەکو عەقارێکی بەسوود، ئەوە لەلایەن پاشاوە سەراوژێر دەکرێتەوەو ئیدانە دەکرێت. دواتریش، بەنوێنەرایەتی پاشا، لەلایەن سوقراتەوە وەکو جەوهەرێکی زیانبەخش و تریاقێك کە بیرچوونەوە لەگەڵ خۆی دێنێت، تەماشا دەکرێت و بڕیاری لەسەر دەدرێت. بەپێچەوانەوە، تەنانەت ئەگەر ئەم خوێندنەوەیە ڕاستەوخۆش نەبێت، بەڵام ژەهری شوکران، ئەم ژەهرەی کە لەنێو دیالۆگی فیدۆندا ناودەنرێت فارماکۆن،[1] وەکو ژەهرێك پێشکەشی سوقرات دەکرێت، ئەم ژەهرە بەهۆی کاریگەری لۆگۆسی سوقراتی و بەڵگەی فەلسەفی لەنێو دیالۆگی فیدۆندا، دەبێتە ڕێگاو، شێوازی چارەسەری و، ڕزگاربوون، هێزێك توانای پاککردنەوەی هەیە. ئەم ژەهرە کاریگەری ئەنتۆلۆژی هەیە، تەلقینی تێڕامانە لەئایدیاو نەمری ڕوحە،[2] سوقرات هەر بەم ناوە دەیخواتەوە.

---

[1]) لەنێو دەسپێکی ئەم دیالۆگەدا، ئیشقراتیس دەپرسێت: ئەی فیدۆن، تۆ خۆت لەوێ بوویت کاتێك سوقرات ژەهرەکەی ـ pharmakon خواردەوە لەنێو زینداندا؟ ئینجا لەکۆتایی دیالۆگەکەشدا، سوقرات دەڵێت: پێدەچێت وا باشتر بێت خۆم شووشتبێت پێش ئەوەی ژەهرەکە بخۆمەوە ـ pharmakon، و ژنان ئەزیەت نەدەم بێن لاشەکەم بشۆن.

[2]) کەواتە دەشێت وادابنرێت کە ژەهری شوکران، ئەویش جۆرێکە لەفارماکۆن بۆ نەمری، یا ئەوەی پێی دەڵێن ئەکسیری ژیان. بەوەش ئێمە دەبێت لەم شێوە سرووتییە ڕابمێنین کە لەکۆتایی دیالۆگی فیدۆندا هەیە. هەروەها بگەڕێینەوە بۆ دیالۆگی خوان، بەتایبەتیش ئەگەر تەماشای ئەم کتێبە بکەین (پلانێکی سەرەتایی بۆ توێژینەوە لەمیتۆلۆژیای هیندی ـ ئەورووپی بەراوردکار) کە لەلایەن جۆرج دومێزیل نووسراوەو، تێیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە لەنێو ئەسینادا جێکەوتی بازنەی (تیزی) ـ تیزی، بەیۆنانی دەبێتە تیزیۆسی

ئایا هیچ گەمەو دەسکردێك هەیە لـەم نزیکبوونەوەیـە دابـڕاوەدا؟ چـونکە ئێمـە بەتایبەتی ئاماژە بۆ گەمەکردن ـ وازی دەکەین لەنێو ئەم جوولەیەداو، ئەم دڵەش ئیجازەی پێدراوەو داواکراوە لێی ئەم فارماکۆنە بکاتـە بـەر. هـەر تـەنیا لەمیانـەی دابەشـکردن و دوورینـەوەی نێـوان خێـرو ــ شـەڕدا، بـەڵکو لەمیانـەی گێڕانـەوەی دووانـەی نێـوان هـەردوولای تـەواو جیـاواز (ڕوح ــ جەسـتە، بینـراو ــ نـەبینراو). جـارێکیتریش دەڵـێین، ئـەم دابڕانــە دووانەیـەی نێـوان دوو تـوخم کـە پێشـتر لێکدابڕاون، ئاڕاستەی هەمان شتمان دەکاتەوە، کە هـەرگیز ناکاتـە هاوشـێوەیی و توخمی هاوبەش. بەم شێوەیە نووسین دەبێتە پێدراوێك، وەکو شتێ:ی هەسـتی، بینراو، لەنێو پانتایی لەبارەی یادەوەریدا. ئینجا دوای ئەمە، ئەوە ئاشکرا دەکـات کە زیانبەخش و سڕکەرە بۆ ناوەوەی نەبینراوی ڕوح و، یادەوەری و، حەقیقەت.

---

پاڵـەوانی نێـو میتۆلۆژیـا یۆنانییـەکان کـە دێـت میناـتۆری دڕەنـدە دەکوژێـت ــ کـە پێوەندییەکی پتەوی هەبووە لـە (تارگیلیـات) ــ لـەنێو ڕۆژژمێـری یۆنانیـدا هەنـدێك بۆنـە هەبووە لەنێوان ڕۆژانی (٦/٢٢) تاوەکو (٧/٢٢) کە تێیـدا سـرووتەکانی ئـۆزیریس بـەڕێوە دەچوو، یەکێك لەم سرووتانە دەرکردنی فارماکۆنە بۆ دەرەوەی شارو قوربانی پێدانیـەتی و، دریدا دێت لەبڕگەی شەشەمی ئـەم کتێبـەدا باسـی لێـوە دەکـات. لەڕاسـتیدا پێویسـت دەکـات ئێمـە لەشـوێنێکی تـردا باسـی پێوەندییـەکی دیـاریکراوی نێـوات تارگیلیـات و لـەدایکبوون و مردنـی سـوقرات بکـەین. دۆمێزیـل دەنووسـێت:" نـە فێرسـیدیس و نـە ئەپۆلۆدۆریس ئاماژە بـۆ ئـەم سرووتانە ناکـەن کـە ڕەنگـە لەبەشـێك لەیۆنانـدا، بەرانبـەر بووبێت لەگـەڵ چـیرۆکی فارمـاکۆنی نـەمری کـە پیـاوە دێوەکـان خـەونیان پێـوەدەبینی، هەروەها باسی چیرۆکی (خواوەندە دەسکردەکان) یش ناکەن لەئەسینادا کـە دەیـانتوانی وا لەپیاوە دێوەکان بکەن نەمرییان لێ بسێننەوە.

بەپێچەوانەوە، ژەهری شوکرانی حەقیقەت وەکو ژەهرێکی زیانبەخش و سرکەری لەش پێشکەش دەکرێت. ئینجا خۆی وا پیشاندەدات کە بۆ ڕوح بەسوودەو ڕزگاری دەکات لەجەستە و چاوی دەکاتەوە بەسەر حەقیقەتی ئایدیادا. لەبەرئەوەی فارماکۆن ئالۆزە، دوولایەنەیەو جێگای متمانە نییە، ئەوە دێت نێوەندێك پێکدێنێت کە تێیدا هەموو شتەکان دژ بەیەك دەوەستنەوەو گەمەو جوولە دەستپێدەکات کە دەبێتە هۆی ئەوەی یەکێك ئاڕاستەی ئەویتری بکات ون بەرانبەر بەیەك بکەونەوەو وایان لێبکەن بەنێو یەکتریدا تێپەڕبن. (ڕوح — جەیستە، خێر ـ شەڕ، تەندروستی ـ نەخۆشی، ناوەوە ـ دەرەوە، یادەوەری ـت بیرچوونەوە، ئاخافتن ـ نووسین، ... تاد).

بەڕامان لەم گەمەو وازییە، یا لەم جوولەو بزاڤە، ئەوە دژە ناکۆکەکان، یا ئەوانەی جیاوازن، لەلای ئەفلاتونەوە بڕیاریان لەسەر دەدرێت. فارماکۆن خۆی، بریتییە لەجوولەو بزاڤی جیاوازی، شوێنگەو گەمەو بەرهەمەکەی، هەر هەمووی بریتییە لەجیاوازی نێو جیاوازی ـ جیایی و دواخستن. لەنێو تاریکی خۆیدا، دێت ئەم شتانە عەمبار دەکات کە هێشتا یەکلایی نەبوونەتەوە، ئەم جیاوازی و ناکۆکییانەی کە دواتر دێت تاوەکو لەیەکتریان دابڕێنێت. دژکاری و ناکۆکی نێوان دژەکان، خۆی لەسەر بنەمای ئەم عەمبارە جیاکاری و جیاوازییە بونیاد دەنرێت. مادام ئەم عەمبارە خۆیشی جیاواز بووە پێشتر، ئەوە دەکەوێتە پێش ناکۆکی و دژکاری کاریگەرییە جیاوازەکان. جیاوازی بەو مانایەی کە بریتییە لەکاریگەری، کەواتە ئەوەندە ورد نییە تاوەکو بتوانێت خاوەندارێتی یەکێتی دژەکان بکات. تا ئێرە دیالیکتیك دێت تاوەکو خۆی بخزێنێتە نێو فێلەکانی فەلسەفە. فارماکۆنیش

بەبێ ئەوەی خۆی هیچ شتێك بێت، بەردەوام دێت ئەم فێڵانە دەبەزێنێت. ئەم بەردەوام و هەمیشە لەنێو حاڵەتی عەمبارکرندایە، ئەگەرچی خاوەنی ئەم هەموو قووڵاییە بنچینەییەو شوێنگە بێکۆتاییەش نییە. ئێمە دەبینین کە چۆن بێکۆتایی خۆی بۆ ئامادە دەکات، بەردەوامیش لەمیانەی دەرگا شاراوەکانەوە خۆی دەدزێتەوە. ئەم عەمبارەی کە لەدواوە شاردراوەتەوە، ئەوەیە کە ئێمە ناوی دەنێین دەرمانخانە ـ pharmacie.

یەکێك لەبنەماکانی گەمەکردن، ئەوەیە وا پیشانبدرێت گەمەکە وەستاوە، ئەو کاتە فارماکۆن کە لەهەردوو دژەکە پیرترە، لەلایەن فەلسەفەوە دەسگیر دەکرێت، هەروەها لەلای ئەفلاتونییەتیش لەسەر بنەمای ئەم دەسگیرکردنە دامەزراوە. ئێمە دەڵێین دەسگیرکراوە، وەکو تێکەڵاوکردنی نێوان دوو تـوخمی پـەتی و ناکۆك. دەتوانین بەدوای زاراوەی فارماکۆندا بچین وەکو سەرەداوێك تا دەمانگەیەنێتە تەواوی ئێشکالییەتی ئەفلاتونی بۆ تێکەڵاوی. ئەم فارماکۆنەی دەسگیرکراوە[1] وەکو ئەوەی جۆرێکە لەتێکەڵەیەك لەگەندەڵی، لەهەمان کاتیشدا وەکو تێکشکێنەرێك و هێرشبەرێك کار دەکات و بێگەردی و پاکی جەوانی دەخاتە مەترسییەوە.

ئەم جۆرە دەستنیشانکردنە زۆر گشتییانەیەو، دەکرێت لەحاڵەتی هەبوونی ئەم جۆرە توانایەی هەڵسەنگاندن، لێی دڵنیابین. چارەسەری سەرکەوتوو و گاڵتەجاڕی سوقراتی دێن بۆ ئەوەی سیستەمی ناوخۆیی دووچاری دڵەڕاوکێ بکەن. ئەو کاتە، بێگومان ناکرێت بێگەردی و پاکی ناوخۆیی چاکبکرێتەوە، تەنیا لەمیانەی ئیدانەکردنی بەرانییەت نەبێت بەوەی دەبێت وەکو زیادەیەکی نا سەرەکی تەماشا بکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ جەوهەر زیانی هەیە. زیادەیەك پێویست نەبوو بێت

[1]) ئەفلاتونییەت لەسەر بنەمای ئەم دەسگیرکردنەی فارماکۆن دامەزراوە، بەو مانایەی لەمیانەی ئەمەوە مانای خۆی دادەمەزرێنێت.

تاوەکو کەمالی ناوخۆیی تەواو بکات، کەمالی ناوخۆیی خۆی بێگەردەو پێویستی پێ نییە. بۆیە پێویستە لەسەر چاککردنەوەی جەوانی، جارێکی تر دەسپێبکاتەوەو بیگێڕێتەوە ـ ئەوەش خودی میتۆلۆژیایەکەیە. واتا بۆ نموونە، میتۆلۆژیای لۆگۆس دێت ئەسڵی خۆی دەگێڕێتەوەو بەرز دەبێتەوە تاوەکو دەگاتە بەرلەدەستدرێژی فارماکۆنی ـ نووسراو.

دەڵێین پێویستە لەسەری، سەرلەنوێ دەسپێبکاتەوەو ئەم شتانە بگێڕێتەوە کە پێویست نەبوو فارماکۆن بێت تاوەکو بۆی زیاد بکات، بەم شێوەیە دێت تاوەکو ببێتە مشەخۆر بەسەریدا، وشەیەك دێت لەنێو جەستەیەکی زیندوودا جێگیر دەبێت تاوەکو بەشە خۆراکەکەی بۆ خۆی ببات و گوێچکەشی ئاڵۆز بکات و نەهێڵێت گوێی لەدەنگێکی ساف و پەتی بێت. ئەوەیە پێوەندی نێوان زیادەی نووسین و لۆگۆس ـــ ئاژەڵ. بۆ چاککردنەوەی لۆگۆس لەدەست فارماکۆن و دەرکردنی ئەم مشەخۆرەی لەسەری دەژییێت، پێویستە جارێکیتر دەرەوە، سەرلەنوێ بخرێتەوە شوێنی خۆی. هێشتنەوەی دەرەوە هەر لەدەرەوە، ئەوە جوولەیەکی باشە بۆ لۆژیکی خودی تەندروست وەکو چۆن لەگەڵ خودی ئەم شتەدا دەگونجێت کە بوونی هەیە. بوون وەکو ئەوەی هەیە، دەرەوە لەدەرەوەو ناوەوەش لەناوەوە. ئەوەش مانای وایە پێویستە لەسەر نووسین سەرلەنوێ ببێتە ئەو شتەی کە هەرگیز نەوەستاوە بۆ ئەوەی ببیتێ، شتێکی لاوەکی، ماکیاج، زیادە.

بۆیە، چارەسەرکردن لەمیانەی لۆگۆس، نووشتەو دوعا، هەموو ئەوانە وا دەکەن زیادە پێویست نەبێت و ئیلغابێتەوە. مادام ئەم ئیلغابوونەوەیە مۆرکێکی

چارەسەرییانە هەیە، پێویستە لەسەری هانا بۆ ئەم شتە ببات کە لەخۆیدا دەری دەکات، ئەوەی بەزارەکی دەیڵێت، بیباتە دەرەوە. دەبێت ئەم پرۆسەی کاری دەرمانخانەییە، ڕاستەوخۆو بەتەواوی بەلاوەبنرێت.

باشە ئەمە مانای چییە؟ نووسین چییە؟

ئەفلاتون نایەت بەشێوەیەکی زنجیرەیی[1] و یەك لەدوای یەك ئەم دەلالەتانە نمایش بکات و بیانخاتەڕوو کە ئێمە لێرەدا هەوڵدەدەین هێدی هێدی و لەسەرەخۆ هەڵیاندەکۆڵین. ئەگەر خستنەڕووی پرسیارێکی لەم شێوەیە هیچ مانایەکی هەبێت، کە ئێمە پێمان وانییە هەیبێت، ئەوە ئەستەمە بڵێین تا چ ڕادەیەك ئەفلاتون گەمە بەم زنجیرەیە دەکات، بەویستی خۆی و بەوشیاری، یا ئەستەمە بڵێین تا چ ڕادەیەك بەناچاری دەچێتە ژێرباری هەندێك شتی وەکو ئەوانەی قورسایی و سێبەری خۆیان دەخەنە سەر گوتار لەمیانەی "زمانەوە"،[2] زاراوەی "زمان" لەمیانەی هەموو ئەم شتانەی کە پێیەوە پەیوەستن و ئێمەش لێرەدا دەیانخەینە ژێر پرسیار، ئەوە هیچ یارمەتییەکی گونجاومان پێشکەش ناکەن.

---

[1]) ئەم زاراوەیەی لێرەدا بەکارهێنراوە زنجیرەیی ـــ chaine بەمەنای پێوەندو کەلەپچەی دەستیش دێت، لەهەمان کاتیشدا بەمانای گرێچنی نێو ڕستن و چنینیش بەکاردێت، بەوەش لێرەدا دیسان دەگەڕێینەوە سەر نموونەی ڕستن و چنین کە لەنێو ئەم توێژینەوەیەدا لەزۆر شوێن دریدا کاری لەسەر کردووە.

[2]) لێرەدا دریدا چەمکی زمان بەمانای زمانی نێو دەمی مرۆڤ بەکاردێنێت و گەمە بەوشەکان دەکات، تەنانەت لەنێو وەرگێڕانە عەرەبییەکەشداو لەنێ، زمانی عەرەبیش زمانی نێو دەمیش کاتێك بەکاردێت، دەشێت بەهەمان شێوە بەمەنای زمانی ئاخافتن و نووسینیش بەکاربێت. (وەرگێڕی کوردی)

بەردەوام بوون و بەدواداچوون بۆ ناچارکردنی زمانێك، ئەوە بەدوور ناگرێ ئەفلاتون ویستبێتی لەم بارەیەوە گەمە بەم ناچارکردنانەی زمان بکات، تەنانەت لەم حاڵەتەشدا کە ئەم جۆرە گەمەکردنە بەویستی خۆی نەبێت و گوزارشتیش نەکات لەکارەکەی. ئەم ڕێوشوێنە دەقگەرایانە، لەباکگراوندەوە ڕوو دەدەن. لەنێو تاریکی دەرمانخانەکان، پێش ئەوەی لەبەردەم دوالیزمی وشیاری و ناوشیاری بێت، یا دوالیزمی ئازادی و ناچاری، ئارەزوو و نا ئارەزوو، گوتارو زمان بێت.

لەم چرکەساتەدا کە تێیدا نووسین جێکەوتی پۆزەتیف و نێگەتیفی لێ دەکەوێتەوە، پێناچێت ئەفلاتون زۆر جەخت بکاتە سەر زاراوەی فارماکۆن، کاتێك ژەهر لەبەردەم پاشا دادەنرێت گوایە ئەمە حەقیقەتی دەرمانە. ئەم نالێت فارماکۆن هۆکاری ئەم گواستنەوەیەیە، هەڵکرو قسەکەری ئەم حاڵەتەیە. لەکاتێکدا، دواتر دێت ـ ئێمەش دەگەڕێینەوە سەری ـ بەڕوونی نووسین و وێنە بەراورد دەکات، ئەفلاتون نایەت ئەم بڕیارە بخاتە نێو پێوەندییەکی ڕاشکاوانە لەگەڵ حەقیقەتی ئەوەی کە خۆی دێت لەشوێنێکی تردا وێنە ــ ڕەسم وەکو فارماکۆن ناودەبات. چونکە لەنێو زمانی یۆنانیدا فارماکۆن بەمانای بۆیەش بەکاردێت، بۆیەیەك کە خاوەنی ڕەنگی سروشتی نەبێت، بەڵکو بۆیەیەکی دروستکراوی کیمیایی، بۆیەیەکی کیمیایی کە دەبێتە هۆی ئەوەی ڕەنگ بەشتەکان ببەخشێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، هەموو ئەم دەلالەتانە، بەوردتریش بڵێین، هەموو ئەم زاراوانەی لەنێو دەقی ئەفلاتوندا دەردەکەون و بوونیان هەیە. بەهەرحاڵ، بۆیە

دەشێت بگوترێت هەموو ئەم زاراوانەی پێوەندییان بەدەرمانخانەوە هەیە کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کردن، بەکردارەکییانە بوونی خۆیان دەسەلمێنن لەنێو دەقی دیالۆگەکاندا. وشەیەکی تر هەیە، بەپێی زانیارییەکانی ئێمە، ئەفلاتون هەرگیز بەکاری ناهێنێت، ئەگەر ئێمەش بمانەوێت بیخەینە پێوەندی لەگەڵ زنجیرەییدا ـــ pharmakeia-pharmakon-pharmakeus، ئەو پاڵەوانەی دەکرێتە قوربانی، فارماکۆنی سیحرباز. ئێمەش لێرەدا چیتر ناتوانین هەر بەوەندە بووەستین کە سەرلەنوێ ئەم زنجیرەیە ڕێکبخەینەوە، چونکە نهێنییەو لەلای ئەفلاتونیش ئاماژەی بۆ نەکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا بەهەندێك خاڵی ئامادەگیدا تێپەڕ دەبێت دەکرێت لەنێو دەقەکاندا پەنجەیان بخەینەسەر. ئەم وشەیەی ئێستا دەچینە لای و، لەنێو زمانیشدا ئامادەگی هەیەو ئاڕاستەی ئەزموونێکمان دەکات کە ئێستا لەنێو کولتووری یۆنانیدا بوونی هەیە، تەنانەت لەسەردەمی ئەفلاتونیش بوونی هەبووە. لەگەڵ ئەوەشدا، لەنێو دەقی ئەفلاتوندا ئامادەگی نییە.

بەڵام لێرەدا ئامادەو نا ئامادە مانای چییە؟ وەکو هەر دەقێکی تریش، دەقی ئەفلاتونیش ناتوانێت خۆی لەم بەریەککەوتنە، گریمانەیی و، دینامیکی و، لارە، لەگەڵ هەموو زاراوەکانی کە سیستەمی زمانی یۆنانی پێکدێنن، بدزێتەوە. هێزەکانی بەیەکەوە بەستنەوە لەسەر ئاستی کۆمەڵێك مەوداو بەهێزەوەو بەشێوەو فۆڕمی جیاواز، دەڵێین ئەم زاراوانەی ـ کە بەکردارەکییانە ئامادەن ـــ لەنێو گوتارێکدا، بەهەموو زاراوەکانی تری نێو سیستەمی فەرهەنگی دەبەستێتەوە. لێرەدا ئەوە گرنگ نییە کە ئەم زاراوانە وەکو زاراوە دەردەکەون ـــ مەبەست یەکەی دەربڕینی ڕێژەییە لەنێو گوتارێکی دیاریکراودا ـــ دەرناکەون.

هەموو ئەم زاراوانە لەمیانەی گەمەی بونیادییەوە لەگەڵ یەکتردا لەپێوەندیدان، بەلایەنی کەم، لەمیانەی یەکەی بچووکی زمان کە ناویان دەنێین "وشە". بۆ نموونە، زاراوەی فارماکۆن، لەگەڵ هەموو زاراوەکانی تری نێو هەمان خێزان بەردەوام لەپێوەندیدا دەبێت ــ بەتەنیا هەر ئەوە ناکات ــ لەگەڵ هەموو ئەم دەلالەتانەی کە لەهەمان ڕیشەی زمانەوانی هەڵهێنجراون. زنجیرەی دەقگەرایی کە دەبێت بەم شێوەیە بیگێڕینەوە بۆ شوێنی خۆی، زۆر بەسادەیی، سەر بەفەرهەنگی ئەفلاتونی نییە. ئێمە لەمیانەی بەزاندنی ئەم فەرهەنگەوە، هەوڵنادەین هەندێك سنوور ببەزێنین، ئینجا ڕاست بێت یا هەڵە، بەڵکو بەڕاستی دەمانەوێت گومان لەدروستکردنی ئەم سنوورانە بکەین.

بەکورتی، پێمان وانییە دەقێکی ئەفلاتونی هەبێت بەسەر خۆیدا داخراوبێت و خاوەنی ناوەوەیەکیش بێت بۆ خۆی و دەرەوە. ئەم قسەیە مانای ئەوە نییە ئێمە لەئێستاوە پێمان وابێت ڕەوشەکە بەشێوەیەکە خەریکە ئاو لەهەموو لایەکەوە دێتە ناوەوەو دەشێت بەلەمەکە نقووم بێت. بەڵکو زۆر بەسادەیی، بەمەرجێك برگەکان بناسین و بەوریایی مامەڵە بکەین، ئەوە دەتوانین ئاماژە بۆ هێزی شاراوەی ڕاکێشان بکەین کە دێن وشەی ئامادەی نێو دەقی ئەفلاتونی، بەوشەی نا ئامادەی نێو ئەم دەقە ببەستنەوە. ئەم جۆرە هێزانە، بەڕەچاوکردنی سیستەمی زمان، نەیاندەتوانی قورسایی خۆیان بخەنە سەر ئەم دەقەو بیخوێننەوە. بەپێی پێوانەکردنی ئەم قورساییە، ئەوە "ئامادەبوون" کە وەکو یەکەیەکی تەواو زارەکی خراوەتە ڕوو کە بریتییە لەوشە، ئەگەر ڕووداوێکی لەناکاو

پێکنەهێنێت، ئەوە شایانی هیچ جۆرە ڕامانێك نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، ناتوانێت ببێتە پێوەری کۆتایی و دوا دەسەڵات.

لەلایەکی تریشەوە، ئەم ڕووگەو ڕێڕەوەی پێشنیاری دەکەین، ڕەواو سادەیە، بەتایبەتیش بەرەو زاراوەیەکی دیاریکراومان دەبات کە دەشێت وا تەماشای بکەین وەکو ئەوەی یەکێك لەڕوخسارەکانی بێت، وەکو موورادیفێکی ئەم وابێت، بگرە هەر زۆر گونجاوو تەبایە لەگەڵ ئەو زاراوەیەی ئەفلاتون بەکاری هێناوە. مەسەلەکە پەیوەستە بەزاراوەی فارماکووس pharmakos ـــ جادووکەر، سیحریاز، ژەهرخواردەر، کە موورادیفی فارماکووسە pharmakeus ئەفلاتون بەکاری دێنێت و، ڕەسەنترە لەنێو کولتووری یۆنانیدا، چونکە زۆر بەوردی دیاریکراوەو، زۆر بەجوانیش ڕۆڵێکی ترو فرمانێکی تریش دەگێڕێت.

کەسایەتی فارماکووس بەقوربانی بەراوردکراوە. شەڕانگێزی و دەرەوە، دەرکردنی شەڕانگێزی و دوور خستنەوەی ئەم جەستەیە بۆ "دەرەوە"ی شار. ئەمانە دوو دەلالەتی گەورەی ئەم کەسایەتییەن لەنێو سرووتەکاندا.

هاربۆکراسیۆنیش ئاوا بەم شێوەیە قسە لەسەر زاراوەی فارماکووس دەکات و دەڵێت:" دوو کەس لەئەسینا دەرکران تاوەکو شارەکە پاك ببێتەوە. ئەم ڕووداوە لەکاتی تارگیلیاتەکاندا ڕوویدا، کاتێك پیاوێك وەکو فدیە لەبری پیاوێکی تر لەشار دەرکراو وەدەرنرا، یەکێکیش لەبری ژنان". [1] وەکو عادەتێك، فارماکووسەکان

---

[1]) پێدەچێت ئێرە چرکەساتێکی باش بێت بۆ ئاماژەدان بەهەندێك شت، لەبارەی ئەنجامدانی بەراوردێکی پێویست لەنێوان هەردوو کەسایەتی ئۆدیب و فارماکووس. ئەم گوتارەی لێرەدا دەیخەینەڕوو، سەرەڕای هەندێك شت، بەڵام شیکردنەوەیەکی تەواو دەروونییە.

دەکوژران، بەڵام پێدەچێت ئەمە مەبەستی سەرەکی پرۆسەکە نەبووبێت. زۆرجار مەرگ وەکو ئەنجامێکی لاوەکی بەکارهێنانی توندوتیژی زیادە بەرانبەر بەئەندامەکانی زاوزێ، بەپلەی یەکەم، دەهات. هەرکاتێك فارماکووسەکان فرێدەدرانە دەرەوەی شار، ئەو کاتە دەبوونە ئامانجی لێدان و دارکاریکردن. بەمەبەستی دەرکردنی شەڕ لەنێو جەستەیان.

بەڵام، ئایا وەکو شێوازێك بۆ پاککردنەوە katharmos، ئەمانە دەسووتێنران؟ بەپێی ئەم گێڕانەوەیەی لەنێو "هەزار چیرۆك" و بەپشت بەستن بەچەند بڕگەیەکی شیعری هیپۆناکسی شاعیر، ئەوە تسیتیزیس بەم شێوەیە وەسفی ئەم سرووتانە دەکات:" سرووتی فارماکووس یەکێك بوو لەم سرووتە کۆنانەی بۆ پاککردنەوەی شار بەکاردەهات. کاتێك خواوەند لەشارێك تووڕە دەبوو و دەردێك و پەتایەکی بۆ دەنارد، برسێتی بووبێت، یا تاعون و هەر کارەساتێکی تر، ئەوە خەڵکی ئەم شارە ناشیرینترین پیاوی خۆیان دەبرد، بۆ ئەوەی بیکەنە قوربانی بۆ خواوەند. ئەم پیاوەیان دەبردە شوێنێکی دیاریکراو.[1]

---

بەلایەنی کەم، لەملایەنەوە کە دەست بۆ ڕەسیدی کولتووری یۆنانی و زمانی تراژیدیاو فەلسەفەکەی دەبەین. بەڕاستی دەبووایە فرۆید هەر زوو خۆی تێوەربدایەو دوای نەخستبووایە بۆ کاتێکی درەنگتر. ئەم ڕەسیدەی ئێمە لێرەدا دەمانەوێت بەقسەی بخەین و بەئاخافتنی بێنین، مانای وا نییە ئەو مەودایەی بەم شێوەیە گیراوەتەبەر لەئاست گوتارێکی دەروون شیکاری کە زۆر بەسادەیی خۆی دەخزێنێتە نێو دەقێکی یۆنانی کە بەشێوەیەکی پێویست نەخوێندراوەتەوە.

[1]) ئەم شوێنە جۆرێك لەپیرۆزی پێدەدراو ناوی دەنرا سەکۆی قوربانیدان، لەوێدا قوربانییەکەیان پێشکەش بەخواوەند دەکردوو، بەپێی بڕوا خۆیان، هەر تەنیا لەم شوێنەش خواوەند قبووڵی دەکرد لێیان. (وەرگێڕی کوردی)

ئینجا لـەم شـوێنەدا، بەدەسـتی خۆیـان فارماكووسـیان پێشـكەش دەكـرد. فارماكووس بریتی بوو لەهەندێك پەنیرو كێكی جۆو كـەمێك هـەنجیر. دوای ئـەوەی ئەم خواردنـەی ــ فارمـاكووس ــ ی پێدەدرا، ئینجا بۆ حـەوت جـار بـە بـەردو هەنجیرو هەندێك ڕووەكی تـری سروشـتی لـەم كەسـەیان دەدا. دوای كۆتاییهـاتنی ئەم سرووتەش، ئەگەر كەسەكە زیندوو بووایە یـا مـردوو، ئـەوە دەیانخسـتە سـەر كۆمـــەڵێك داری كـــۆكراوەو گڕیـــان تێبـــەردەداو دەســـووتێنرا، دواتـــریش خۆڵەمێشەكەیان كۆ دەكردەوەو بەنێو ئـاوی دەریـادا بڵاویـان دەكـردەوە. هـەموو ئەمانە، بۆ پاككردنەوەی شاربوو، بۆ لەناوبردنی ئێش و ئازاری شار بوو".

جەسـتەی تایبـەت و ڕاسـتەقینەی شـار، یـەكێتی و، ئـەمن و ئاسایشـی خـۆی، لەمیانەی ئەم پرۆسەیەدا بۆ دەگەڕایەوە، ئەم ئاخافتنەی كە خودی خۆی بـەخۆی دەگەیـەنێت لـەنێو گۆڕەپـانی گشـتی "ئـەگۆرا"،[1] بـەوەی لەمیانـەی هێـزو توندوتیژییەوە نوێنەری هەڕەشەو هێرشی دەرەكی بخاتە دەرەوەی سنوورەكانی خـۆی و كۆتـایی پێبێنێـت. دیـارە ئـەم كەسـەی هەڵدەبـژێردرێت، نوینەرایـەتی شەڕانگێزی دەكـات، دێـت بـۆ ئـەوەی نـاوەوەی شـار گـڵاو بكـات و بەشـێوەیەكی پێشـبینی نـەكراو خـۆی دەكـات بـەناوەوە. بـەڵام نوێنـەری دەرەوە، لەلایـەن كۆمەڵـەوە بەشـێوەیەكی ڕێكخـراو لـەناوەوە دامـەزراوەو پـارێزراوە لەلایـەن خۆیانەوە. مشەخۆرەكان بەردەوام لەلایەن جەستەی زینـدووەوە مـاڵی دەكـرێن و شوێنیان بۆ دابین دەكرێت و لەسەر حیسابی خۆی جێگایان بۆ دەكاتەوە. خەڵكی

[1]) ئەگۆرا ئەم ناوچە گشتییەی شارە كـە تێیـدا ئەنجوومـەنی شـارەوانییەكانی یۆنـانی كـۆن كۆبوونەوەی ئاشكرای خۆیان تێدا دەبەستا.

ئەسینا بەردەوام لەسەر حیسابی دەوڵەت کۆمەڵێك خەڵکی بێکەڵك و ئاستنزمیان بەخێو دەکرد، کاتێك کێشەیەك و دەردو پەتاو بەڵایەك یەخەی ئەم شارەی دەگرت، دوو کەس لەم پەراوێزخراوانەیان دەکردە قوربانی.

بۆیە سرووتی فارماکووس[1] لەسەر ئاستی ناوەو دەرەوەدا ئەنجام دەدرێت و کاری ئەوەیە سەرلەنوێ، بەبێ دابڕان، ئەم پێوەندییە ڕێکبخاتەوەو وێنەی بکێشێت. ناوەوەی سنوورەکان ـ دەرەوەی سنوورەکان.

ئەم فارماکووسە، ئەسڵی جیاوازی و دابەشبوونە، بریتییە لەم شەڕانگێزییەی بەزارەکی ئاخافتنی لەبارەیەوە دەکرێت و هاتۆتە نێو شاریش. سوودبەخشە، بەوەی دێت شیفا دەبەخشێت ــ لێرەدا ڕێز لێگیراوەو چاودێری دەکرێت. زیانبەخشە، بەوەی جێگای گومانەو پێویستە ئاگامان لەخۆمان بێت ــ بەرجەستەکەری هێزە شەڕانگێزەکانە. لەیەك کاتدا، هەم جێگای دڵنیاییەو، هەمیش جێگای دوودڵی. پیرۆزو، نەفرەت لێکراوە. پارچە پارچە نابێت و، بریتییە لەیەکێتی دژەکان، لەمیانەی تێپەڕین پێی و بڕیارو قەیرانەوە هەڵدەوەشێتەوە. کاتێك شەڕانگێزی و شێتی دەردەکرێن، ئەو کاتە دەکرێت جارێکیتر حیکمەت ئاوا بکرێتەوە Sophrosune.

---

[1]) لێرەدا دیسان دەگەڕێینەوە سەر ئەم جیاکارییەی کە ئاماژەی بۆ دەکرێت لەنێوان فارماکۆن و فارماکووس. فارماکۆن: سیحر، شەڕاب، عەقار، دەرمان، ژەهر. فارماکووس: سیحرباز، جادووکەر، ژەهرخواردەر، ئەو کەسەی لەپێناو خۆشبوون لەگوناهەکانی شار دەکوژرێت.

بڕیاری دەرکردن لەچرکەساتە ناسك و هەستیارەکاندا دەدرا، وشکە سالّی، تاعوون، برسێتی. ئەو کاتانە ئەم بڕیارە دووبارە دەبۆوە. کۆنترۆڵکردنی ئەم شێوە لەشەرمەزارییە، پێویستی بەبنەماو یاساو ڕێکخستنەوە هەیە تاوەکو بشێت دووبارە بکرێتەوە لەکاتی دیاریکراودا. ئەم شێوە موماەرەسە سرووتئامێزە لەناوچەکانی ئەبدێراو ئەتراسیاو مارسیلیا و ... تاد ئەنجام دەدرا، هەموو سالّێکیش لەئەسینا دووبارە دەکرایەوە تاوەکو سەدەی پێنجەمی پێش زایینی، ئەوەش هەریەك لەئەرستۆفان و لیسیاس بەڕوونی ئاماژەی بۆ دەکەن، بەجۆرێك ئەفلاتون نەیدەتوانی خۆی لێ لەگێلی بدات.

لەڕاستیدا، مێژووی ئەم سرووتە سەرنجڕاکێشە، دەکەوێتە شەشەم ڕۆژی تارگیلیات، ئەو ڕۆژەی کە سوقرات تێیدا لەدایك دەبێت. ئەو پیاوەی لەکوژرانی خۆی دەچێت، چونکە فارماکۆن هۆکاری ڕاستەوخۆی کوژرانی سوقرات نەبوو، بەڵکو لەناوەوە کوشتنی فارماکووس بوو.

سوقرات کە لەنێو دیالۆگەکانی ئەفلاتوندا بەفارماکووس ناودەبرێت، سوقرات کە لەبەرانبەر ئەم داوایەی لەسەری بەرز کرابۆوە، ئەوەی ڕەتکردەوە بەرگری لەخۆی بکات و، ئەم نووسینەشی ڕەتکردەوە کە لیسیاس "بەتواناترین نووسەرانی ئێستا" وەکو بەرگرینامەیەك بۆی نووسیبوو، لیسیاس کە پێی گوتبوو با بەرگرینامەیەکت بۆ ئامادە بکەم و بنووسم. دەڵێین، سوقرات لەڕۆژی شەشەمی تارگیلیات لەدایکبوو، ئەوەش بەشایەدی دیۆجینیۆس لایرتیۆس کە دەڵێت:" لەڕۆژی شەشی تارگیلیات لەدایکبوو، ئەو ڕۆژەی ئەسینایيەکان شارەکەی خۆیان پاك دەکەنەوە".

# بەشی نۆیەم

## توخمەکان:[1]

## سەوزایی، خەیاڵکردن، جەژن

---

١) لێرەدا بەمانای پێکهاتەکانی خواردن ئامادەکردن دێت، ئەم شتانەی لەنێو خواردن تاوکەو ئامادە بکرێت.

سرووتی فارماکووس: ئازار، مەرگ، دووبارە بوونەوەو دوورخستنەوە.

سوقرات لەنێو یەك زنجیرەدا، هەموو بەندەکانی ئەم ئیدانەیە گرێدەدات کە لەدژی فارماکۆن ـ نووسین هاتووە، ئەویش لەم چرکەساتەدا کە لەبەرژەوەندی خۆیدایەو، پاڵپشتی لێ دەکات و، روونی دەکاتەوەو، راڤەی دەکات و، قسەی خواییانەیەو، قسەی شاهانەیەو، قسەی باوك و خۆرە، بڕیاری سەرۆك تامووسە. ئەم قسەیە هەر تەنیا پێشبینی خراپترین جێکەوتەکانی نووسین دەکات. قسەیەك بۆ ئەوەی کە بەڕانییە، بۆیە لێرەدا ئەم قسەیە مەعریفەو زانستێکمان پێنابەخشێت، بەڵکو بڕیارێك دەردەکات وەکو حوکم. بڕیارێکی مزگێنی بەخش و، پێشبینیکەرو، یەکلاکەرەوەیەو، وەکو ئەوەی سوقرات دەڵێت، گوزارشتە لەمەعریفە.

سوقرات خۆیشی لێرە بەدواوە، گوتارەکەی خۆی وا لێ دەکات ببێتە مەعریفەو فەلسەفەیەك، بتوانێت ئەم سەرمایەیە بەکاربێنێت و، بانگەشەو ریکلامی بۆ بکات. ئەم وتارە پاشاییە ــ خواییە ــ خۆرییە ــ لاهووتییە، نمایش بکات و پاساوی

پێویستی پێبدات و ڕاستاندنی بۆ بکات. واتا وای لێبکات میتۆلۆژیای میتۆس بگۆڕێت بۆ عەقڵ ـ لۆگۆس.[1]

ئەو لۆمەیە دەبێت چی بێت کە دەشێت خواوەندێکی بێزراو بیبەخشێت؟

بێگومان بەرهەم نەهێنان، یا بەرهەمهێنانی ڕوخساری کە بەرهەم نایەت تەنیا لەمیانەی دووبارە بوونەوەی حەقیقەت نەبێت پێشتر لێرەدا. بۆیە نووسین ــ ئەوەش یەکەم پاساوی سوقرات بوو ــ بەرهەم و تەکنیکێکی ــ teckne باش نییە. هەموو هونەرێك دەتوانێت مانا بەرهەم بێنێت و بیخاتە بەرچاو ــ -pro duit، ئەم شتانە ڕوونبکاتەوە کە ڕوون و ئاشکراو جەخت لێکراوەو جێگیرن ــ saphes kai bebaion. واتا حەقیقەتی بەرجەستەکراوی ـ aletheia ئایدیا ـ eidos. حەقیقەتی هەبوو لەسەر شێوەو وێنەی خۆیدا، لەنموونەی خۆیدا، لەبینراوی و ناهەستناکیدا، لەنەبینراوی و ماقووڵیدا.

حەقیقەتی ئەم شتەی هیچ پێوەندی بەپیتەکانی نووسینەوە نییە، بگرە لەنێویدا نابینا دەبێت و لەگەڵ خۆیشیدا نابینایی دێنێت. هەر کەسێك پێی وابێت لەمیانەی وشەی نووسراوەوە ـ grapheme دەتوانێت حەقیقەت بخاتە بەرچاو، ئەوە گەمژەییەکی گەورە ــ euetheia دەکات. لەکاتێکدا حەکیمی سوقراتی دەزانێت کە ئەم خۆی هیچ نازانێت، ئەو گەمژەیە نازانێت ئەم پێشتر ئەو شتانە دەزانێت کە پێی وایە لەمیانەی نووسینەوە فێریان دەبێت. لەواقیعدا ئەوەی ڕوو

---

[1]) پێشتریش وەکو ڕوونکردنەوەیەك، ئەوەمان خستەڕوو کە عەقڵی گریکی وێنای جۆرێك لەململانێی کردبوو لەنێوان میتۆس ـ ئەفسانە و لۆگۆس ــ عەقڵ دا، لەگەڵ تالیس ئەم ململانێیە کۆتاییهات و لەبەرژەوەندی لۆگۆس تەواو بوو. (وەرگێڕی کوردی)

دەدات، بریتییە لەسەرلەنوێ پیشاندان و نمایشکردنی ئەم شتانەی لەنێو دڵدا ئەزبەر کراون، بەڵام لەمیانەی قاڵب و مۆری تازەدا. نەوەکو بێت لەمیانەی بیرکەوتنەوەدا ئەم ئایدیایە بگێڕێتەوە کە پێشتر، پێش ئەوەی ڕوح بکەوێتە نێو جەستە، بیری لێکراوەتەوەو لێی ڕامێنراوە. بێت لەمیانەی بیرکەوتنەوەدا، ئەم شتانە دەربخات و پیشان بدات کە پێشتر مەعریفەیەکی یادوەرییانەی لەبارەیەوە هەبووە. لۆگۆسی نووسراو شێوازێکە بۆ گەیشتن بەم شتەی پێشتر زانراوە ـ ton eidota، دەڵێین شێوازێك بۆ دەرخستنی ـ hupomnesai ئەم شتانەی کە لەبارەیانەوە نووسراون ـ ta gegrammena. کەواتە نووسین دەست ناخاتە نێو ئەم کارە، تەنیا لەم چرکەساتەدا نەبێت کە تێیدا خودی زانا خۆی خاوەنداریێتی ئەم مەدلولانە دەکات، ئەو کاتە نووسین دێت ئەم مەدلولانە تۆمار دەکات.

بەم شێوەیە سوقرات ئەم بەرانبەر یەکتری دانانە گەورەو مەزن و یەکلاکەرەوەیە باس دەکات، ئەوەی کە پێشتر لەنێو مەعریفەی تامووسدا هەبوو: یادەوەری ـ بیرکەوتنەوە، بەرانبەر یەکتری دانانێك لەنێوان مەعریفەی ئەوەی کە لەنێو یادەوەریدا هەیە، لەگەڵ مەعریفەیەك کە ئەنجامی بیرکەوتنەوەیە، لەنێوان دوو شێوەو فۆڕمی جیاوازی دووبارە بوونەوە، دوو چرکەسات. دووبارە کردنەوەی حەقیقەتێکی بەرجەستەبوو ـ aletheia کە ڕوانینێك بەئایدیا ـ eidos دەدات و پێشکەشی دەکات، دووبارە بوونەوەی مەرگ و بیرچوونەوەیەك ـ lethe کە

ڕێگری دەکات و بەلادا دەیبات، چونکە نایەت ئایدیایەك پێشکەشبکات، بەڵکو دێت نوێنەرایەتی نوێنەر دەکات و، دووبارە دووبارە دەکاتەوە.[(١)]

بیرکەوتنەوە کە لێیەوە نووسین لێرەدا خۆی ڕادەگەیەنێت و بیرکردنەوەی پێدەدات، بەتەنیا پەیوەست نییە بەهاوزەمانی و یادەوەری، بەڵکو وەکو پاشکۆی یادەوەری دادەمەزرێت. پاشکۆیەك کە لەئەنجامدا دەبێتە هۆی ئامادەگی حەقیقەت. لەم چرکەساتە کە تێیدا نووسین بانگ دەکرێت بۆ ئامادەبوون و ملکەچکردن لەبەردەم دەستەی باوکان، دەچێتە نێو شێوەو فۆرمێکی دیاریکراوی ئیشکالییەتی مەعریفە ـ یادەوەری. بۆیە لێرە لەهەموو تایبەتمەندییەکانی خۆی داماڵراوەو چیتر توانای بەرهەمهێنان و یاسادانانی نییە. توانای بەرهەمهێنانی لەمیانەی دووبارە بوونەوە نەبڕاوە، بەڵکو لەمیانەی دووبارە بوونەوەوە وەکو جووت دووبارە بوونەوەیی بڕاوە، ئەم دووبارە بوونەوەیەش هەر دوو قەدو، دووبارەتر دەبێت و، زیاتر دەبێت و، دووبارە دەبێتەوە، بەم شێوەیەش لەمیانەی ئەم دابڕانە باشەی لەدووبارە بوونەوە، بەردەوام کاتێك کۆچ دەکات بەرەو خۆی، دەسبەرداری دووبارە بوونەوە دەبێت.

مانای وایە، نووسین بریتییە لەدووبارە بوونەوەی پەتی، دووبارە بوونەوەیەکی مردوو کە دەشێت بەردەوام نەتوانێت هیچ شتێك دووبارە بکاتەوە، یا نەتوانێت

---

(١) دەکرێت لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە فەلسەفەی دیاردەگەرایی هۆسرەلی، بەتەواوی، هەر هەمووی، بەردەوام لەبارەی ئەم جۆرە بەرانبەر یەکتری دانانە دوالیزمەکان دەخوولێتەوە. جاك دریدای خاوەنی ئەم کتێبەش، توێژینەوەیەکی تایبەتی هەیە لەم بارەیەوە، بڕوانە دەنگ و دیاردە ـ La Voix et le Phenomene.

بەشێوەی هەڕەمەکی خۆی دووبارە بکاتەوە. واتا ئەم خۆی دووبارە ناکاتەوە، دووبارە کردنەوەیەکی بۆش و بەتاڵ.

ئەم جۆرە دووبارە کردنەوە پەتییە، ئەم بانگەشەکردنە بۆ دووبارەکردنەوەیەکی خراپ، بریتییە لەحەشوو. لۆگۆسی نووسراو، "مرۆڤ پێی وایە شتێك لەهزر لەنێویدا هەیەو ڕیفرێشمان دەکاتەوە، بەڵام هەر بەوەندە دەوەستین قسەی ئاڕاستە بکەین بۆ ڕوونکردنەوەی یەکێك لەوتارەکانی تاوەکو ببینین کە شتێك لەخودی خۆیدا دەلالەت لەخۆی دەکات، هەمان شت بەردەوام و هەمیشە ـ en ti semainei monon tauton". دووبارە بوونەوەیەکی پەتییە، دووبارە بوونەوەیەکی ڕەهای خود، بەڵام بۆ خود مادام ئەوە ئاڕاستەکردنە لەپێش و دووبارە کردنەوەیە، دووبارە کردنەوەی دالە، دووبارە کردنەوەیەکی بێسوودو بیٚ مانایە، دووبارە کردنەوەی مەرگە، هەموو ئەوانە وەکو یەکن. نووسین، دووبارە کردنەوەیەکی زیندوو نییە بۆ زیندوو.

هەر ئەوەشە نووسین لەگەڵ وێنە بەیەکەوە کۆ بکاتەوە. بەتەواوی وەکو ئەوەی لەنێو دیالۆگی کۆماردا هاتووە لەو کاتەدا کە هونەرەکانی لاساییکردنەوە ئیدانە دەکرێن، بەنزیککردنەوەی وێنەو شیعر لەیەکتری، وەکو چۆن شیعرییەتی ئەرستۆ پێکەوە کۆیان دەکاتەوە لەنێو چەمکی لاساییکردنەوە ـ mimesis، ئەوە لێرەشدا سوقرات دێت نووسراو ـ grapheme بەوێنەی کەسی و پۆرترێت ـ zographeme بەراورد دەکات.

***"ئەی فیدرۆس، پێم وایە شتە هەرە مەترسیدار ـ deinon لەنێو نووسیندا، ئەوەیە کە زۆر لەوێنە دەچێت ـ homoion zographia.***

*ئەم بوونەوەرانەش کە وێنە بەرهەمیان دێنێت، وەکو زیندەوەر وان ـ* **os zonta**، *بەلام کاتێک کەسێک پرسیاریان لێ دەکات، بەشانازییەوە ـ* **semnos** *بێـــدەنگی هەلدەبـــژێرن. هـــەمان شـــتیش لـــەبارەی نووسراوەکان..." .*

لـەنێو دیـالۆگی پرۆتاگۆراسـیش، دیسـان سـوقرات ئیدانـەی نووسـین دەکـات بـەوەی گوایـە ناتوانێـت وەلامـی خـۆی و بەرپرسـیارێتییەکانی خـۆی بداتـەوە. گوتاربێژە سیاسییەکان زۆر خـراپن، ئەوانـەی نـاتوانن وەلامـی چـەند پرسـیارێکی زیـاتر بدەنـەوە، ئـەمانیش "وەکـو کتێـب وان کـە نـازان قسـە بکـەن و وەلام بدەنەوە". بۆیە "نامەی حەوتـەم" دەلێـت:" هـیچ مرۆڤێکـی عاقـلێ سەرکێشـی وا ناکات هزرو بیرکردنـەوەی خـۆی بگەیەنێتـە وێسـتگەیەکی وا، بەتایبـەتیش کاتێـک بەچەقبەستوویی پیتی نووسراو بێت".

ئـەم شـتانە چـین کـە لـەنێو قـوولایی نووسـینەکەی سـوقراتدایە لـەبارەی هاوشێوەیی و لێکچوونی نێوان وێنەو نووسین؟ لەنێو چ ئاسۆیەکدا ئەم بێدەنگییـە هاوبەشـەی خۆیـان ڕادەگەیـەنن؟ ئـەم لالییـە لاسـارە؟ ئـەم ماسـك و ڕووپۆشـە قەدەغـەکراوەی ناتوانێـت وشـیارییەك بشـارێتەوە کـە چارەسـەری بـۆ نییـە؟ داخستنێکی نەدارانە و بێ ویسـت بەرانبـەر بەپرسیاری لۆگۆس؟ مـادام هەریـەك لەوێنـەو نووسـین بەیەکـەوە داوەتکـراون، بەکەلەپچـەکراوی بانگهێشـتکراون بـۆ بەردەم دادگای لۆگۆس و داوایان لێکراوە وەلام بدەنەوە، چونکە ئەوان لێـرەن بـۆ لێپرسینەوە وەکو ئەوەی نوێنەری بانگەشـە بـۆ کـراوی ئاخـافتنن، وەکـو ئـەوەی توانای گوتاریان هەبێت و کۆمـەلێك وشـەیان ئەزبـەر کردبێـت و پاراسـتبێت لـەنێو

خۆیاندا، پاڵیان پێوە بنرێت بۆ ئەوەی دەری ببڕن. هەر ئەوەندە بەسە ئەم دووانە ئەوە ئاشکرا بکەن کە لەئاستی ئەم جۆرە دادگاییکردنەدا نین، ناتوانن بەئازایەتییەوە نوێنەرایەتی ئاخافتنی ڕاستەوخۆ بکەن، ناتوانن وتەبێژو وەرگێڕی ئەم بن و بەزمانی ئەم قسە بکەن، ناتوانن بێنە نێو ئەم وتووێژەو وەڵامی پرسیارە زارەکییەکان بدەنەوە، تەنانەت ناتوانن هیچ شتێك بکەن. ئەمانە هیچ نین، تەنیا دوو نوێنەری بێدەنگ نەبێت، دوو ماسك و ڕووپۆش، دوو لێکچوو.

با ئەوەش لەبیر نەکەین کە وێنە ــ ڕەسم لێرەدا بە ــ zographie ناودەبرێت، واتا نەخشەو هێلکاری، وێنەی بوونەوەرێکی زیندوو، وێنەی مۆدێلێکی ڕوحدار. نموونەی ئەم وێنەیە بریتییە لەوێنەی نوێندراو کە هاوشێوەو لێکچووی وێنەی زیندووی ئەسڵییە. تەنانەت هەندێکجار زاراوەی zographeme کورت دەکرێتەوە بۆ gramma واتا دەستنووس، یا نووسراو.

بەهەمان شێوە، لەسەر نووسینیش پێویستە وێنەی ئاخافتنی زیندوو بکێشێت. کەواتە، ئەویش لەوێنە دەچێت لەم سنوورەدا کە بیری لێکراوەتەوە لەنێو تەواوی پرسی ئەفلاتونیداو دەتوانین بەوشەیەك ئامـاژە بـۆ ئـەم دەستنیشـانکردنە بەکلاکەرەوەو بنچینەییەش بکەین ــ دەڵێین بیری لێکراوەتەوە لەمیانەی ئەم نموونەیەی تایبەتە بەنووسینی دەنگی وەکو ئەوەی لەنێو کولتووری یۆنانیدا باڵادەستبووە. هێماکانی نووسین لەنێویدا کاریان دەکرد، لەنێو ئەم سیستەمەدا پێویستبوو لەسەریان نمایندەی هێمای دەنگی مرۆڤ بکەن، هێمای هێما.

بەم شێوەیە، چۆن نموونەی وێنەو نووسین بریتییە لەدڵسۆزی بۆ نموونەکان خۆیان، ئەوە هاوشێوەیی و لێکچوونی نێوان وێنەو نووسین، خۆی بریتییە

لەهاوشێوەیی خودی. لەبەرئەوەی ئەم دوو پرۆسەیە پێش هەموو شتێك ئامانجیان ئەوەیە لێکچووبن، هەردووکیان وەکو دوو تەکنیکی لاساییکردنەوە دەسگیرکراون، چونکە هونەر وەکو لاساییکردنەوە سنووردارە.

سەرەڕای ئەم هاوشێوەییە سەرەکییە، هاوشێوەی هاوشێوە، حاڵەتی نووسین هێشتا زیانبەخشترە. ڕاستە وێنەو شیعر لەحەقیقەت دوور خراونەتەوە، ئەوانیش وەکو هەر هونەرێکی لاساییکەرەوەی تر. بەڵام ئەمانە، لەبارودۆخێکی باشتردان. شیعر لاسایی دەکاتەوە، بەڵام لاسایی دەنگ دەکاتەوە، بەشێوەیەکی زارەکییانەیە. وێنەش، وەکو پەیکەرتاشی بێدەنگە، بەڵام مۆدێلەکەی، خودی خۆی، قسە ناکات. وێنەو پەیکەرتاشی دوو هونەری بێدەنگن، سوقراتیش ئەمە باش دەزانێت، خۆیشی کوڕی پیاوێکی پەیکەرتاشەو لەسەرەتای ژیانیشیدا، هەر دەیویست هەمان ڕێگای باوکی بگرێتەبەر.

سوقرات ئەمە باش دەزانێت، بۆیە دەبینین لەنێو دیالۆگی گۆرگیاسدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە بێدەنگی پانتایی وێنەکێشان و پەیکەرتاشی، سروشتییە. بەڵام ئەوە لەنێو حاڵەتی نووسیندا وا نییە، مادام نووسین دێت وەکو وێنەی ئاخافتن خۆی پێشکەش دەکات. واتا نووسین دێت، بەشێوەیەکی زۆر مەترسیدار ئەم شتە دەشێوێنێت، کە بانگەشەی ئەوە دەکات گوایە لاسایی دەکاتەوە. نووسین نایەت وێنەی مۆدێلەکەی خۆی پیشان بدات، بەڵکو دێت لەنێو پانتایی هێمن و جێگیری زەمەنی زیندووی دەنگدا، دێت نموونەکەی خۆی دەهەژێنێت، هیچ وێنەیەکی ئەم پێشکەش ناکات، بەڵکو دێت بەشێوەیەکی توندوتیژانە زمانی زیندوو لەژێنگەی خۆی هەڵدەکەنێت و دەیهەژێنێت. کاتێکیش نووسین ئەم کارە دەکات، ئەوە

بەمەودایـەکی زۆر دوور لەحەقیقـەتی شـتێك لـەخودی خۆیـدا، دوور دەکەوێتـەوە، لەحەقیقەتی ئاخافتن و، ئەم حەقیقەتەی کە بۆ ئاخافتن دەکرێتەوە.

کەواتە، لەپاشا دوور دەکەوێتەوە.

بـا ئـەم مورافەعـە ناودارەمـان بیربکەوێتـەوە لـەدژی لاسـاییکردنەوەی وێنـەیی لەنێو دیالۆگی کۆماردا، کاتێك پرسەکە یەکەمجار پێوەندی بـەدەرکردنی شـاعیران هەیە لەنێو شار. لێرەدا، ئـەمجارە، بەپێچـەوانەی ئـەوەی لـەنێو کتێبـی دووەم و سـێیەمدا ڕوودەدات، کـە بەشـێوەیەکی بنچـینەیی هـەڵقووڵاوی سروشـتی دیالۆگەکەیـە. دەبیـنین، شـاعیرە تراژیدییـەکان کاتێـك لاسـایی دەکەنـەوە، تێگەیشـتنی ئـەم کەسـانە لـەبار دەبـەن کـە گوێبیسـتیانن ـــ tes ton akouonton، ئەگەر ئەم خەڵکانە خۆیان ئامادە نەکردبێت بۆ بـەرگرتن لـەدژی ژەهر ــ pharmakon، ئـەوە بەڕاسـتی مەعریفـەی شـتەکانە ــ to sidenai auta oia tunkamei onta. ئەگـەر ئێمـە بـیر لـەوە بکەینـەوە کـە لاسـاییکەرەوەکان لەشـوێنگەیەکی دوورتـردا وەکـو جادووکـەرو بانگەشـەکاری موعجیزە نمایش دەکرێن، واتا وەکو تەرزێك لەجۆری فارماکووس، ئەوە مەعریفەی ئـەنتۆلۆژی خـۆی وەکـو هێزێکـی دەرمانخانـەیی، لەبەرانبـەر هێزێکـی تـری دەرمانخانەیی نمایش دەکات.

سیستەمی مەعریفە، سیستەمی شێوەو هزری شەفاف ناگرێتەوە وەکو ئـەوەی ئێمە دەمانتوانی ڕاڤەی بکەین، بەڵکو دژو پێچـەوانەیەن بەرلـەوەی دابەشـکراوبێت لـەنێوان توونودتیژییـەکی شـاراوەو زانسـتێکی ڕاسـتەقینەدا. نێوەنـدی فارمـاکۆن

خۆی، نێوەندی ململانێی نێوان فەلسەفەو ئەویترە، نێوەندێکە خۆی لەخۆیدا ــ ئەگەر بکرێت بڵێین ـ ئەستەمە دەستنیشان بکرێت.

بۆ دەستنیشانکردنی شیعری لاساییکەرەوە پێویست دەکات بەگشتی بزانین لاساییکردنەوە خۆی چییە. لێرەدا نموونەی ئەسڵ و بنچینەی پێخەف[1] دێتە پێشەوە کە نموونەیەکی زۆر باوە. ئێمە کاتی تەواومان لەبەردەستە بۆ ئەوەی لەشوێنێکی تردا پرسیار لەبارەی پێویستی هەڵبژاردنی ئەم نموونەیە بکەین، لەبارەی ئەم خزانەی کە دەق پاڵ دەنێت بەرەو گواستنەوەی هەست پێنەکراو لەخوانەوە بۆ پێخەف. پێخەفێك کە پێشتر ئامادەکراوە. بەهەرحاڵ، خوا باوکی ڕاستەقینەی پێخەفە، وەکو نموونەیەك بۆ پێخەف. خوا پێخەفی دروستکردووە، ئەو وێنەکێشەش کە لێرەدا بە ــ zoographe ناودەبرێت (هێلکێشی وێنەی بوونەوەری زیندوو)، دەڵێین خۆ ئەم ئافرێدەکاری نییە ــ phytourgos، داهێنەری سروشتی پێخەف ـ physis، وەکو حەقیقەتی خۆی، ئەم دروستکەرو ئافرێدەکاریشی نییە، بەڵکو تەنیا لاسایی دەکاتەوە. ئەم بەسێ پلە دوور خراوەتەوە لەحەقیقەتی ئەسڵی، واتا لەسروشتی پێخەف.

واتا لەپاشا دوور.

***" ئەوە حاڵی شاعیری تراژیدیشە، مادام لاساییکەرەوەیە، بێگومان شوێنی ئاسایی لەدوای پاشاو حەقیقەت دێت، بەسێ ڕێزو سێ پلە دوای ئەمانەن، ئەوە وەزعی هەموو لاساییکەرەوەیەکە".***

[1]) ئێمە لێرەدا پێخەف بەمانای سەرجێگاو، جێگای نووستن بەکاردێنین. (وەرگێڕی کوردی)

بەڕستەکردنی ئەم ـ eidolon واتا ئەم وێنەیەی کە لاسـاییکردنەوەی شـیعری پێشکەشی دەکـات، دەڵـێین بەڕسـتەکردنی ـــ خەوانـدنی،[1] لەمیانـەی نووسـین و خستنە نێو ڕستەی نووسینەوە، مانای وایە بەچوار پلە لەپاشـا دوور دەخرێتـەوە. یا بەمانایەکی تر، بەهۆی گۆڕینی سیستەم و نێوەندەکەو جـوور خسـتنەوەی بـەم شێوە فراوانە، خۆ ئەگەر ئەفلاتون خۆی لەشوێنێکی تـردا کاتێـك بەگشـتی باسـی شاعیری لاساییکەرەوە دەکات، ئەوە دەڵێـت:" بـەردەوام لەمەودایـەکی بێکۆتـایی دوور لەحەقیقـەت، جێنشـینە ــــ tou de alethous porro panu aphestota". لەبەرئـەوەی نووسـین، بەپێچـەوانەی وێنەکێشـان، هـیچ شـتێك بەرهەم ناهێنێت. ئاشکرایە کە وێنەکێشان هیچ بوونێکی حەقیقی بەرهەم ناهێنێت، بەڵکو تەنیا ڕوخسار بەرهەم دێنێت، واتا ئەوەی پێشتر لاسایی کۆپی دەکرێتـەوە. بەگشتی زاراوەی کۆپیکراوی سەر کۆپی ـ phantasma بـەمانای لێکچـوو دێـت ـ simulacra.[2] ئەوەش کە بەپیتی ئەبجـەدی دەنووسـێت، تەنانـەت ناتوانێـت

---

[1]) خوێنەر بیری دێتەوە کە پێش کەمێك جـاك دریـدا زاراوەی پێخـەفی خواسـتبوو، لێرەشـدا زاراوەی ڕسـتاندن ـــ خسـتنە نێـو ڕسـتە دەخوازێـت، واتـا ڕێکخسـتنی شـتێك لەمیانـەی نووسـینییەوە کـە دەکاتـە coucher par ecrit، یـەکێك لـەماناکانی coucher بریتییە لەخەواندن، یا پاڵخستن بۆ نووستن. پێشـتریش باسـی ئـەوە کرابـوو کـە نووسـین بەوە تۆمەتبارکرابوو گوایە جۆرێکە لەخەواندنی یادەوەری لەنێو ئەرشیف و جێکەوتدا.

[2]) لـەبارەی پێگـەو چـەمکی لاسـاییکردنەوە ـــ mimesis و پێشفەچـوونی لـەنێو هـزری ئەفلاتوندا، پـێش هـەموو شـتێك داوا دەکـەین بگەڕێنـەوە سـەر "توێژینەوەیـەك لـەبارەی کراتیلیـۆس" کـە ئێـف. گۆلـدشمیت ئەنجامیـداوە. لـەم توێژینەوەیـەدا دەردەکـەوێت کـە ئەفلاتون بەردەوام و لەهەموو شـوێنێکدا ئیدانـەی لاسـاییکردنەوە ناکـات. بەلایـەنی کـەم دەتوانین لەم شتانە تێبگەین: ئەفلاتون ئەگەر ئیدانەی لاساییکردنەوە بکات، یـا نـەیکات،

تـازە لاسـاییکەرەوەش بێـت. بێگومـان ئەمـە بەشـێوەیەك لەشـێوەكان ئـەنجامی ئەوەیە کە زۆر بەوردی لاسایی دەکاتەوە، شانسێکی گەورەتری هەیە لەسەرلەنوێ بەرهەمهێنانـەوە دەنـگ، چـونکە نووسـینی دەنگـی زۆر بـەجوانی بەرهــەمهێنانی دەنگ پووچ دەکاتەوەو دەیانکاتە توخمی داماڵراو. ئـەم پووچـکردنەوەیە ــ de-composition ی دەنگ، لێرەدا لەیـەك کـات هـەم پاراسـتنی دەنگـە، هـەمیش تێکدان و پووچەڵکردنیەتی. زۆر بەباشی لاسایی دەکاتەوە، چونکە تازە ناتوانێـت جـــارێکی تـــر لاســـایی بکاتـــەوە، لەبەرئـــەوەی لاســـاییکردنەوە لەکاتێکـــدا جەختکردنەوەیە لێی وەکو جەوهەرێك، لەهەمان کاتیشدا سڕینەوەیەتی.

هـیچ دیالیکتیکێـك ناتوانێـت ئـەم جـۆرە نـەگونجان و خـودە کـورت و پوخـت بکاتەوە. لاساییکردنەوەی زۆر وردو دروسـت، چـیتر لاسـاییکردنەوە نییـە، کاتێـك ئـەم جیاوازییـە وردە نامێنێـت لـەنێو ئەسـڵ و کـۆپی، ئـەوە ولی لێ دەکـات ببێـت بەخۆی، لەمیانەی ئەم سڕینەوەیەی جیاوازیدا، ئەوە لاساییکراوە جیـاواز دەبێـت، جیاوازییەکی ڕەها. چیتر ئەم کۆپییە ناگەڕێتـەوە سـەر ئەسڵی خـۆی کـە لێیـەوە

---

بەردەوام پرسیاری شیعری لەلای ئەم وەکو لاساییکردنەوە دەردەکەوێت، بـەوەش دەرگـا بەڕووی ئەم کایەدا دەکاتەوە کە تێیدا شیعرییەتی ئەرستۆ ـ هەر بەتەواوی ئاڕاستەی ئەم گوتەزایـە کـراوە ــ لـەبارەی چـەمکی ئـەدەب کـە تـاوەکو سـەدەی نۆزدەیـەمیش هـەر باڵادەست دەبێت. واتا تاوەکو کانت و هێگل کە جیاواز دەبنەوە، بەلایەنی کـەم جیـاوازن ئەگەر ئێمە mimesis وەربگێڕین بۆ imitation لاساییکردنەوە. لەلایەکی تریشـەوە، لەپشـــت ناونـــانی خـــەیاڵ وەرگـــرتن و فانتازیـــا phantasme یـــا هاوشـــێوەیی simulacre، ئەوە ئەفلاتون دەیگێڕێتەوە بۆ نووسین.

کۆپیکراوەو دەبێتە بوونەوەرێکی تر.[1] لاساییکراوە هەرگیز لەگەڵ جەوهەردا هاوشێوە نابێت، بێگومان ئەوەی کۆپی دەکرێت و لاساییکراوەیە، هەر دەبێت لەشوێنێکدا، لەخاڵێکدا کەموکوڕییەکی هەبێت، عەیبێکی هەبێت. ئەم کۆپییە لەجەوهەردا خراپە، بایی ئەوەندە باشە کە خراپە. مادام هەر لەسەرەتاوە شکست هێڵی خۆی تێدا کێشاوە، بۆیە خاوەنی سروشت نییە، خاوەنی هیچ تایبەتمەندییەك نییە.

مادام لاساییکردنەوە دوانەیەکی هاوسەنگ و ئاڵۆزە، لەنێو خۆیدا وازی و گەمە دەکات، خۆی لەخۆی دەدزێتەوە، لەیەك کاتدا، هەم لەنێو خۆیدا بەدی دێت و هەمیش باش و خراپە، ئەوە دیارە لاساییکردنەوە لەگەڵ فارماکۆندا بەیەك دەگەن. هیچ لۆژیك و دیالیکتیکێك ناتوانێت ئەم عەمبارەی کە لەسەری دانیشتووە، بەتاڵ بکاتەوە، چونکە ئەم، بەبێ کۆتایی وزەی لێ وەدەرگرێت.

---

[1] ) سوقرات دەڵێت:"باشە دوو شت بوونیان نابێت" ـ pragmata، لەلایەن کراتیلیۆسەوە لەبارەی وێنەی کراتیلیۆس. ئەگەر خواوەندێك بێت هەر بەوەندە نەوەستێت کە تۆی دروستکردووە، بەڵکو بێت وەکو وێنەکێشەکان، جارێکی تر تۆی وێنەکێشایەوە، ڕەنگ و شێوەو ڕوخسارت، زۆر بەوردی هەموو تایبەتمەندی و سیفەتەکانی تۆی بەرهەمهێناو جووڵاندی، هزرو ڕوحی پێدا وەکو ئەوەی تۆ هەتە. واتا بەکورتی، ئەگەر بەتەواوی تۆی لەنێو ئەم وێنەیەدا کۆپیکرد، ئەو کاتە کراتیلیۆس و وێنەی کراتیلیۆس بوونیان دەبێت؟ یا دەبن بەدوو کراتیلیۆس؟ ئینجا کراتیلیۆس وەڵام دەداتەوە: ئەی سوقرات، پێم وایە دەبینە دوو کراتیلیۆس".

لەواقیعدا، تەکنیکی لاساییکردنەوە وەکو بەرهەمهێنانی هاوشێوە، بەردەوام لەڕوانگەی ئەفلاتوندا فۆڕم و شێوەیەکی سیحری هەبووەو جێگای سەرنجڕاکێشان بووە:

*" شتەکان خۆیان شکاوو ڕاست دەنێنە بەرچاو کاتێك لەناو ئاوو لەدەرەوەی ئاو تەماشایان دەکەین. .............. بەپێی ڕوانینمان و ئەم ڕەنگانەی کە نمایشی دەکەن دەردەکەون، دیارە هەموو ئەوانەش لەنێو دەروونماندا ئاڵۆزی دروست دەکەن. ئەم نەدارییەی نێو سروشتی خۆمانە کە کۆمەڵێك دامێنانی لەم شێوەیە وەکو وێنەی سێبەردار ــ skiagraphia و هونەری جادووکەری ــ goeteia ی لەم جۆرە بەرهەم دێنێت و هەموو کارە سیحرییەکان ــ thaumatopoia بەم شێوەیەن". (دیالۆگی کۆمار).*

لایەنی پێچەوانە لێرەدا مەعریفە ــ episteme یە. ئەوەی هەیە بریتییە لەم سەرنجڕاکێشانەی کە هەیە بۆ دەرەوەی پێوەرەکان، کە ڕاماندەکێشێت بەرەو کەینوونەت و هاوشێوەیی و ماسك و جەژن، بۆیە هیچ لایەنێکی پێچەوانە نامێنێت، تەنیا پاراستنی پێوەر نەبێت. لایەنی پێچەوانە ــ alexipharmakon دەبێتە پێوەرزانی بەهەموو ماناکانی ئەم زاراوەیە. لێرەدا دەقەکەی پێشووتر تەواو دەکەینەوە:

*" باشە لەدژی ئەم خەیاڵە، هیچ چارەسەری گرنگ بەدی نەهاتووە لەنێو پێوانەو ــ metrein حیساب و ــ arithmein کێش دا ــ istanai، بەجۆرێك ڕوخسارو دیاردە ــ phainomenon گۆڕاوەکان، بالادەست*

***نەبن بەسەرمان، دەمێك درێژو دەمێك كورت، دەمێك قورس و دەمێك سووك، بەڵكو وای لێبێت بتوانین یەك بڕیار لەبارەی كێش و پێوانە بدەین؟ .... بەهەرحاڵ، دەشێت هەموو ئەم پرۆسانە وەكو دەسكردی عەقڵ ـــ out logistikou ergon تەماشا بكەین لەنێو ڕوحماندا".***

(ئەوەی سامپری وەكو چارەسەر ـــ remedes تەماشای دەكات، ئەو زاراوەیەی لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا دەبێتە فریاكەوتن ـ boetheia كە پێویست باوكی ئاخافتنی زیندوو بێت بەردەوام بیبەخشێتە نووسینی هەژار).

هونەرمەندی چاوخەڵەتێنەر، تەكنیككاری فێلكردن لەچاو، وێنەكێش، نووسەر، فارماكووس. ئێمە تێبینی هەموو ئەمانەمان كردووە. "باشە زاراوەی فارماكۆن كە دەلالەت لەڕەنگ دەكات، هەر ئەوە نییە كە بەسەر دەرمان و سیحربازو پزیشكاندا پراكتیك دەكرێت؟ باشە ئەوانەی سیحر لەخەڵك دەكەن، بۆ ئەوەی ئەم سیحرە پیسەیان بەرهەم بێنن، پەنا نابەنە بەر پەیكەری لەمۆم دروستكراو؟". ڕفاندن، یا سەرنجڕاكێشان بەردەوام ئەنجامی وێناندنە، ئینجا وێنەكشێان بێت، یا پەیكەرتاشی. بەردەوام وێنەی ئەویتر دەبات و بەندی دەكات، ڕادەمێنێت لەسیماو، ڕوخسارو، ئاخافتن و، تێڕامان و، دەم و، لووت و، چاوو و، گوێچكەكانی، هەموو دەمووچاروی ـ vultus.

كەواتە، زاراوەی فارماكۆن ئاماژە بۆ ڕەنگی وێنەكێشانیش دەكات، ئەو ماددەیەی تێیدا وێنەی كەسی لەسەر چاپ دەكرێت ـــ zographeme. بڕوانە كراتیلیۆس لەكاتی وتووێژیدا لەگەڵ هێۆمۆگینیس، چۆن سوقرات تێیدا بەدوای ئەم گریمانەیەدا دەڕوات كە پێی وایە ناوەكان لاساییكردنەوەی جەوهەری

شتەکانن. لێرەدا سوقرات دێت بەراوردیان دەکات تاوەکو جیاوازییەکان پیشان بدات، لەلایەک لەنێوان موزیک و وێنەکێشان، لەلایەکی تریش لەنێوان ناوو لاساییکردنەوە.

بۆ ئێمە، بەتەنیا ئەوە گرنگ نییە کە دەگەڕێتەوە بۆ فارماکۆن، بەڵکو ئەوەش گرنگە کە پێویستییەکی تر خۆی بەسەردا دەسەپێنێت کە هەوڵدەدەین لێرەو لەئێستاوە هێدی هێدی ڕۆشنایی بخەینەسەر: لەم چرکەیەدا کە باسی توخمە جیاوازەکانی زمان و ناوەکان دەکات، پێویستە لەسەری ـ وەکو ئەوەی سۆسێر دواتر ئەنجامی دەدات ـ دەنگی مرۆڤ وەکو ڕیتم و دەنگی ئامێرە موزیکییەکان تەماشا بکات و لاسایی بکاتەوە، بیکاتە موزیکایەکی لاساییکراو. مادام دەنگی مرۆڤانە ناوی هەیە، هەموو کەسێك ناوی هەیە، ئەوە خۆی لەمیانەی جیاوازی نێوان توخمەکانەوەیە کە خۆیان دەخزێننە ناوی ــ stokheia یا لەنێوان پیتە نووسراوەکاندایە ــ grammata. ئەم زاراوەیە هەر خۆی ــ stokheia ئاماژەیە بۆ توخم و پیت. پێویستە وا بیربکەینەوە کە ئەوەی لێرەدا پێشکەشکراوە، خۆی پێویستییەکی پەروەردەییە، دەستنیشانکردنی دەنگە زمانەوانییەکانە بەگشتی، پیتی تەواوو ناتەواو ـ phoneenta، بەو پیتانەی کە پێیان دەنووسرێن:

***" سوقرات: بەڵام ئێمە چۆن دەزانین چ شتێك خاڵی دەسپێکی لاساییکەرەوەی لاساییکراوەیە ـ کۆپی کۆپیکراو؟ مادام لاساییکردنەوەی جەوهەر لەمیانەی برگەو پیتەوەیە، باشە وردتر نابێت ئەگەر ئێمە پێشتر توخمەکان جیا بکەینەوە؟ ئەوانەی لەڕیتم دەکۆڵنەوە، کارێکی وا دەکەن،***

پێشتر دڵێن بەهای توخمەکان ـ stokheion جیا دەکەنەوە، ئینجا برگەکان، ئینجا ... ئینجا تاکلۆتایی کە دڵێن توێژینەوەی لەبارەی کۆی گشتی ڕێتمەکان دەکەن.

هێرمۆگینیس: بەڵێ وایە.

سوقرات: باشە پێویست ناکات ئێمەش پێشتر بڵێین پیتەکان ـ phoneenta جیابکەینەوە، ئینجا ئەوانیتر پۆلێن بکەین، ئەو توخمانەی هیچ دەنگیان نییە ـ aphona kai aphtonga، چونکە خەڵکی شارەزای ئەم بوارە وا دەڵێن، دواتر بچینە سەر ئەو توخمانەی کە خۆیان وەکو بێدەنگ پیشان دەدەن، بەڵام بێدەنگ نین و، بڵێین لەنێو ئەم دەنگانەدا جۆری جیاواز دەستنیشان بکەین؟ کاتێکیش ئەم هەموو جیاکارییەمان ئەنجامدا، ئەوکاتە دەبێت بەشێوەیەکی ڕاست هەموو بوونەوەرەکان ناویان پێبدرێت، بەگەڕان بەدوای ئەم جۆرانەی کە ئایا هیچ جۆرێك هەیە هەموو توخمەکان بۆی بگەڕێنەوە، یا ئەوانەی دەکرێت لێیانەوە، خودی خۆیان ببینین، لەهەمان کاتیشدا لەوە دڵنیابین کە ئایا هیچ توخمێك لەهەر جۆرێك لەخۆ دەگرن، یان نا.

هەرکات بەوردی و بەقووڵی لەهەموو ئەم کێشانەمان کۆڵییەوە، ئەو کات دەتوانین هەر توخمێك بۆ هاوشێوەکەی بگێڕینەوە، ئینجا ئەگەر پێویستی کرد هەر توخمێك بۆ یەك شت بگێڕینەوە، یا توخمەکان تێکەڵاوی زۆر شت بکەین. وێنەکێشەکان بۆ ئەوەی هاوشێوەیی بەدی بێنن، جارێك ڕەنگێکی سادە دەبەخشن، جارێکی تریش ڕەنگی تر ـ allo ton

***pharmakon. مەندێکجاریش زۆر ڕەنگی جیاواز تێکەڵ دەکەن کاتێک دەیانەوێت ڕەنگی پێست، یا شتێکی لەم شێوەیە بکێشن. پێم وایە هەر پۆرتەرێتێك پێویستی بەڕەنگێکی ـ pharmakou تایبەتی خۆی هەیە. بەهەمان شێوەش، ئێمە توخمەکان بەسەر شتەکان پراکتیك دەکەین، هەر یەکێك ئەم توخمەی کە زۆر پێویستی پێیەتی، یا کۆمەڵێك توخم لەیەك کاتدا، بەوەش ئێمە ئەم شتە دروست دەکەین کە پێی دەڵێن برگە، ئینجا برگەکان کۆدەکەینەوە تاوەکو ناوو کردەکان دروستبکەین، سەرلەنوێ ناوو کردەکان کۆ دەکەینەوە تاوەکو کۆمەڵێکی گەورەو جوان دروستبکەین، وەکو ئەم بوونەوەرە زیندووە ـ zoon کە لەمیانەی وێنەکێشانەوە پێش کەمێك بەرەمهاتەوە ـ te graphike". ***

پاشان، لەشوێنێکی دواتردا دەڵێت:

***" ڕاست دەکەیت. کەواتە، بۆ ئەوەی ناوێك هاوشێوە بێت لەگەڵ شتێك، پێویستە ئەم توخمانەی ناوەکەی لێ دروست دەکرێت، هاوشێوەی ئەم شتە بێت؟ ڕوونتر، باشە هەرگیز دەکرا ئەم تابلۆیە لەسەر شێوەو وێنەی واقیعی بکێشرێت کە پێشتر باسمانکرد، ئەگەر سروشت یارمەتیمان نەدات بۆ دروستکردنی وێنەو تابلۆ لەمیانەی ئەم ڕەنگانەی کە خۆیان هاوشێوەن بەم شتانەی وێنەکێش لاساییان دەکاتەوە؟ ئەگەر ئەمە نەبێت، کارەکە دەکرێت؟". ***

لەنێو دیالۆگی کۆماردا، ڕەنگەکانی وێنەگێش بە فارماکا ـ pharmaka ناودەبرێت. بەوەش، سیحری نووسین و وێنەکێشان، سیحری سەوزاییە کە لەنێو

ڕوخسارێکی زیندوودا، مردوو دەشارێتەوە. فارماکۆن مەرگ دێنێت و جلەوی دەکات. وێنەیەکی باش بەڕووداوەکە دەدات، جوانتری دەکات و دەیڕازێنێتەوە. بۆن و بەرامەو جەوهەرەکەیەتی وەکو ئەوەی ئەسخیلیۆس وەسفی دەکات. فارماکۆن خۆی بەمانای بۆنی خۆشیش دێت، بۆنێك بەبێ جەوهەرو ڕوح وەکو ئەوەی دەڵێین عەقارێکی بێ ماددە. سیستەم جوان دەکات، گەردوون وەکو سیستەمێکی تەباو گونجاو، دەکاتە هونەری جوانکردن ــ cosmetique. مەرگ، ماسك، سەوزایی، هەموو ئەمانە ئەم جەژنەن کە سیستەمی شار وێران دەکەن، وەکو چۆن پێویستە هەریەك لەپیاوی دیالیکتیك و پیاوی کیان ڕێکی بخەنەوە. ئەفلاتون، وەکو ئەوەی دەبینین، دوا ناکەوێت لەوەی هاوشێوەیی و لێکچوون دروستبکات لەبارەی نووسین و جەژن، نووسین و گەمەکردن. جەژنێکی دیاریکراوو و گەمەیەکی دیاریکراویش.

ئالێرەدا ئێمە لەسەر لێواری ئەوەداین بچینە نێو قوولایی کۆگایەکی تری ئەفلاتونی. پێشتر هەستمان بەوە کرد ئەم دەرمانخانەیە وەکو شانۆیەکە، ناهێڵێت شانۆکار خۆی قسەکانی خۆی تەواو بکات، کۆمەڵێك هێزو پانتایی و یاساو خزمایەتی و مرۆیی و خوایی و گەمەو مەرگ و جەژن هەیە. لێرەوە ئەو قووڵاییەی بۆمان دەردەکەوێت، ئاراستەی دیمەنێکی ترمان دەکات، یا بڵێین تابلۆیەکی تری شانۆنامەیەکی نووسراو.

سوقرات پاش ئەوەی فارماکۆنی پێشکەش دەکرێت، پاش ئەوەی لەبەهای تووت کەم دەکرێتەوە، لەبەرژەوەندی خۆیدا دەوێت. وەکو ئەوەی بیەوێت لۆگۆس بخاتە شوێنی میتۆلۆژیا، گوتارێك بخاتە شوێنی شانۆ، سەلماندن بخاتە شوێنی ڕوونکردنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، دیمەنێکی تر بەهێمنی دێت خۆی دەخاتە بەر تیشکی ڕووناکی. ڕاستە بەهەمان ڕادەی ڕاستەوخۆ وەکو ئەویتر نابینێت، بەلام لەبێدەنگیدا دەمێنێتەوە، لەگەڵ ئەویتر لەنێو شووراو چوارچێوەی دەرمانخانەدا سیستەمێکی زیندوو لەوێنەو گواستنەوەو دووبارە بوونەوە پێکدێنێت.

هەرگیز ئەم دیمەنە ئاوا بەم شێوەیە پڕ لەخوازەیە نەخوێنراوەتەوە: دیمەنێکی خێزانی. لێرەدا پرسیارەکە لەبارەی باوك و کوڕەوەیە، ئەم منداڵە بیژییەی کە چاودێری کۆمەلایەتی ناکرێت. کوڕی ڕەسەن و باش، میراتگر، سپێرم، نەزۆکی.

هیچ شتێك لەبارەی دایکەکە ناگوترێت، کەسیش گلەیی لەم حاڵەتە نییە. ئەگەر ئێمەش جوان بەدوایدا بگەڕێین وەکو ئەوەی لەنێو ئەم وێنانەدا هەیە کە داوا دەکرێت لێیان وردبینەوەو جیاوازییەکانیان بدۆزینەوە، ئەوە ڕەنگە ئێمە وێنەیەکی پڕ لەدڵەڕاوکێ و سەراوژێری ئەم بدۆزینەوە کە لەسەر گەڵا کێشراوە لەباخچەی پشتەوە ماڵدا، لەنێو باخچەی ئەدۆنیس ـــ eis Adonidos Kepou.

پێش کەمێك سوقرات بەراوردی کردبوو لەنێوان وێنەکێشان و، کوڕەکانی نووسین. گاڵتەی بەوە کردبوو کە خۆی بۆ خۆی بەس نییەو پڕە لەحەشووی بێزارکەری ئەم وەڵامانەی کە لێی دەردەچێت ئەگەر بیخەینە ژێر پرسیارو، دەڵێن:

***" شتێکی تریش هەیە، کاتێك گوتارێك یەکجارو هەتا هەتایی نووسرا، ئەوە بەردەوام چەپ و ڕاست دەکات، بێ جیاوازی، لەسەردەستی ئەوانەی شارەزاییان لێی هەیەو، ئەوانەش کە هیچی لێ نازانن. ئەم گوتارە خۆیشی نازانێت کە بەوردی ئاڕاستەی کێ بچێت و نەچێت. لەلایەکی تریشەوە، هەر ئەوەندەی بەسە چەند دەنگێکی نەشازی لێ هەڵستێتەوەو بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە بێزراو بێت، ئەو کاتە، بەردەوام پێویستی بەیارمەتی و پاڵپشتی باوکی دەبێت، ئەم خۆی بەتەنیا، هەرگیز ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات و یارمەتی خۆی بدات".***

دیارە خوازەی مرۆیی و زیندەوەرزانیانە، ئەوە پیشاندەدات کە گوتاری نووسراو ـ logos gerammenos وەکو زیندوویێك لەباوکێکەوە هاتووە. بۆیە،

لەلای ئەفلاتون شتێك نییە هەبێت نووسراو بێت، بەڵكو ئەوەی هەیە لۆگۆسێكی لەم شێوەیەو بەم شێوەیەیە، بەڕادەیەك نزیكە لەمەو بەڕادەیەكیش لەوە.

نووسین سیستەمێكی دەلالی سەربەخۆ نییە، بەڵكو قسەیەكی لاوازەو شتێكی تەواو مردوو نییە، بەڵكو نیوە مردوو و نیوە زیندووە. مردووێكە بەبێ ئەوەی مردبێت، ژیانێكی دواخراوی هەیە، نیوە دەروونێك. خەیاڵی گوتاری زیندوو یا تارماییەكەی خەیاڵكراوە، وێناكراوە، چەقبەستوو نییە وەكو چۆن دەلالەتداریش نییە، بەڵكو بەردەوام دەلالەت لەكەمێك شت دەكات. ئەم جۆرە دەلالەتە لەكەمێك شت، ئەم گوتارە كە گوێ بەهیچ نادات، وەكو هەموو تارماییەكی تر، ونبووەو بەنێو پانتاییدا دەسووڕێتەوەو ــ kulindeitai نازانێت بچێتە كوێ، ڕێگای ڕاستی بزر كردووە، بنەماكانی ڕاستگۆیی و پێوەرەكانی. وەكو هەر كەسێكیش كە مافەكانی خۆی لەدەستدابێت، وەكو هەر كەسێك كە یاسای پێشێلكردبێت، سەرلێ شێواوە، بزرە، كوڕێكی خراپە، سەركێشەو خۆی بەزل دەزانێت. بەشەقامەكاندا دەسووڕێتەوەو خۆیشی نازانێت كێیەو چی دەكات و چییە، نازانێت چ ناسنامەو ناوێكی هەیە، ناوی خۆی نازانێت، ناوی باوكی خۆیشی نازانێت. كاتێك لەسەرە ڕێگاكان بەقسە دەخرێت، هەمان قسە دووبارە دەكاتەوە، چیتر نازانێت لاسایی ئەسڵی خۆی بكاتەوە.

نازانێت بەرەو كوێ دەڕوات و لەكوێوە هاتووەو دێت، ئەوەش بۆ گوتارێك كە لەنێو دیالۆگدا نەبێت، وەكو ئەوە وایە لەحاڵەتی ناوشاریدا بێت و نەتوانێت بدوێت. ئەم جۆرە دالە لەنادالێك دەچێت، خۆی هەڵكەندبێت، لەنائاگاییدا بێت، لەهەموو پێوەندییەك لەوڵات و ماڵ داماڵرابێت و، لەخزمەت و بەردەستی هەموو

خەڵکدابێت. خەڵکانێکی زۆرزان و خەڵکانێکی گەمژەش، ئەوانەی زۆر شت دەزانن و ئەوانەی هیچیش نازانن، ئەوانەی ڕێزی دەگرن و ئەوانەش کە هیچ بایەخی پێنادەن، چونکە نایناسن و بەلایانەوە گرنگ نییە. لەڕاستیدا دووچاری هەموو جۆرە کارێکی گەمژانە دێت.

باشە ئەی نووسین لەیەك کاتدا ئامادە نییە بۆ هەموو کەسێك، ئەی لەسەر شۆستەکاندا نمایش ناکرێت، باشە ئەی لەبنچینەدا دیموکراسییانە نییە؟ دەتوانین دادگاییکردنی نووسین بەدادگاییکردنی دیموکراتییەت بەراورد بکەین وەکو ئەوەی لەنێو دیالۆگی کۆماردا ئەنجام دراوە. لەنێو کۆمەڵگەی دیموکراتیدا کەس گوێ بەخاوەن تواناو شارەزاییەکان نادات و هەر کەسێك بێت، بەرپرسیارێتی پێدەدرێت، تەنانەت درێژکردنەوەی ماوەی کارکردنی دادوەرانیش هەر لەڕێگای دەنگدانەوە دەبێت.[1] هەر کەس بۆ خۆیەتی و کەس بەکەس نییە، هیچ پێوەرێك بوونی نییەو ئاژاوەیە.

مرۆڤی دیموکراتی هەرگیز بایەخ بەڕێزبەندی و پلەبەندی نادات، جۆرێك لەیەکسانی لەنێوان خۆشی و چێژەکانی دروست دەکات و سەرکردایەتی ژیانی خۆی دەداتە ئەو کەسەی کە زوو دێت، "وەکو ئەوەی بەشانس بڕیار بدات، تاوەکو لەم کەسە تێردەبێت، ئینجا دەیداتە دەست کەسێکی تر، هەموو کەسەکان

[1]) لێرەدا چەمکی دادوەر لەبری دەسەلات و دەسەلاتداران بەکارهاتووەو، دریدا دەیەوێت ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە لەنێو سیستەمی دیموکراتیدا، هەموو شتێك بەدەنگدانی جەماوەری یەکلایی دەکرێتەوە، تەنانەت مانەوەو ڕۆیشتنی سەرۆك و حزبەکانی نێو دەسەلاتیش، پێوەندی بەدەنگی خەڵکەوە هەیە.

بەیەك چاو تەماشا دەكات، بەبێ ئەوەی هیچ كەسێك فەرامۆشبكات و ڕەتی بكاتەوە. ئەگەر بەردەوام بین و بڵێین، ئەوە عەقل ــ logon و حەقیقەتی بەرجەستەبوو ـ alethe فەرامۆش و پەراوێز دەكات و ڕێگایان پێنادات بێنە نێو كۆمەڵگە. ئەگەر پێشی بڵێین ئەم چێژانە هەڵقووڵاوی ئارەزووی پاك و باشن، ئەمانەی تریش لادەرەو خراپن، پێویست دەكات ئەوانەی یەكەم پەروەردە بكرێن و ئەوانەی دووەمیش جڵەو، بەبێزاری و بەئاماژە وەڵام دەداتەوەو، پاساوی ئەوەت بۆ دێنێتەوە كە هەردوو جۆر هەڵقووڵاوی یەك سروشتن و دەبێت وەكو یەك تێر بكرێن.

ئەم مرۆڤە دیموكراتییە سەرلێ شێواوە، وەكو ئارەزوو و دالێكی كۆنبوو بەلۆگۆس وایە، ئەو كەسەی كە تەنانەت بەشێوەیەكی ڕێكخراو، لادەریش نییەو، ئامادەیە بۆ هەموو شتێك و خۆی دەداتە دەستی هەموو شتێك، ملی خۆی بۆ هەموو جۆرە ئارەزوویێك كەچ دەكات، بۆ هەموو كارێك، تەنانەت ڕەنگە بۆ فەلسەفەو سیاسەتیش. (هەندێكجار وا دێتە بەرچاو وەكو ئەوەی ڕۆچووبێتە نێو فەلسەفە، زۆرجاریش ئەم جۆرە پیاوی دەوڵەتن و دەچنە سەر سەكۆكان و هەموو شتێك دەڵێن و هەموو كارێكیش دەكەن كە بەخەیالیاندا بێت).

ئەم سەركێشە، هەروەكو سەكێشەكەی نێو دیالۆگی فیدرۆس وایە، بەرێكەوت هەموو شتێك دروست دەكات و، لەڕاستیشدا هیچ نییە. لێرەدا خراوەتە بەردەم هەمووان، هیچ جەوهەرێكی نییە، هیچ حەقیقەتێكی نییە، ناوی بنەماڵەشی نییە،

شێوەیەکی تایبەتیشی نییە. وەکو چۆن مرۆڤی دیموکراتی هیچ دەستوورێکی[1] تایبەتی نییە، چونکە دیموکراتییەت نابێتە دەستوور، بۆیە بەردەوام بووم و گوتم:

*" پێم وایە سەلماندم کە لەیەک کاتدا لەنێو خۆی کۆمەڵێک شێوەو کەسایەتی جیاواز کۆ دەکاتەوە، مرۆڤێکی جوان و ڕەنگاوڕەنگ و ڕازاوەیەو* poikilon *ــ زۆریش بەوڵاتی دیموکراتی دەچێت. بۆیە زۆر خەڵک لەهەردوو ڕەگەز ئیرەیی بەم جۆرە ژیانە دەبەن کە خەریکە هەموو جۆرە دەسەڵات و عورفێکی تێدا دەدۆزینەوە.*

*دیموکراتییەت بریتییە لەبەرەڵڵایی و کەندەڵی، بازارێکی گەورەیە، بازاڕی ئەسپێیە،[2] مەزادخانەی دەستوورە، مرۆڤ دەتوانێت تێیدا ئەو نموونەیە هەڵبژێرێت کە لەگەڵ خۆیدا دەگونجێت و دەیەوێت دووبارە بەرهەمی بێنێتەوە".*

ئەم ئاست نزمییە، ئینجا لەلایەنی نووسینەوە تەماشای بکەین، یا لەلایەنی سیاسییەوە، یا تەنانەت لەوەش زیاتر لەلایەنەکانی تریشەوە تەماشای بکەین، وەکو ئەوەی فەرەنسییەکان لەسەدەی هەژدەیەمدا کردییان، بەتایبەتیش ڕۆسۆ ـ وەکو سیاسییەک ـ نووسەرێک، بەردەوام دەشێت وا ڕاڤە بکرێت کە پێوەندییەکی

(1) constitution لێرەدا بەکۆمەڵێك مانا بەکاردێت، دەستوور، دامەزراندن، لێکدان، میزاج، سروشتی مرۆڤ. لێرەشدا مانای دەستوورو سروشتی تایبەتی کەسەکان زیاتر خۆیان نمایش دەکەن.

(2) لێرەدا مەبەست بازاڕی شتی کۆنەیە کە جلی کۆن و هەرزانی دەستی دوو و لەنگەی تێدا دەفرۆشێت، ئەوەندە کۆنە بەجۆرێك پڕ بووە لەئەسپێ، لێرەوە ئەم ناوەی لێنراوە.

دابڕاوو ڕزیـوه لـەنێوان بـاوك و کـوڕدا. ئـەفلاتون بـەردەوام پێـی وایـە دەبێـت ئارەزووەکانیش وەکو منداڵان پەروەردە بکرێن.[1]

نووسین کوڕێکی پەشێوە، زۆریش پەشێوە. جارێکیان فۆڕمی دەنگی سوقرات زۆر توندو یەکلاکەرەوەیە، ئیدانەی کوڕێـك دەکـات کـە لـەڕێگای ڕاسـت لایـداوە، هەڵگەڕاوەتەوە، جۆرێك لادان و بەزاندنی پێوەرەکانی پێوە دیارە. جارێکی تریکی تـریش دەنگێکـە بـەزەیی پێدادێتـەوە، بـەرگری لەبوونـەوەرێك دەکـات کـە بـێ دەسەڵاتە، کوڕێك کە باوکی دەسبەرداری بـووەو فرێیـداوە. لەهـەموو حاڵەتێکـدا،

---

١) پێمان وایە ئامـاژەدانی دریـدا لێـرە بەڕۆسـۆ، لەدوو بۆچوونەوە سەرچـاوە دەگرێـت. یەکـەم، ئاماژەیە بۆ کتێبی (ئەمیل) لەبارەی پەروەردەی خێزانییـەوە کـە ڕۆسـۆ نووسـیویەتی و تێدا باسی سیستەمێك بۆ پەروەردە دەکـات. دووەم، ئاماژەیـە لەسـەر بۆچـوونی ڕۆسـۆ لـەبارەی گـۆڕانی سروشـتی مـرۆڤ لەگـەڵ بەرەوپێشچـوونی ڕۆژگـاردا. ئـەم مەسـەلانە بایـەخێکی زۆریـان هەیـە لـەنێو تێڕامـان و فەلسـەفەکەی ڕۆسـۆدا لـەبارەی سروشـتی مرۆڤایەتی و، لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کـە ئـەو جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە گوایـە ڕەگەزی مرۆڤایەتی لەسایەی بازدان و گواستنەوە لەباری سروشـتییەوە چـووە نێـو بـاری ئیلتیزامـی سیاسـی و کۆمەڵگـەی مـەدەنی و شارسـتانی، بۆیـە لـەلای ئـەو زمـان بووەتـە مەرجەعێك و دەلالەت لەو ئاستە گەندەڵە دەکـات کـە سروشـت پێـی گەیشـتووەو بـەهۆی کولتوورەوە بەسەر خۆیدا دابەشبووە. لەلای ڕۆسـۆ، بڵاوبوونـەوەی بـەرفراوانی کولتـووری ڕۆشنبیری خراپەی زیاترە لە چاکەکەی، چـونکە ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـات گوایـە لەگـەڵ بڵاوبوونـەوەی خوێندنـەوەو نووسـین و چـاپەمەنیدا، ئاژاوەگـەریش بڵاوبـووەوە، کەواتـە نووسین و بڵاوبوونەوەی نووسین هـۆی ئاژاوەگەرییـە ــ نزیکـە لەبۆچوونەکەی تـامووس. ڕۆسۆ پێی وایە بیرکردنەوە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ دژکارو ناکۆکەو، فێرکـردن مـرۆڤ ناکاتـە مرۆڤێکی چاکەخواز، بەڵکو وای لێ دەکـات لـەفریودان و هەڵخەڵەتاندنـدا باڵادەسـت بێـت. (وەرگێڕی کوردی)

کوڕێکی ونبووە، یەتیمێکی[1] نەدارو بێ دەسەڵاتە. بەهەمان ئەندازەش، تۆمەتبارە بەکوشتنی باوکی و هەندێکجاریش زاڵمانە تۆمەتبار دەکرێت و ڕاوەدوو دەنرێت.

---

[1]) بەردەوام یەتیم لەنێو دەقەکانی ئەفلاتون و هەندێك دەقی تریشدا، نموونەی کەسی بێدەسەڵات و ڕاوەدوو نراوە. لەسەرتاوە پێوەندی نێوان نووسین و میتۆس ــ عەقڵی ئەفسانەیی و غەیبیمان خستۆتەڕوو ـ کاتێك بەرانبەر بەلۆگۆس دانراون. ڕەنگە یەتیم یەکێك بێت لەم پێوەندییانەی کە بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە. لۆگۆس باوکی هەیە، لەکاتێکدا زۆرجار باوکی میتۆلۆژیا نادۆزرێتەوەو ونبووە. ئالێرەوە پێویستی بەم یارمەتییە هەیە کە لەنێو دیالۆگی فیدرۆس لەبارەی نووسین وەکو یەتیم خراوەتە ڕوو. ئەم بابەتە لەهەندێك شوێنی تریشدا دەردەکەوێت، بۆ نموونە کاتێك سوقرات دەڵێت:
"بەم شێوەیە لەهەمان کاتیشدا مۆتۆلۆژیای پرۆتاگۆراس و میتۆلۆژیای تۆ لەبارەی هاوشێوەیی نێوان زانست و هەست لەناو چوون.
تیماوس: پێدەچێت وا بێت ....
سوقرات: بەڵام ئازیزم پێم وایە مەسەلەکە بەم شێویە نابێت، بەلایەنی کەم ئەگەر باوکی یەکەمی میتۆلۆژیا هێشتا زیندوو بووایە، ئەوە دەیتوانی بەرگری لێبکات و زۆر لێدانیشی لێ دووربخاتەوە. بەڵام ئەوەی ماوەتەوە لەئێستادا، تەنیا یەتیمێکە ئێمە وا لەخۆڵێی وەردەدەین. بەتایبەتیش ئەو وەسییانەی کە پرۆتاگۆراس بۆی جێهێشتن و هەموو یارمەتییەکی لێ دەبڕن ـ boethein، یەکەم کەسیش کە ئەم کارە دەکات، تیۆدۆریسی ئازیزمانە. کەچی ئێمە، خۆمان سەرکێشی دەکەین بەوەی یارمەتی پێشکەشبکەین ــ boethein.
تیۆدۆریس: .... ئێمەش سوپاست دەکەین ئەگەر یارمەتی بدەیت ـ boethes.
سوقرات: قسەیەکی زۆرباشت کرد ئەی تیۆدۆریس. بیر لەیارمەتی من بکەوە ـ boetheian وەکو ئەوەی لەنێو دیالۆگی تیماوس پێشکەشی دەکەم.

تەنەنات سوقرات لەم بەزەیی پێهاتنەوەیەشدا زۆر دەڕوات: مادام نووسینی زیندوو هەیە ڕاوەدوو نراوو هەژارن ناتوانن بگەنە هاناو فریای نووسەر — logographe (ئەوە قسەی سوقراتە)، ئەوە بێگومان گوتاری تریش هەن، گوتاری نیوە مردوو ـ نووسین ـ ی ڕاوەدوو نراو، چونکە ئاخافتنی باوکی لەپشت نییە، باوکی کە کۆچی دواییکردووەو مردووە. ئەم کاتە دەشێت هێرشبکرێتە سەر نووسین و بەناحەق یەخەی بگیرێت ـ ouk en dike loidoretheis بەهەندێك قسەی سووك، کە تەنیا باوك دەتوانێت پێشگیری لێبکات و فریای بکەوێت، فریای کوڕی خۆی بکەوێت، ئەوە ئەگەر پێشتر کوڕەکە باوکی خۆی تیرۆر نەکردبێت.

کوشتن و تیرۆرکردنی باوك، دەرگای موممارەسەی توندوتیژی بەسەرپشتدا دەکاتەوە. کاتێك کوڕ ڕێگای توندتیژی هەڵدەبژێرێت — هەر لەسەرتاوە مەسەلەکە پێوەندی بەمەوە هەیە — توندوتیژیش دژی باوك، ئەوە کوڕ — یا نووسینی بکوژی باوك ـ ئامادەیە خۆیشی نمایش بکات. هەموو ئەم کارانە بۆ ئەوەیە تاوەکو ئەم باوکەی کە کوژراوە، نەتوانێت بێتەوەو بگەڕێتەوە، یەکەم قوربانی و دوا پەناگە، دەڵێین ناگەڕێتەوە ئێرە جارێکی تر. بەردەوام بوون لێرەدا بۆ ئاخافتن و قسەی باوك دەگەڕێتەوە، بەردەوام باوك شوێنگەی جێنشینبوونە.

نووسینێك کە لەیاسا لایداوەو پێشێلکاری کردووە، کوڕێکی بزربووە. لێرەدا پێویست دەکات ئەوە بیرخەینەوە کە ئەفلاتون بەردەوام حەز بەوە دەکات قسە لەبارەی ئاخافتن و یاسا بکات، لۆگۆس و ناموس. یاساکان قسەدەکەن و دەئاخفن، ئەوان خۆیان لەنێو دیالۆگی کریتیۆندا قسە لەگەڵ سوقرات دەکەن. لەنێو کتێبی دووەمی دیالۆگی کۆماریشدا، یاسا دێت قسە لەگەڵ ئەم باوکە

دەكات كە كوڕەكەی بزر كردووەو، دڵی دەداتـەوەو ئامۆژگـاری دەكـات و داوای لێ دەكات سەبر بگرێت:

***" ئینجا قسەمان تەواو كردوو، گوتمان پیاوێكی ئاسایی خاوەن سیفەتێكی هاوسەنگ، كاتێك دووچاری كێشەیەك دێـت، كـوڕێكی لەدەسـت بـدات، یـا شتێكی خۆشەویستی، ئاسانتر لەكەسێكی تر دەتوانێت بەرگەی ئەم ئێش و ئازارە بگرێت... باشە ئەوەی وای لێ دەكات بەرگـە بگرێـت و ئاماۆژگـاری دەكات، عەقڵ و یاسا نییـە ــ logos kai nomos، ئـەوەی پاڵیشـی پێـوە دەنێـت ئـازار بخـوات، خـودی ئـێش و تالانەوەیـە ــ auto to pathos. یاسا دەڵێت ـ Legei pou o nomos ـ هیچ شتێك لەوە جوانتر نییە لەكاتی ڕوودانی كارەساتێكدا مرۆڤ بتوانێت هاوسـەنگی خـۆی بپارێزێت" .***

پرسـیاری ئێمـە ئەوەیـە: بـاوك چییە؟ بـاوك بـوونی هەیـە. بـاوك بریتییـە لـەو كوڕەی كە ونبووە. نووسین ئەم كوڕە ونبووەیە، وەڵامی ئـەم پرسـیارە ناداتـەوە، بەڵكو دەنووسێت: بـاوك بـوونی نییـە، واتـا ئامـادە نییـە. كـاتێكیش قسـەكردن و ئاخـافتن بـۆ بـاوك ناگەڕێتـەوەو ئـەم نایكـات، ئـەوە پرسـیاری "ئـەوە چییە؟" هەڵدەپەسـێردرێت، ئـەم پرسـیارەی بـەردەوام بەشـێوەیەكی حەشـوو دەپرسێت"باوك چییە؟"، لەگەڵ خۆیشیدا ئەمە وەڵامەكەیە: بـاوك بـوونی هەیـە" ئەم كاتە، جیاكاری باوی نێوان باوك و كوڕ، ئاخافتن و نووسین دێتە پێشەوە.

ئێستا كاتی ئەوەیە بزانین سوقرات لەنێو ئەم دیالۆگانەدا، ڕۆڵی باوك دەبینێت، ئـەو نوێنەرایـەتی بـاوك دەكـات و باوكـە، یـا بـرا گەورەیـە. دوای كـەمێكی تـریش

دەبینین برا گەورە چی بەسەر دێت. سوقرات ئەوە بەبیر خەڵکی ئەسینا دێنێتەوە، وەکو چۆن باوك شت بەبیر منداڵەکانی خۆی دێنێتەوە، بەوەی کاتێك ئەم دەکوژن، ئەوە زوڵم لەخودی خۆیان دەکەن. با لەزیندانەکەی خۆیەوە گوێبیستی ئەم قسانەی سوقرات بین کە تێیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات گوایە فرت و فێڵەکانی بێکۆتایین، بۆیە سادەو تۆمەتی بێ بنەمان، کەواتە مەمکوژن و بەزیندوویی بمهێڵنەوە، مادام لەپێناوی ئێوەدا پێشتر من مردووم:

*" ئێستاش ئەی خەڵکی ئەسینا، قسەم پێ مەبڕن .... من پێتان دەڵێم و ئاگادارتان دەکەمەوە، ئەگەر ئێوە بڕیاری مەرگتان بەسەرمندا دەرکردووە، منیش ئەوەم کە ئێوە دەزانن، ئەوە با پێتان بڵێم، ئێوە خراپە بەرانبەر بەمن ناکەن، بەڵکو زیاتر لەمن خراپە بەرانبەر بەخۆتان ئەنجام دەدەن. زۆر بیر لەم مەسەلەیە بکەنەوە. ئەگەر ئێوە ناچار بەمردنم بکەن، ئەوە بەئاسانی پیاوێکی تر نادۆزنەوە، من ئەوە دەڵێم ئەگەرچی سەرکێشی دەکەم و هەندێکتان دەخەمە پێکەنین، پیاوێك نادۆزنەوە ویستی خوایەکان ئاراستەی بکات بۆ ئەوەی هانتان بدات، وەکو چۆن نەعرەتەیەك وا لەئەسپێکی گەورە دەکات، سەرەڕای گەورەیی ئەم ئەسپە، بەڵام کەمێك بەنەرمی، پێویستی بەوەیە کەسێك بیوروژێنێت و هانی بدات. ئەوە ئەم فرمانەیە کە خوایەکان پێیان سپاردووم بۆ شارەکەتان ئەنجامی بدەم، بۆیە دەستبەرداری ئەوە نابم هانتان بدەم و پاڵتان پێوە بنێم و قسە بەیەکە بەیەکەتان بڵێم، هەر لەبەیانییەوە خەریکی ئەوەم تا ئێوارە. نەخێر ئەی دادوەران، ئێوە بەئاسانی کەسێکی هاوشێوەی من نادۆزنەوە، بۆیە ئەگەر*

*بروام پێبکەن، ئەوە پێویستە بمپارێزن. خۆ دەشێت پەلەش بکەن، وەکو ئەوەی کەسێك لەخەو هەڵدەستێت و، لەکاتی تووڕەییدا گوێتان لەقسەکانی ئەنیتۆس دەبێت و پاڵم پێوە دەنێن بەرەو مەرگ. دوای ئەم کارەشتان، تا ماون لەخەودا دەبن، مەگەر خواوەندەکان گوێتان پێبدەن و پیاوێکی تری وەکو منتان بۆ بنێرن شوێنم بگرێتەوە ـ epipempseie.*

*بەهەرحاڵ، دەتوانن بروا بەوە بێنن من پیاوێکم خواوەندەکان بۆ ئەم شارەیان ناردووە، ئێوە لەخۆتان بپرسن، بزانن کەسێك هەیە، مرۆڤێك هەیە وەکو من هەموو بەرژەوەندییە کەسییەکانی خۆی بەلاوەبنێت، بۆ چەندین ساڵیش بەرگەی ئەم ئەنجامەی کارەکانی بگرێت، لەبەر هیچ نا، تەنیا لەبەرئەوەی بەئێوە سەرقاڵ بێت، بۆ هەر یەکێکتان ڕۆڵی باوك و برای گەورەتان ببینێت ـــ osper patera e adelphon presbuteron، بەتکاو رجاوە داواتان لێبکات خۆتان باشتر بکەن".*

ئەوەی پاڵ بەسوقراتەوە دەنێت جێگەی باوك و برا گەورەی خەڵکی ئەسینا بگرێتەوە ــ ڕۆڵێکە بەبێ ئەوەی بیری لێبکاتەوە کە نوێنەرایەتی باوك و برا گەورەی خۆیشی دەکات ــ دەنگێکی دیاریکراوە. دەنگێکە زۆرتر کۆتایی بەشتەکان دێنێت، زیاتر لەوەی داوای بکات و ملکەچی بۆ بکات، واتا سوقرات خۆی بەشێوەیەکی هەڕەمەکی وەکو ئەسپەکەی نێو دیالۆگی فیدرۆس کە ملکەچ بوو، ئەم کارە دەکات بەپێی بانگەوازو دەنگێکی خواییانەی لۆگۆسەوە:

*" ئەوە، وەکو ئەوەی بیستوونانەو زۆرجاریش لەزۆر شوێن باسمکردووە، لەبەرجەستەبوونێکی دیاریکراوی خواوەند، یا ڕوحی خوایی لەنێو مندا*

*بەرهەم دێت، هەر ئەوەشە کە میلیتۆس بەشێوەیەکی ناحەزانە ماددەی تۆمەتبارکردنی منی لێ دروستکردووە ـ o de kai en te graphe epikomodon Meletos egrapsato phone. ئەوە شتێکە هەر لەمنداڵییە لەنێو مندا سەری هەڵداوە، دەنگێکی دیاریکراو ـ phone هەمووکات دووری خستوومەتەوە لەو شتانەی دەمویست ئەنجامیان بدەم، بەبێ ئەوەی هەرگیز پاڵم پێوەبنێت ئەم کارانە بکەم".*

مادام سوقرات هەڵگری ئەم هێماو ئاماژانەی خوایە ـ to tou theou semeion daimonion semeion، وەکو ئەوەی لەنێو دیالۆگی کۆماردا هاتووە، ئەوە هەڵگری دەنگی باوکە، ئەم قسەکەرو گوتەبێژی باوکە. ئەفلاتونیش، کاتێك دەبینێت سوقرات دەمرێت، دێت دەنووسێت. بۆیە، هەموو نووسینی ئەفلاتون بریتییە لەپاکبوونەوە لەگوناهی کوشتنی باوك، یا لەگەڵ ئەو نووسراوەی ـ graphe کە بڕیاری مەرگی سوقراتی داوە. دەڵێین هەموو تەواوی ئەم نووسینە لەمیانەی مردنی سوقراتەوە بەرهەم دێت، لەنێو ڕەوشی ئیدانەکردنی نووسینەوە لەنێو دیالۆگی فیدرۆس. تێکەڵاوبوون و ئاوێتەبوونی دیمەنەکانیش، زۆر لەبۆشایی دەچێت، ڕۆچوونە بەنێو قووڵایی، دەرمانخانەیەك کە قووڵایی و ژێرەوەی نییەو بێکۆتاییە.

بەڵام باشە پرسی ئەم ئیدانەکردنە چییە؟ تا ئەم چرکەیەش، نووسین ـ گوتاری نووسراو ـ ئەگەر بشێت بگوترێت، تەنیا وەکو یەتیم و باوك کوژێك و ونوێنەرێك و کوڕێك کە لەسەر لێواری مەرگدایە تەماشا دەکرا. ئەگەر لەنێو ڕێڕەوی مێژوویدا گەندەڵ بووبێت، لەئەسڵی خۆی دابڕابێت، هیچ شتێك و

ئاماژەیەکی وامان لەبەردەستدا نییە بیسەلمێنێت ئەم ئەسڵە ناپاك و ڕیسواو خراپ بووە. ئێستاش، ئەگەر زۆر بەڕاشکاوی قسەبکەین، پێدەچێت نووسین، واتا ئەم دەستنووسەی لەنێو پانتایی هەستیدا بەرهەم دێت، هەر لەگەڵ لەدایکبوونییەوە ناتەواوو سەقەت و نەخۆشبوبێت. منداڵێك نەبووبێت بەشێوەیەکی تەندروست لەدایك بووبێت. بۆیە نەوەکو هەر بەتەنیا زەحمەتە بتوانێت بژیێت و ژیانی خۆی تەواو بکات، بەڵکو لەبەرئەوەی بەخۆشی لەدایك نەبووە، بۆیە هەر خۆی منداڵێکی شەرعی نییە ـ gnesios.

لەڕاستیدا ئەم منداڵە نەوەکو هەر بەتەنیا کوڕی کەسێکی هەژارو بێدەسەڵاتە، بەڵکو بیژییەو دۆزراوەتەوەو باوکی نییەو بێ باوکە. ئەم منداڵە ناتوانێت بەناوی دەنگی باوکییەوە قسەبکات، ناتوانێت داوای دانپێدانان بکات، لەدەرەوەی یاسایەو پێشێلکاری کردووە. دوای ڕەزامەندی فیدرۆس، دەبینین سوقرات دەست بەقسە دەکاتەوەو دەڵێت:

*" سوقرات: ئەوە مانای چییە؟ ئایا پێویستە لەسەرمان بیر لەگوتارێکی تر بکەینەوە، برای گوتارەکەی پێشووتربێت ـ گوتاری نووسراو ــ هەروەها شەرعیش بێت ـ adelphon gnesion، بەو ڕەوشەی تێیدا بەرهەم دێت و بەو ڕادەیەی کە دەتوانێت ئەویتر ببەزێنێت.*

*فیدرۆس: ئەوە چ گوتارێکە کە تۆ باسی دەکەیت و، لەڕوانگەی تۆوە دەبێت چ مەرجێکی تێدابێت؟*

*سوقرات: ئەو گوتارەیە کە هاوشانی مەعریفەیەو ڕوحی ئەم کەسەی کە فێری دەبێت، خۆی تێکەڵاوی دەکات ــ met epistemes*

graphetai en te tou manthanontos، ئـەوەی دەتوانێـت بـەرگری لـەخۆی بکـات ــ dunatos men amunai eauto، لەلایەکی تریشەوە، دەزانێت قسە بکات و بێدەنگ بێت لەبەردەم ئەوانەی کە دەبێت لەبەردەمیاندا بئاخفێت، یا بێدەنگ بێت.

فیدرۆس: مەبەسـتت گوتـاری ئەوەیـە کـە دەزانێـت ــ tou eidotos logon گوتاری زینـدوو ــ zonta kai empsuchon کـە دەشـێت بەتەواوی دادپەروەرییەوە بڵێین ئەم گوتارە نووسراوە هاوشێوەو لێکچووی نییە ـ eidolon؟

سوقرات: بەڵێ، هەرگیز".

بێگومان ئەم وەڵامە، لەلایەنی ماناو ناوەڕۆکـەوە، هـیچ ڕەسـەنایەتییەکی تێـدا نییـە، چـونکە ئەلسیداماسـیش هـەمان شـتی دەگـوت. بـەڵام ئامـاژەیەکـە لەسـەر وەرگەڕان و گۆڕانی کاری ئاخـافتن و بەڵگەسـازی. کاتێـك دێـت نووسـین وەکـو زڕ برایەك پێشکەش دەکات، برایەکی خائین و بێ وەفا، برایەك کـە وەکـو هاوشـێوەو لێکچـوو باسـی لێـوە دەکرێـت. دیـارە لێـرەدا بـۆ یەکـەمجارە سـوقرات پـەلکێش دەکرێت بیر لەم زڕ برایە بکاتەوە، زڕ برای شەرعی، وەکو جۆرێکی تـر لەنووسـین، نەك هـەر تـەنیا وەکـو گوتـارێکی عاریفانـە، زینـدوو، خـاوەن ترپـە، بـەڵکو وەکـو نەخشێکی ڕاستەقینە لەنێو ڕوحدا.

بیگومـان زۆرجـار ئێمـە وا هەسـت دەکـەین لەبـەردەم خوازەیەکداین، ڕەنگـە ئەفلاتونیش ـ ئینجا بۆ نا؟ باشە ئەوە چ بایەخێکی هەیە؟ ـ کاتێك خۆی بـۆ ئـەم چرکەساتە ئامادە کردووە، بەڵکو پێش ئەوەش کە دەست بەمێژووی "خـوازە"ش

بکـات وەکـو (هێـل، مـۆر، نیشـانەیەك، .... تـاد، لـەنێو مـۆمی مێشـك و ڕوحـدا)، دەڵێین مێـژووی "خـوازە" کـە فەلسـەفە ناتوانێـت دەسـبەرداری بێـت هەرچـەندە ڕادەی چارەسـەرکردنی ڕەخنەییانـەی زۆر زۆر لاوازو کەمـە. بـەڵام ئـەوەی لێـرەدا جێگـای سـەرنجە، بریتییـە لـەوەی ئـەم ئاخافتنـە ڕاسـتەوخۆیەی بانگەشـەی بـۆ دەکرێت، لەناکاو لەمیانەی خوازەیەکی خوازراو لەسیستەمێك وەسف دەکرێت، کە ویسـتراوە دوور بخرێتـەوەو بـەلاوە بنرێـت، سیسـتەمی هاوشـێوەیی و لێکچـوون. خوازەیـەك وەکـو پێویسـت تەماشـا کـراوە لەبەرئـەوەی هـاتووە ئـەم شـتانەی بەیەکەوە بەسـتاوەتەوە کـە لـەڕووی بونیادییـەوە مـاقووڵن و لەچـەند کۆپییەکدا دووبارەی کردوونەتەوە، هەر زمانێك وەسـفی دیالیکتیـك بکـات، هـەرگیز ناتوانێـت دەسبەرداری ئەم خوازەیە بێت.

بەپێی وێنەیەك کە کۆنترۆڵی هەموو فەلسەفەی خۆرئاوایی دەکات، نووسینێکی باش (سروشتی، زیندوو، عاریف، ماقووڵ، جەوانی، قسـەکەر)، دەخرێتـە بەرانبـەر نووسـینێکی خـراپ (دروسـتکراو، مـردوو، نـەزان، هەسـتناك، لاڵ و بـەڕانی).[1] دەستنیشانی نووسینی باش ناکرێت تەنیا لەمیانەی خوازەیەکی خراپـەوە نـەبێت. نووسینی خراپ بەپێوانە لەگەڵ نووسینی باش، وەکو نموونەی دەستنیشـانکردنی زمانـەوانی و نیمچـە جەوهەرێکـە. ئەگـەر تەماشـای بونیـادی مێـژووی میتافیزیکـا

---

[1] لەنێو بەشی یەکەمی کتێبی (لەبارەی گراماتۆلۆژیاوە) کە بەناوی (کۆتایی کتێبو سەرەتای نووسین) ە، دریدا دێت کۆمەڵێك نموونە لەبارەی ئەم جیاکارییەی نێوان هـەردوو نووسـین دەخاتـە ڕوو، هـەموو ئـەم نموونانەشـی لـەکولتووری عیـبری و مەسـیحی و هـزری نـوێی ئەورووپی وەگرتووە.

بکەین، دەبینین بەردەوام تۆڕێك لەدوالیزم کە ئاڕاستەی دوالیزمی تری دەکات، بەڕێوەی دەبات. هەموو ئەم کارانە وای کردووە فەلسەفە بچێتە نێو گەمەیەك کە بریتییە لەجیاکاری نێوان نووسین و ئاخافتن.

لەکۆتایی دیالۆگی فیدرۆسیشدا، لەوە دڵنیا دەبینەوە ئەم پرۆسەو دیالۆگە، ئەوەندەی سەپاندنی نووسینێکە بەسەر یەکێکی تر، ئەوەندە ئیدانەکردنی نووسین نییە بەناوی ئاخافتنی ئێستاو ئامادە. ئەوە سەپاندنی جێکەوتێکی بەپیت و بەرەکەتە بەسەر جێکەوتێکی نەزۆك، تۆیەکی بەرهەمدار ــ چونکە لەناوەوەدا هەڵگیراوە ــ بەسەر تۆیەکی بێ بەرهەم کە لەدەرەوەڕا دانراوەو خراوەتە بەر ڕەشەباو لەسەر لێواری پەرت و بڵاوبوونەوەدایە ــــ dissemination.[1] بۆیە ئەوەی ڕوو دەدات کۆمەڵێك پرۆسەیە، ئەمەیان ئاڕاستەی ئەویترمان دەکات، ئینجا پێش ئەوەی بەدوای هۆکارو بزوێنەری بونیادی هێماکاندا برۆین لەلای ئەفلاتون، با بەدوای ئەم پرۆسەیەدا بچین.

هاتنی فارماکۆن بۆ نێو ئەم دیمەنەو، گەشەکردنی توانا سیحرییەکانی بە بەراورد بەوێنەکێشان و، توندوتیژی و، لادانی سیاسی و خێزانی، ئامارەکردن بۆ جۆرەها سەوزایی و ماسك و هاوشێوەیی، هەموو ئەمانە هەر دەبووایە بەرەو

---

[1] ئەم زاراوەیەی دریدا لێرە بەکاری دێنێت، بەمانای بڵاوکردنەوەو پەرتکردنی شتێك بەکاردێت، واتا فڕێدان و پەرتکردنی و بەفیڕۆدانی. ئەم پرۆسەی دریدا ئامارەی بۆ دەکات، لایەنی پۆزەتیڤیشی هەیە، چونکە کاتێك جوتیار تۆی دانەوێڵە فڕێدەدات و پەرت دەکات، لەگەڵ ئەم پرۆسەیەدا هەندێکجار بەرهەمی پۆزەتیڤی لێ دەکەوێتەوە. ئەوەش هەمان حاڵەتی نووسینە، ئالێرەوەیە کە نووسین دەبێتە هەڕەشە، چونکە کاتێك فڕێدەدرێت و پەرت دەکرێت، دەگەڕێتەوە.

گەمەمان ببەن، گەمەو جەژن، کە هەرگیز بەبێ هاتن و ڕژانی سپێرم بوونیان نەدەبوو. ئەم کارەش دوا ناکەوێت، هەر کات قبووڵمانکرد دەقێکی دیاریکراو پارچە پارچە بکرێت، چیتریش وەکو سوقرات تەماشای زاراوەکان نەکەین گوایە توخمی ڕەوانبێژی تێپەڕن، ئەوە دێتە بوون.

هاوشێوەیی ـ لێکچوون: پێوەندی نێوان نووسین ـ هاوشێوەو نموونەکەی کە بریتییە لەنووسینی ڕاستەقینە. نووسینی ڕاستەقینە، چونکە ڕاستەقینەیە، ڕەسەنە، لەگەڵ بەهاکەی خۆی گونجاوە، لەگەڵ جەوهەرەکەی گونجاوە، نووسینێکی حەقیقی لەنێو ڕوحی ئەم کەسانەدا کە مەعریفەیان هەیە.

ئەم پێوەندییە هاوشێوەی پێوەندی نێوان تۆیەکانە ـ semsnce،[1] تۆی بەهێزو بەپیت کە بەرهەم و بەروبوومی پێویست بەرهەم دێنێت، تامی خۆش و عومری درێژ ـ تۆی بەردار. تۆی لاوازو نەخۆش زوو لەناو دەچن، ئەنجامی بەرهەم و بەروبوومی لابەلان. لێرەدا دوو لا هەن، لەلایەك باخەوانی هێمن و زیرەك و بەتوانا ـ O noun ekon georgos، لەلایەکەی تریش باخەوانی تەمبەڵ کە بۆ خۆشی خۆی باخەوانی دەکات و بەپەلەیەو یاریزانە یاری دەکات. لەلایەك جددییەت هەیە، لەلایەکەی تریش یاری و گەمەکردن و جەژن. لەلایەك کولتوورو کشتوکاڵ و زانست، لەلایەکەی تریش هونەرو چێژو پارە سەرفکردنی بێ حیساب.

---

[1]) ئەم زاراوەیە بەزمانی یۆنانی دەبێتە semens، واتا تۆی ڕووەك و بەروو بووم، لەهەمان کاتیشدا بەمانای تۆی پیاو ـ سپێرم ـ یش بەکاردێت، واتا هەم مانا ڕووەکییەکەی هەیە، هەمیش مانا ڕەگەزی و سێکسییەکە. وەکو ئەوەی خوێنەریش تێبینی دەکات، لەنێو دەقەکەشدا بۆ ئەوە دانراوە تاوەکو هەردوو مانا بگەیەنێت.

" سوقرات: ئێستا پێم بڵێ، باخەوانی زیرەك کاتێك کۆمەڵێك تۆی هەیە لەلای گرنگن و بایەخیان پێدەدات ــ on permaton kedoito و دەیەوێت بیانبینێت بەروبوومیان گرتووە، بەهەموو جددییەتی خۆی لەگەرمای هاویندا دەچێت ئەم تۆیانە لەباخچەی ئەدۆنیس[1] فرێیدات و پەرتیان بکات تاوەکو چێژ لەجوانی باخچەکانی خۆی وەربگرێت کە لەماوەی هەشت رۆژدا پێدەگەن؟ یا ئەم کارە دەکات بۆ ئەوەی کات بەسەر ببات و گەمە ــ paidias بکات، یا لەپێناو جەژندا ــ eortes ئەم کارە دەکات، بەو گریمانەی کە وا دەکات؟ یا ئەگەر هەندێك تۆ هەن بەلای ئەمەوە گرنگن، ئەوە هەموو هونەرو مەعریفەی کشتوکاڵی خۆی دەخاتە گەڕ تاوەکو لەخاکێکی باش و بەکەڵك پەرتیان بکات و فرێیان بدات، ئەو کاتەش دیارە کە بێگومان زۆر دڵخۆش دەبێت، ئەگەر ببینێت لەماوەی هەشت مانگدا سەوز بوون و ڕوواون. ئەم مرۆڤەی خاوەنی زانستی دادپەروەری و جوانی و خێربووبێت، پێت وایە لەبارەی تۆو کشتوکاڵەوە کەمتر لەم باخەوانە زیرەکترە؟ بەم شێوەیە لەگەڵ من تێبینی دەکەیت کەس بەلاش ناچێت لەسەر ئاو بنووسێت ــ en udati grapsei بەیارمەتی حیبرو قەلەم تاوەکو بچێت گوتارەکان پەرت و بڵاوبکاتەوە ــ

---

[1] ) ڕۆبین باسی ئەوە دەکات کە لەجەژنی ئەدۆنیسدا، لەدرەوەی کاتی چاندن و ڕوواندن، هەر بەرێکەوت سەبەتەیەك دادەنراو تۆی کۆمەڵێك ڕووەکی تێدا بڵاودەکرایەوە، ئەم ڕووەکانە بەماوەی چەند ڕۆژێك سەوز دەبوون و هەر ئاوا زووش دەمردن و سیس دەبوون. ئەوەش دەلالەتی لەنزیکبوونەوەی مەرگی ئەفرۆدێت دەکرد.

***melani speiron dia kalamou meta logon*، شتێک کە نەوەکو هەر بەتەنیا ناتوانێت لەمیانەی ئاخافتنەوە بەمانای خۆی بکەوێت، بەڵکو ناتوانێت حەقیقەتیش فێر بکات بەشێوەیەکی باش".**

سپێرم، ئاو، حیبر، بۆیە، سەوزایی بۆندار: فارماکۆن بەردەوام وەکو شلەیەك ڕۆدەچێتە نێو شتەکان، دەخورێتەوە، قووت دەدرێت، خۆی دەدزێتە ناوەوەو نقووم دەبێت تێیدا، وەکو چارەسەرێك، دەرمانێك، ژەهرێك.

لەنێو شلەمەنیدا، دژەکان ئاسانتر تێکەڵاوی یەکتری دەبن. شلەمەنی بۆ فارماکۆن نێوەندێکە، نێوەندێکی باشە. ئاویش کە پاکترین شلەمەنییە، ئاسانترو مەترسیدارتر ڕێگا بەفارماکۆن دەدات بۆ ئەوەی تێکەڵاوی بێت و، هەر زوو ڕاستەوخۆ لەگەڵی دەگونجێت، ڕێگای پێدەدات ڕۆبچێتە ناوی، ئینجا تێکی دەدات. لێرەدا دەبووایە بۆ کۆمەڵگەی کشتوکاڵی یاسا هەبێت بەتووندی ئاو بپارێزێت، ئاو لەفارماکۆن بپارێزێت:

***" لەنێو هەموو توخمەکانی بێستاندا، بێگومان ئاو لەهەموان زیاتر دەخوورێت، بەڵام لەهەموشیان ئاسانتر تێکدەچێت و پیس دەبێت. نە خۆڵ و، نەخۆرو، نەهەوا، کە دەبنە هۆی ئەوەی وزە بەڕووەکەکان بدەن، بەئاسانی تێکناچن و نافەوتێن لەمیانەی عەقاقیرەوە ـــــ pharmakeusesin، یا لەمیانەی گۆڕینی ڕێڕەو، یا تەنانەت لەمیانەی دزینیشدا. کەچی ئاو، بەسروشتی خۆی دووچاری هەموو ئەم مەترسیانە دێت، بۆیە پێویستی بەیاسا هەیە تاوەکو بیپارێزێت. یاساکەش بەم شێوەیە دەبێت: هەر کەسێك بەئەنقەست، سەرچاوەی ئاوو، یا عەمبارو***

*كۆگــای ئــاوی کەســێکی تــری تێکــدا، یــا دەرمــانی تێکــرد ــــ pharmakeiais، یا ڕێگای لێگرت لەمیانە هـەڵکۆڵین، یا دزی لێکـرد، ئـەوە ئـەم کەسـەی زیـانی پێگەیشـتووە دەتوانێـت ڕاییکێشـێتە دادگـاو بەڕادەی ئەم زیانەی پێیگەیشتووە، قەرەبوو وەربگرێتەوە. هەر کەسێکیش ئەم زیانانەی گەیاندبێت لەمیانەی عەقارەوە ـ pharmakeiais، ئەوە جگە لەدانەوەی زیانەکە، دەبێت سەرچاوەی ئاوەکەو عەمبارەکەش پـاك بکاتــەوە، بــەپێی ئــەم یاســایانەی لەلایــەن یاســادانەرانەوە دانــراون، بەڕەچاوکردنی ڕەوشی گشتی و کەسەکان". (دیالۆگی یاساکان)*

کەواتــە، نووســین و ئاخــافتن جۆرێــك لەجێکــەوتن، دوو بــەهای جێکــەوتن ــــ trace، یەکێکیان کە نووسینە، جێکـەوتێکی ونبـووە، تۆیەکـە هیـوای ژیانـەوەی پێنەدراوە، هەر ڕادەیـەك لەسـپێرم کـە فڕێدەدرێتـە دەرەوە بـەبێ ئـەوەی بچێتە شوێنی خۆی، هێزێکی ونبووە لەدەرەوەی بازنەی ژیـان، ناتوانێـت بـەری هـەبێت، ناتوانێت خۆی زیندوو ڕابگرێت و هەڵبستێتەوە. بەپێچـەوانەی ئەمـەش، ئاخـافتنی ڕاستەوخۆ وا دەکات سەرمایە بەری هەبێت، ئەم سەرمایەیە هێـزی فڕێـدانی خـۆی بەرەو چێژێکی لابـەلا نابـات، چـێژێکی بـێ بـاوك، بـەڵکو دەچـێتە ژێربـاری یاسـاو ملکەچی یاسا دەبێت. هێشتا لەنێو ئەم هێزەدا یەکێتی لۆگۆس و نـامووس بـوونی هەیە. بەڵام چ نامووس و چ یاسایەك؟ ئەسینایی بەم شێوەیە وەڵام دەداتەوە:

*" ئەوەیە کە من باسم کرد، کاتێك قسەم دەکرد لەبارەی ئەم ڕێوشوێنانەی پێشـنیارکراون بـۆ سـەپاندنی ئـەم یاسـایە، بـەوەی کـە دەبێـت ملکەچـی سروشت بین لەپێناو پێکەوەبوون بەمەبەسـتی منـداڵ بـوون، نابێـت هـیچ*

*کەسێك ئەندامی نێرینە ئازار بدات، نابێت بەئەنقەست ڕەگەزی مرۆڤایەتی لەناو ببرێت، نابێت هیچ کەسێك تۆ فرێبداتە نێو بەردو شاخ بەجۆرێك جارێکی تر سەوز نەبێتەوەو نەتوانێت سروشت بەرهەم بێنێتەوە، ئینجا لەکۆتاییدا، لەنێو باخی ژندا، نابێت بەئەنقەست خۆی دووربگرێت و نەهێڵێت بەویستی خۆی پیتاندن ڕووبدات. ئەگەر ئەم یاسایە بەردەوام بێت و هێزی هەبێت، هەمان هێزی هەبێت کە ئێستا یاسای قەدەغەکردنی پێوەندی نێوان باوك و کوڕ هەیەتی، ئەگەر وەکو یاساکانی تری لێ بێت، ئەوە هەزاران جار سوودبەخشت دەبێت. یەکەم لایەنی باشەی ئەم یاسایە، بریتییە لەوەی هاوشێوەو گونجاوە لەگەڵ سروشت، بۆیە دەتوانێت پیاو دووربخاتەوە لەم مەستییە ئێرۆسییە، لەم شێتییەو هەموو جۆرە خیانەتێکی هاوسەرێتی، هەموو ئەم زێدە خواردن و خواردنەوەیە، پاڵیان پێوە دەنێت ژنەکانی خۆیان خۆشبووێت. لەکۆتاییشدا، سوودی زۆری هەیە هەرکات توانیمان سەروەری ئەم یاسایە بسەپێنین. بەڵام، ڕەنگە پیاوێکی بەهێزمان لێ پەیدابێت، خاوەنی تۆ ـــ سپێرمێکی زۆر بێت ـــ pollou spermatos mestos بێتە سەرمان کاتێك گوێبیستی دانانی ئەم یاسایە دەبێت، سووکایەتیمان پێبکات و جوێنمان پێبدات و بەدانانی یاسای گەمژانە وەسفمان بکات کە جێبەجێ ناکرێن، بەدەنگ و قێڕە قیڕەکەی هەموو شتێك بزر بکات و دابپۆشێت ....." . (دیالۆگی یاساکان)*

لێرەدا دەشێت نووسینێك بانگ بکەین کە ناوی ئەفلاتونە، ئەو پیاوەی حەزی لەکوڕان بوو و، پێوەندییەکی ئالۆزیشی هەبوو لەگەڵ باوکی زیادە (بۆ ئەوەی

لەمردن ڕزگاری بکات، یاسای پێشێلکرد). (مردنی باوکی دووبارە کردەوە).[1] ئەم دوو بژاڤە یەکتری دەسڕنەوەو ئیلغا دەکەنەوەو دژکاری یەکترین. ئیجا پرسەکە پێوەندی هەبێت بەنووسین، یا بەپێشێلکردنی یاسایەك کە هەر پیشتر ملکەچی پێشێلکردنە. ئەوەی دواتر خۆی قبوولکراو نییە، نە بەتەنیا لەنێو لۆژیکی کلاسیکیدا، بەڵکو لەنێو لۆژیکی زیادە، یا فارماکۆنیشدا هەر قبوولکراو نییە. ئەو فارماکۆنەی دەشێت لەیەك کاتدا، هەم خزمەتی تۆی ژیان بکات، هەمیش خزمەتی تۆی مەرگ و لەباربردن. سوقرات خۆیشی ئەوەی باش دەزانی:

***" سوقرات، ئەی ئەوە ڕاست نییە کە مامانەکان مێشتا بەهۆی دەرمان ــ pharmakia و جادووەکانیان دەتوانن ئێش و ئازارەکان کەم بکەنەوە، یا زیاتری بکەن. هەروەها دەتوانن منداڵبوون وا لێبکەن ئاسانتربێت، یا وا بکەن منداڵەکە لەبار بچێت و بەربوومەکە مێشتا پێنەگەیشتبێت، هەر کات ئەوەیان پێباشبوو؟" . (دیالۆگی تیماوس)***

لێرەدا دیمەنەکە ئاڵۆزتر دەبێت: لەمیانەی ئیدانەکردنی نووسین وەکو کوڕێکی بیژی و بکوژی باوك، ئەفلاتون دێت خۆی وەکو کوڕێك ڕەفتار دەکات کە ئەم جۆرە ئیدانەیە دەنووسێتەوە، بەوەش لەیەك کاتدا، هەم مەرگی سوقرات دوا دەخات، هەمیش جەختی لەسەر دەکاتەوە. بەڵام لەم دیمەنەی کە تێیدا جەختمانکردە سەر نا ئامادەگی دایك، بەلایەنی کەم لەڕوخساردا، ئەوە سوقرات نابێتە باوك، بەڵکو تەنیا دەبێتە نوێنەری باوك. ئەم منداڵەکەی کە لەدایکبووە،

---

[1] ) ئەم دوو ڕستەیەی نێو ئەم دوو کەوانەیە قسەی ئەفلاتونن لەبارەی باوك. (وەرگێڕی کوردی)

کوڕی ئەم مامانە، ئەم ژنەی بۆتە نێوەندێك بۆ بوونی ئەم منداڵە، ئەم دەلالە، باوك نییە، ئەگەرچی شوێنگەی باوکیش داگیر بکات، کوڕیش نییە ئەگەرچی هاوڕێی هەموو کوڕەکانەو براشیانە، ئەو کەسەیە کە گوێڕایەڵی دەنگی باوکانەی خوایە.

سوقرات بریتییە لەم پێوەندییە زیادەیەی نێوان باوك و کوڕ، کاتێکیش ئێمە دەڵێین ئەفلاتون لەمیانەی مەرگی باوکەوە دەنووسێت، ئەوە ئێمە هەر بەتەنیا بیر لەم ڕووداوە ـ مەرگی سوقرات ـ ناکەینەوە، کە دەڵێت گوایە ئەفلاتون ئامادەی نەبووە (پێم وایە ئەفلاتون نەخۆشبوو) (دیالۆگی فیدۆن). بەڵکو دێین یەکەمجار، بیر لەبێ خێری و بێ پیتی تۆی سوقراتی دەکەینەوە ـ سوقرات نەزۆك بووەو منداڵی نەبووە. سوقرات دەزانێت ئەم هەرگیز نە دەبێتە کوڕو، نە دەبێتە باوك و، نەدەبێتە دایك. ڕەنگە هونەری دەلالی هەر خۆی هونەری مامانیش بێت ـ کارکرن لەسەر بەروبوومی سەر زەوی و چارەسەکردنیان و ڕنینیان و، مەعریفە بەوەی کە پێویستە لەچ خاك و خۆڵێکدا چ شتڵێك و چ تۆیە بڕوێنین ـ ئەگەر سۆزانیکردن و پێشێلکردنی یاسا لەیەکیان جیانەکاتەوە.

مادام هونەری سوقرات هێشتا بالادەستە بەسەر هونەری دەلالی ـ مامانی ـ بێگومان لەبەرئەوەیە دەبووایە بتوانێت بەروبوومی ڕوخساری و ساختە ـ eidolon kai pseudos، لەبەروبوومی زیندوو و ڕاستەقینە ـ gonimon te kai alethes لەیەکتری جیا بکاتەوە. بەلام، سوقرات لەلایەنی بنچینەییەوە چارەنووسی مامانەکان دابەش دەکات: نەزۆکی.

*"منیش هەمان نەزۆکی مامانەکانم هەیە ... بەرهەمهێنانی خەڵکی تر شتێکە خوا بەسەریدا سەپاندووم، لەتوانای منداڵبوونیش بێبەشی کردووم".*

با پێکەوە بیر لەئاڵۆزی سوقراتی بکەینەوە، ئاڵۆزییەك لەیەك کاتدا، هەم دڵەڕاوکێ دەهێنێت و هەمیش دڵنیایی:

*" بەهەرحاڵ، هونەرەکەم توانای وروژاندن و هێمن کردنەوەی ئەم ئێش و ئازارانەی هەیە". (دیالۆگی تیماوس)*

کەواتە پێویستە تۆ ملکەچی لۆگۆس بێت، بەوەش توندوتیژی بەسەر خۆیدا مومارەسەر دەکات، چونکە خولیای سروشتی تۆ — سپێرم وای لێ دەکات دژکار بێتەوە لەگەڵ یاسای لۆگۆس:

*" ئەم شتەی کە لەنێو گوتارەکانی ڕابردووماندا ناومان نابوو تۆ ـ سپێرم، ڕوحی هەیەو هەناسە دەدات. ئەم بۆرییەش کە هەناسەی پێ وەردەگرێت، پاڵی پێوەدەنێت بەرەو دەرەوە. بەم شێوەیە خۆشەویستی منداڵبوون بەرهەم دێت. ئالێرەوە هەموو ئەوانەی پێوەندییان بەماددەی بەشە عەیبدارەکانی نێو نێر هەیە، کەمژەو، بالادەستن، وەکو بوونەوەرێکی زیندوو کە بەسەر عەقڵدا هەڵدەگەڕێتەوە ــ tou logou، هەندێك کات بەپاڵنەری ئارەزووە سەرشێتەکانی هەوڵدەدات هەموو شتێك کۆنتڕۆڵ بکات". (دیالۆگی تیماوس)*

با وریابین! لەکاتێکدا ئەفلاتون دێت وا پیشاندەدات کە لەپلەو پایەی نووسین بەرز دەکاتەوە، دێت ئاخافتنی ڕاستەوخۆ وەکو جۆرێك لەنووسینی دەروونی —

لەنێو دەروون ـ پیشاندەدات، بەوەش ئەم برازاقە لەنێو ئیشكالییەتی حەقیقەتدا دێڵێتەوە. نووسین لەنێو دەروون ـ en te pseuche، نووسینی ڕێبازێك یا یاسایەك نییە، بەڵكو نووسینی فێركردنە، گواستنەوەیە، سەلماندنە، لەباشترین حاڵەتیشدا، نووسینێكە پەردە لەسەر حەقیقەتی بەرجەستەبوو ـ aletheia لادەدات. سیستەمەكەی هەمان سیستەمی هونەری فێربوون، یا بەرهەمهێنانی سوقراتییە. لەهەموو حاڵەتێكیشدا، سیستەمی ڕوونكارییە. سیستەمی دیالیكتیكە، ئەم نووسینە پێویستە لەسەری بتوانێت لەنێو دیالۆگی ڕاستەوخۆدا خۆی بسەلمێنێت، بەتایبەتیش بتوانێت حەقیقەتمان فێر بكات، وەكو ئەوەی پێشتر بۆی دامەزراوەو، لێشی دێت ئەم كارە بكات.

ئەم دەسەڵاتە بۆ حەقیقەت و دیالیكتیك و جددییەت و ئامادەگی، لەكۆتاییی ئەم برازاقە جوانەدا لەگەڵ خۆیدا دژكار نایەتەوە، كاتێك ئەفلاتون دێت بەشێوەیەك لەشێوەكان دەست بەسەر نووسیندا دەگرێت. دەڵێین لەگەڵ ئەم برازاقەدا، پاڵ بەگاڵتەو جددییەتەوە دەنێت بێن گەمەیەكی دیاریكراو بەرهەم بێنن. بە بەراورد لەگەڵ گەمەكانی تر، نووسین هەر یەكەم یاریزان و یادخستنەوەیە، نووسینێك لەجۆری دووەم، بەهایەكی باڵاتر، هەر دەبێت ئەمیش یەكەمجار تێپەڕبێت پێش براكانی تری، چونكە لەنێو خێزاندا لەئەم خراپتر زۆرن. بەم شێوەیە هەندێكجار پیاوی دیالیكتیك دەنووسێت و جێكەوتەكانیش، یا مۆنۆمێنتەكان ـــ hypomnemata بەسەریەكدا كەڵەكە دەكات. كاتێك ئەم كارەش دەكات، ئەوە دێت مۆنۆمێنتەكان دەخاتە خزمەتی دیالیكتیك تاوەكو جێكەوتێك ـــ ichnos جێبێڵێت بۆ ئەم كەسەی دەیەوێت لەسەر ڕێگایەكی ڕاستدا بەدوایدا

بڕوات و بیدۆزێتەوە. لەبری ئەوەی خەتی سنوور بەنێوان ئامادەگی و جێکەوتـدا تێپەڕ بێت، ئەوە ئێستا بەنێوان جێکەوتی دیالیکتیکی و جێکەوتی نا دیالیکتیکی، بەنێوان گەمە بەمانای "باش" و گەمە بە"مانای خراپی" وشەکەدا، تێپەڕ دەبێت.

*" سوقرات: ئەم جنۆکانەی لەسەر شێوەی پیتی نووسیندا، بەبایان دەدات، یا بەپێچەوانەوە، ڕەنگە بچێت بۆ خۆشی بنووسێت ـ paidias karin، بـەلام کاتێـك دەنووسـێت، ئـەوە سـامانێك لەبیرخسـتنەوە ـــ hypomnemata بۆ خۆی دروست دەکات، لەحاڵەتێکدا ئەگەر پیربێت و بیری بچێتەوە، هەموو کەسێك بۆی هەیە بەدوای هەمان ڕێگادا بڕوات ـــ tauton ikhnos. خۆشـی زۆریـش لـەبینینی ئـەم ڕووەکـە چێنراوە ناسکانە دەبینێت کە سەوز بوون. خەڵکانێکی تر پەنا بۆ کات بەسەربردنی تر دەبەن و خۆیان پڕ دەکەن لەشەراب و هەموو ئەم خۆشییانەی هاوشانی ئەوەن، لەکاتێکدا ئەم ـ بەڵێ، ئەوە گریمانەیە ـ ئەوەی کە من باسی لێوە دەکەم، دەبێتە کاتی خۆشی ژیانی.*

*فیدرۆس: باشە سوقرات، بەپێوانە لەگەڵ ئاستنزمی خەڵکانیتر لەم شێوە ڕابواردن و کات بەسەر بردنەی باست کرد، چەندە گرنگە مرۆڤ بتوانێت کات بەسەر بردن و خۆشی خۆی تەرخان بکات بۆ دانانی کاری ئەدەبی ـ en logois، خەیاڵ بکات لەبارەی گوتاری جوان لەبارەی دادپەروەری، وەکو ئەوەی لەبارەی ئەم بابەتانەی کە تۆ باست کردن!*

*سوقرات: ئازیزم فیدرۆس، مەسەلەکە هەر وایە. بەلام پێم وایـە توانایـەکی زیـاتر لـەجوانی هەیـە لەسـەر فـۆرمێکی دیـاریکراو ئەگـەر مـرۆڤ بتوانێـت*

بەجددی ـ spoude ئەم مەبەستە وەر بگرێت: ئەویش کاتێك مرۆڤ دێت لەمیانەی بەکارهێنانی هونەری دیالیکتیکەوە، کاتێك دەروون بۆ ئەم کارە ماڵی دەکرێت و ئامادە دەبێت، دەڵێم دێت گوتارێك دەچێنێت کە مەعریفەدار بن ـ phuteue te kai speire met epistemes logous، گوتارێکی وا بتوانێت فریابکەوێت و یارمەتی پێشکەشبکات ـ boethein بۆ خۆی و ئەم کەسەی چاندوویەتی، لەبری ئەوەی نەزۆك بێت، ئەوە لەنێو خۆیدا تۆیەك هەڵدەگرێت کە سەوز دەبێت و گەشە دەکات لەنێو شتی تردا ـ en allois ethesi، لەنێو گوتاری تردا، گوتارێك هەمیشە دەتوانێت ـ بەبێ ئەوەی بکرێت لەناو بچێت ـ ئەم جێکەوتە بۆ خۆی بەدەست بێنێت و، بۆ ئەو کەسەی خاوەنییەتی، زۆرترین خۆشی و شادی پێدەدات، ئەوەش شتێکە هەموو کەسێك بەدەستی ناهێنێت".

# بەشی یازدەیەم

## گەمەکردن ـ وازی: لەفارماکۆنەوە بۆ پیت و، لەنابیناییەوە بۆ زیادە.

"شتە جدییەکان خوشکی گەمەکردنن ـ Kai te tes spoudes adelphe paidia"

(نامەی شەشەم)

" ڕاڤەکردنی جیاوازییەکەت لەنێو ئەم لۆگۆسەدایە ـ Logos de ge en e tes ses diaphorotetos ermeneia"

(دیالۆگی تیماوس)

بەبڕوای هەندێك كەس، ئەفلاتون زۆر بەسادەیی ئیدانەی گەمەكردن ـ وازی دەكات، لەنێو هەمان بزاڤیشدا، ئیدانەی هونەری لاساییكردنەوە ـ mimesis دەكات كە هەر خۆی بەشێك و لایەنێكە تێیدا.[1] بەڵام كاتێك پرسەكە پێوەندی هەبێت بەگەمەكردن و دژەكەی، ئەوە لۆژیكێكی سەرنجڕاكێشە. لەكاتێكدا ئەفلاتون دێت بۆ ئەوەی گەمەكردن و هونەر ڕزگار بكات، ئەوە لەهەمان كاتیشدا ونیان دەكات، ئەو كاتەش لۆگۆسەكەی خۆی ـ لۆژیكەكەی ـ ملكەچی ئەم جۆرە ناچارییە دەكات كە ئێمە چیتر ناتوانین ناوی بنێین لۆژیك.[2] ئەفلاتون باسی گەمەكردنێكی پۆزەتیف دەكات، بەشان و باڵیدا هەڵدەدات، بەڵام ئەوە گەمەكردنە بەباشترین مانای وشەكە، ئەگەر بتوانین وا بڵێین بەبێ ئەوەی ئەم جۆرە بەئاگابوونە بسڕینەوە.

باشترین مانای گەمەكردن، ئەم گەمەیەیە كە چاودێری دەكرێت، ئەوەی خراوەتە نێو چوارچێوەی بەربەستەكانی ئەخلاق و سیاسەت. ئەوە گەمەكردنە لەنێو توێژێكدا، توێژێكی پاك و بێگەردو بێ گوناه لەهەموو ئازارێك، توێژی كات بەسەربەر. كات بەسەربردن: بێگومان وەرگێڕانی باوی كات بەسەر بردن لە

---

[1] بۆ ئەم جۆرە ئیدانەكردنە، بگەڕێوە بۆ دیالۆگی كۆمارو دیالۆگی سیاسی و دیالۆگی سۆفیستەكان و دیالۆگی یاساكان و دیالۆگی ...... تاد.

[2] زاراوەی لۆژیك ـ logique لەزاراوەی لۆگۆس ـ logos وەرگیراوە.

paidia بـۆ divertissement، هەرچـەندە خواروخێچـیش بێـت، ئـەوە هـەر لەخزمەتی سەرکوتکردنی ئەفلاتونیانەدایە بۆ گەمەکردن.

هەرگیز ئەم بەرانبەر یەکتردانانە ـ دوالیزمییەتی نێوان جدییەت و گەمەکردن ـ spoude/paidia نابێتە شتێکی سادە، یا ئەوەتا گەمەکردن هەرگیز هیچ شتێك نییە ـ هەر ئەم شانسەشی هەیە، هیچ چالاکی و ئـەنجامێکی لێناکەوێتـەوە، هـیچ گوتارێك نییە شایانی ئەم ناوە بێت، واتا هـەڵگری حەقیقـەت بێـت بەلایـەنی کـەم، لەلایـەنی مانـاوە. ئـەو کاتـە، بریتییـە لـە نـا ــ عـەقڵ alogos و نـا ــ شـوێنگە atopos. یا ئەوەتا دەست بەگەمەکردن بکات بۆ ئـەوەی ببێتـە شـتێك و جۆرێـك لەدیالیکتیك بەئامادەگی خۆی بدات. مانایەك وەربگرێت و لەخزمـەتی جددییـەت و حەقیقەت و ئەنتۆلۆژیادا بێت. تەنیا ئـەم گوتارانـەی لەخزمـەتی بـوونن ــ logoi peri onton، دەتوانن بەجددی وەربگیرێن و تەماشا بکرێن. هەر کات گەمەکردن گەیشتە بوون و زمان، ئەو کاتە ـ وەکو گەمەیەك لەنێو خۆیدا دەسڕێتەوە. وەکـو چـۆن نووسـین دەتوانێـت خـۆی ــ واتـا وەکـو نووسـین ــ لەبـەردەم حەقیقەتـدا بسڕێتەوە. نووسین و گەمەکردن خودێتی خۆیان نییە، مادام نووسین و گەمەکردن جەوهەریان نییە، مادام جیاوازی وەکـو مـەرجێك بـۆ ئامـادەبوونی خۆیـان دێـنن و توانـــای هاوشـــێوەیی و کـــۆپیکردن و لاســـاییکردنەوە دێـــنن، ئـــەوە هـــەر زوو هەڵدەوەرێن. ناکرێت لێیان دڵنیابین، دڵنیاییەکی کلاسیکی، بـەبێ ئـەوەی نـەفیان نەکەین.

بەم شێوەیە ئەفلاتون گەمە دەکـات ــ خـۆی واپیشـاندەدات ــ وەکـو ئـەوەی گەمەکردنی بەجددی وەرگرتبێت. ئەوەش بوو کە ئێمە ناومان نابوو گەمە ئاسان و

فریودەرەکەی. ئەم نووسینەکانی خۆی وەکو گەمە تەماشا ناکات، بەڵکو پێی وایە نابێت بەگشتی ئیش و کاری مرۆڤیش بەجدی وەربگرین و تەماشایان بکەین. ئەم دەقە ناودارەی نێو دیالۆگی یاساکان دەناسین، لەگەڵ ئەوەشدا، با جارێکی تریش بیخوێنینەوەو بەدوای شاردنەوەی لاهووتیانەی گەمەی گەمەدا بڕۆین، بێلایەنکردنی لەسەرەخۆی گەمەکردن:

*" بەدڵنیاییەوە پێویست ناکات ئیش و کارەکانی مرۆڤ بەجدی وەبگرین ـ megales men spoudes ouk axia، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە ناچارین بەشێوەیەکی جددییانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین، ئەوەش لەبەدختیمانە. بەڵام مادام ئێمە واین، ڕەنگە ئاراستەکردنی ئەم سەرگەرمییەی کە ناتوانین خۆمانی لێ دەرباز بکەین، بەرەو شتێکی دیاریکراو، بەشێوەیەکی ماقووڵ، فرمانێك بێت لێمان بووەشێتەوە ــ emin summetron، مەبەستم ئەوەیە جددی بین بەرانبەر ئەم شتانەی کە جددین، نەوەکو پێچەوانە بین. خوا هەر بەسروشتی خۆی شایانی هەموو سەرگەرمییەکی پیرۆزی ئێمەیە ــ makariou spoudes، لەبەرانبەریشدا، وەکو گوتمان مرۆڤیش هەر بۆ ئەوە دروستکراوە تاوەکو بووکەڵەیەك ــ paignon بێت لەدەستی خوادا، چارەنووسی باش و خێری مرۆڤ لێرەدایە. ئەوەش هەر ئەم ڕۆڵەیە کە مرۆڤ دەبێت بەدرێژایی ژیانی خۆی بیانبینێت. هەموو ژن و پیاوێك جوانترین گەمە بکەن، بەڵام بەمەبەستی تر نەوەکو ئەم مەبەستانەی ئێمڕۆ لەئارادان.*

***بەگشتی، مرۆڤەکان ئیمڕۆ پێیان وایە شتە جددییەکان دەبێت هەوڵی گەمەیان بۆ بدرێت. بەم شێوەیە لەبارەی جەنگ بیر دەکەنەوە، ئەویش کارێکی جددییە و دەبێت لەپێناو ئاشتیدا بەباشی ئەنجام بدرێت. بەڵام هەرگیز جەنگ نەیتوانیوە واقیعی گەمەیەکی ڕەسەن و، پەروەردەیەکمان پێشکەش بکات کە شایانی ئەم ناوە بێت، تەنانەت نەیتوانیوە بەڵێنی ئەوەشمان پێبدات کە دەتوانێت بەدییان بێنێت، ئەم دوو شتەی لەلای ئێمە زۆر زۆر جددین. کەواتە، لەئاشتیدا دەبێت بەباشترین شێوە بژین تا ئەوەندەی دەتوانین، زۆرترین بەشی ژیانمان بۆ ئەوە بێت. باشە ئەی ڕێگای ڕاست لەکوێیە؟ لەوەی وەکو یاریزانێك بژین، یاریزان لەشێوەی پێشکەشکردنی قوربانی و گۆرانی و سەما، ئەو یارییانەی ماوان لێ دەکەن لەیەك کاتدا، هەم بتوانین ڕەزامەندی خواوەندەکان بەدەست بێنین، هەمیش بتوانین بەرپەرچی هێرشی دوژمنەکانمان بدەینەوە تێکیان بشکێنین".***

بەردەوام گەمەکردن لەنێو گەمەکاندا خۆی بشارێتەوە. ئێمە لەشوێنی تریش و سەردەمی تریشدا بەدوای ئەم شاردنەوەیەی گەماندا چووین، سەردەمی ڕۆسۆ.[1]

---

١) لەلای ڕۆسۆ، نووسین تەواوکارو پاشبەندی ئاخافتنە. سەرهەڵدانی نووسین لەلای ڕۆسۆ بەتەمەنی گەلان و شارستانییەتەکانەوە پەیوەست نییە. کاتێکیش قسە لەسەر شێوازەکانی نووسین و سروشتی نووسین دەکات، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە هەرچەند پێداویستییەکان و کارو فرمانەکان ئاڵۆزتر بن، ئەوەندە زمان سروشت و مۆرکی خۆی دەگۆڕێت و زیاتریش بەرەو ماقووڵییەت هەنگاو دەنێت و لەعاتیفە دوور دەکەوێتەوە، بۆیە نووسین لەبری ئەوەی هەست و نەست بخاتە ڕوو، دێت هزرو بۆچوون دەخاتە ڕوو و

ئەم (نـا) یـە بـۆ لـۆژیکی گەمـەو نووسـین، بـووە هـۆی تێگەیشـتن لـەو شـتانەی کەسـانێکی زۆر سەرسـووڕمانی خۆیانیـان بەرانبـەر دەربڕیـوە. باشـە چـی وای لەئەفلاتون کردووە کاتێك نووسین و گەمەکردن بەیەکەوە ئیدانـە دەکـات، دەڵـێین وای لێکردووە ئەم خۆیشی زۆر بنووسێت، مەرگی سوقراتیش بکاتە دەسپێکێك بـۆ ئـەم نووسـینە، نووسـنەکانی خـۆی، گەمـەکانی، ئیدانـەی نووسـین بکـات لـەنێو نووسـیندا، ئـەم سـکاڵایەی لـەدژی نووسـیندا ــ graphe بـەرزی کردۆتـەوە کـە تاوەکو ئیمڕۆش هەر دەنگدانەوەی هەیە؟

باشـە چ یاسـایەك حـوکمی ئـەم دژکارییـە دەکـات؟ ئـەم دژکارییـە خودییـەی قسـەکردن لـــەدژی نووســـین، قســـەیەك هـــەر کاتێـــك نووســـرا لـــەدژی خـــۆی دەوەسـتێتەوە، هــەرکاتێك هاوشـێوەی خـۆی نووسـرایەوەو تایبەتمەندییەکـەی لەئاست ــ دژ دەرکـەوت بەرانبـەر ئـەم ڕەسـیدەی نووسـین؟ ئـەم دژکارییـە هـیچ

دەنووسێتەوە، لەبەرئەوەی خستنە ڕووی دەربڕینی هەست و نەست لەڕێگای ئاخافتنـەوە دەبێت، کەچی خستنە ڕووی هزرو بۆچوون لـەڕێگای نووسـینەوە خـۆی دەردەخـات. ئـەو گۆڕانەی زمان لەلای ڕۆسۆ وا لەزمان دەکات، دیـالۆگ لەگـەڵ دڵـدا نـەکات، بـەڵکو بـەرەو وتووێژ لەگەڵ عەقڵدا هەنگاو دەنێت، چونکە زمانی ئاخافتن، زمانی دیالۆگی دڵـەو، زمـانی نووسینیش، زمانی وتووێژە لەگەڵ عەقڵ. ڕۆسۆ پێ لەسەر ئـەوە دادەگرێـت کـە نووسـین ئەگەرچی وا دەخرێتە ڕوو گوایە کاری ئەوەیە زمان بچەسپێنێت و قایمی بکات، بەڵام هەر خودی نووسینە دەبێتە هـۆی گـۆڕینی زمـان، ئـەم گۆڕینـەی ئـەو قسـەی لەسـەر دەکـات گۆڕینی وشەو دەسـتەواژەو پیتـەکان نییـە، بـەڵکو گـۆڕینی ماناکـانی دەردەبڕینـە. ئێمـە بەشێکی تایبەتمان بۆ ئـەم پرسـە لـەلای ڕۆسـۆ تـەرخانکردووە لەڕوانگـەی جـاك دریـداوە لەنێو کتێبی (جاك دریداو هەڵوەشاندنەوە). (وەرگێڕی کوردی)

شتێکی تر نییە جگە لەپێوەندی ئاخافتن خۆی نەبێت لەگەڵ نووسین، بەوەش دێت ڕاوەدووی خودی خۆی دەنێت لەمیانەی فێلکردن لەخۆیەوە، ئێمەش دەڵێین ئەم دژکارییە هەرگیز کارێکی تێپەڕو خۆڕسك نییە. بۆ ئەوەی بڕوا بەم ڕەوشە بکەین، هەر ئەوەندە بەسە تێبینی بکەین کە چۆن خزێنراوەتە نێو ئەدەبی خۆرئاوا. لەگەڵ ئەفلاتون و دوای ئەمیش، بەلایەنی کەم دووجاری تریش لەلایەن ڕۆسۆو سۆسێر خۆی دووبارە دەکاتەوە.[1] لەم سێ حاڵەتەدا، ئەم سێ سەردەمە

١) ڕۆسۆ لەنێو کتێبی (بنەچەی زمانەکان) دا، لەزیاتر لەشوێنێك ئامارە بۆ ئەو جیاوازییە دەکات کە لەنێوان نووسیندا هەیە. مرۆڤ لەکاتی ئاخافتندا هەست و نەستی خۆی دەردەبڕێت، کەچی لەچرکەساتی نووسیندا هزرو بۆچوونەکانی. لەکاتی نووسیندا ناچارە سەرجەم وشەو زاراوەکان بەمانا گشتییەکانیانەوە بخاتە ڕوو، بەلام لەکاتی ئاخافتندا، لەسایەی گۆڕینی دەربڕینی دەنگەوە، لەمیانەی گۆڕینی ڕیتمی دەربڕینەوە، مانا بەدەلالەت و وشە دەبەخشێت بەو شێوەیەی خودی خۆی گەرەکیەتی مانایان پێبدات. دیارە نووسین ئەو تواناکارییەی تێدا نییە، چونکە نووسین لەلای ڕۆسۆ، واتا مردنی وشەکان و لەدەستدانی زیندەدارییان، مرۆڤ لەچرکەساتی نووسیندا، پیت و وشەکان دەنووسێتەوە نەوەکو نەغمەو ڕیتم و ئاستەکانی دەربڕین، چونکە نەغمەو ڕیتم و ئاستەکانی دەربڕینەکە خۆیان وزە بەدەربڕین دەبەخشن و ئاراستەی ماناکانی دەکەن. ئەم شتانەن وا دەکەن ڕستەیەك لەڕستەیەکی سادەوە بگۆڕێت بۆ ڕستەیەکی خاوەن مانای دەگمەن و دەربڕی بابەتییانە. لەلای ڕۆسۆ هەموو ئەم هەنگاوانەی زاناو هزرڤانان دەیهاوێژن بۆ ئەوەی ئەو جیاوازییە کەمتر بکەنەوە، بەپێچەوانە دەکەوێتەوەو دەبێتە هۆی فراوانترکردنی بواری زمانی نووسین. بۆیە ئامارە بۆ ئەوە دەکات کاتێك مرۆڤ دێت لەسایەی نووسینەوە گوتار بەرهەم دێنێت، ئەوا زیاترو زیاتر ئاخافتن دووچاری گرژبوون دەکات، چونکە ئەگەر مرۆڤ هەموو شتێك وا دەرببڕێت وەکو ئەوەی دەینووسێتەوە، ئەوە تەنیا دەبێتە خوێنەرێك کە قسە دەکات. (وەرگێڕی کوردی)

جیاوازەی دووبارە بوونەوەی ئەفلاتونیزم. ئەم سەردەمانە وامان لێ دەکەن، بەدوای هێل و داوێکی تری نوێدا بڕۆین کە جیاوازە لەنێو مێژووی فەلسەفەو مەعریفەدا. دیارە دەبێت لەشوێنێکدا دوورخستنەوەی نووسین و بەکەم و سووک تەماشاکردنی، گونجاو بووبێت لەگەڵ لێدوان لەبارەیانەوە، دەڵێین گونجاو بووە لەگەڵ:

١) نووسین بەگشتی و لەناوەوەی لەگەڵ:

٢) دژکاری: ئەوە یەکێکە لەگوتە نووسراوەکانی لۆگۆسێنترلیزمی: جەختکردنەوەی هاوکات لەسەر بەڕانییەتی بەڕانی و دزەکردنی بەرەو ناوەوە.

٣) بونیادنانی کارێکی "ئەدەبی" لەلایەن "ئەناگرامات" ی سۆسێر، ئینجا ڕۆسۆ. دەشێت کارەکەی ئەفلاتونیش لەپشت ناوەڕۆکی لۆگۆسێنترالیستی و بەسەربەخۆ لێی بخوێنرێتەوە، ئەم ناوەڕۆکەی چیتر فرمانی تێدا نییە، دەڵێین ئەمیش لەنێو چنینی ئەناگرامیدا دەخوێنرێتەوە.

بەم شێوەیە پێویستبوو لەسەر ئەم زمانەوانییەی هەریەك لەئەفلاتون و ڕۆسۆو سۆسێر ئامادەیان کرد، نووسین بخاتە دەرەوە.[1] لەهەمان کاتیشدا، سەرەڕای

١) دریدا پێی وایە هەریەك لەڕۆسۆو سۆسێر، لەژێر کاریگەری هزری ئەفلاتونی زاڵ بەسەر فەلسەفەی ئەوروپیدا، ئەم کارەیان کردووەو نووسینیان فڕێداوەتە دەرەوە. نووسین لەلای ڕۆسۆ پاشبەندی ئاخافتنە، ئەو پاشبەندییە لەلای ئەو تەنیا لەزمانەوە نییە، بەڵکو لەلای ئەو پەروەردەش پاشبەندی سروشتە، کەواتە پاشبەند واتا یەکەم زانینی نووسین و بەلاوەنانی، ئا لەو خاڵەوە دریدا دێت کار لەسەر پاشبەندەکەی ڕۆسۆ دەکات، چونکە پێی

ئـەوەش فاكتـەری جەوهـەری خـۆی لێ بخوزاێـت، سـەرجەم عـەمباری سـەلمێنەرو تیۆرەكـەی. ویسـتمان ئەمـە لەشـوێنێكی تریشـدا بـۆ هاولاَتیـانی جنـێف[1] ڕوون بكەینەوەو، حالەتەكەش لەگەڵ ئەفلاتون بەهەمان ئەم ڕوونییەیە.

---

وایـە چـەمكی پاشـبەندكردن دوو مانـا لەخۆیـەوە دەگرێـت. پاشـبەندكردن وەكـو ئـەوەی خستمانە ڕوو لەڕووكەشدا ئەوەیە شتێكی نا پێویست بخرێتـە سـەر شـتێكی كامـل، بـەلاَم لەهەمان كاتدا، ئەو خستنە سەرە بۆ تەواوكردنی ئەو شتەیە كە ئێمە پێمان وایـە كامـل و تەواوە، بەهەردوو ماناكـەش پاشـبەندكردن دەبێتـە ڕەگـەزێكی دەرەكـی و نـامۆ، لێـرەدا نووسـین وەكـو شـتێكی نـا پێویسـت و دەرەكـی و نـامۆ، خـۆی دەردەخـات و دەكرێتـە پاشبەندی ئاخافتن كە بۆ خۆی وا خۆی دەردەخات، گوایـە كامـل و تـەواوە، بۆیـە لـەلای دریدا مادامەكی نووسین كراوەتە پاشـبەندو جیـا كراوەتـەوە، ئـەوە مانـای وایـە خـاوەنی سیفات و مۆركی جیاكراوەی تایبەت بەخۆیەتی كە لەئاخافتنی جیا دەكاتەوە.

ئەگەر نووسین لەئاخافتن جیا نەبووایە، ئەوا نەدەكرا بەپاشبەندی، كەواتە ئەوە لەلای دریـدا، دانپێدانانـە بـەو جیاوازییـەی نووسـین لەئاسـت ئاخافتنـدا هەیـەتی، لەبەرئـەوەی یـەكێك لەڕایەڵەكانی ستراتیژییەتی هەڵوەشاندنەوە، چەمكی جیاوازییە، ئەوا دەرفەتی ئەوەی بـۆ ڕەخسـاوە بـەپێی ئـەو ڕایەڵـە بابەتەكـە ڕاڤـە بكـات و لێكبداتـەوە. ئـا لێـرەدا ئـەو دێـت بیرۆكـەی پاشـبەندكردن بـەكار دەهێنـێ بـۆ هەڵوەشـاندنەوەی پرەنسـیبی سەرخسـتن و پێشخستنی ئاخافتن بەسەر نووسین و، مەدلول بەسەر دالـدا، وەكـو ئـەوەی لـەنێو هـزری میتافیزیكی خۆرئاوادا هاتووە. ئەگەر نووسـین دەكرێتـە پاشـبەند، لەبەرئەوەیـە نووسـین ئەم ڕاستییانە هەڵدەگرێت كە نووسین خۆی جیا دەكەنەوە. نووسین بەیەك مەرج دەبێتـە شتێكی لاوەكی و داتاشراو، ئـەویش ئەوەیـە زمـانی ئەسـڵی و سروشـتی (زمـانی یەكـەم) هێشتا دروست نەبووبێ و نووسین بەری نەكەوتبێت و پیسی نەكردبێت، واتـا ئـەو زمانـە خۆی نووسینەو یەكەمین نووسینیشە.

[1]) مەبەستی دریدا لێرە هەریەك لەڕۆسۆو سۆسێرە كە هەردووكیان هاولاَتی جنێف بوون.

ئاشکرایە ئەفلاتون بەردەوام خۆی لەگەڵ پیتی ئەبجەدیدا ڕوونکردۆتەوە، خۆی لەگەڵ ڕوونکردۆتەوە، مانای وایە وا بەکاری دێنێت تاوەکو دیالیکتیك ڕاڤە بکات، نەوەکو پاساو بۆ خۆی بێنێتەوە بەرانبەر بەنووسین کاتێك بەکاری دێنێت. مەبەستەکەی ئەفلاتون لەم کاتەدا، ڕوخسارێکی فێرخوازانە لەخۆ دەگرێت، چونکە ئەم کارەی ئەنجامدا تاوەکو پاڵ بەسەرهەڵدانی یاسای جیاوازییەوە بنێت، یاسای کورت نەکردنەوەی ماناو پێوەندییەکەی.

پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوە کرد زاراوەی مۆر و قاڵب ـ tupos دەشێت بەهەمان ڕادە لەگونجاوی، دەلالەت لەپیتی نووسراو بکەن. لەنێو دیالۆگی کۆماردا، ئەفلاتون بەرلەوەی زاراوەی ـــ tupos بەمانای وێنە و نموونە ـــ eidos بەکاربێنێت، پێویستبوو لەسەری بەردەوام و بۆ ئامانجێك کە بەڕوخسار فێرخوازانەیە، بگەڕێتەوە بۆ نموونەی پیت وەکو نموونەیەك کە پێویست دەکات بزانرێت بەرلەوەی جیابکرێتەوە لەوێنەو کۆپییەکەی لەئاوەژوو بوونەوەی نێو ئاوو، یا بەر ئاوێنەدا:

***" کاتێك فێری خوێندنەوە بووین، پێمان وانەبوو زۆر باشبین، تەنیا ئەم کاتە نەبێت کە توانیمان جیاوازی لەنێوان پیتەکاندا بکەین، ئەم پیتانەی ژمارەیان دیاریکراوە لەنێو هەموو ئەم لێکدراوانەی کە پێکی دەهێنن، بەبێ ئەوەی هیچ یەکێکیان بەلاوە بنێین کە شایانی تۆمارکردن نەبێت. ئەم پانتاییەی داگیری دەکات چەندە بچووك یا گەورە بێت، بەڵام ئێمە پێویستە لەسەرمان لەهەموو حاڵەتەکاندا جیایان بکەینەوە لەیەکتری، چونکە پێمان وابوو ئەمە تاکە شێوازە وامان لێ دەکات ببینە خوێنەرێکی***

*باش. ئەگەر وێنەی پیتەکانیش ـ eikonas grammaton لەنێو ئاوو، یا ئاوێنەدا ئاوەژوو ببوایەوە، ئێمە نەماندەتوانی بیانناسین تا ئەو کاتەی پیتەکان نەناسین، ئەوەش هەر خۆی لەخۆیدا هونەرێکی سەربەخۆیەو پێویستی بەتوێژینەوەیە".*

بێگومان پێشتر دیالۆگی تیماوس ئاگاداری کردبووینەوە کە لەنێو هەمو ئەم حاڵەتانەی بەراورد کردن لەگەڵ نووسین، پێویستە پیتەکان وا تەماشا نەکەین کە هەڵگری مانای حەرفی خۆیانن، چونکە توخمە هەمەکییەکان و پیتەکان ـــ stoikheia tou pantos ڕێگا نادەن وەکو برگە کۆبکرێنەوە. "بگرە ناکرێت بەشێوەیەکی ماقووڵیش بەراورد بکرێن بەم برگانە، ئینجا ڕوانینی ئێمە هەر چۆنێك بێت". لەگەڵ ئەوەشدا، لەنێو دیالۆگی تیماوس تێبینی ئەوە دەکەین کە نەوەکو هەر تەنیا گەمەی ماتماتیکی لەبارەی گونجاوەکان بەرەو لۆگۆس ئاڕاستەمان دەکات، لۆگۆسێك بتوانێت دەسبەرداری دەنگ بێت، چونکە لەمیانەی حیسابکردنی خوادا ـ logismos theou دەتوانێت لەبێدەنگی ژمارەکاندا گوزارشت لەخۆی بکات. بگرە لەوەش زیاتر، خستنەڕووی "ئەویترو تێکەڵاوی" و ئیشکالییەتی هۆکاری "ونبوو" و بابەت ـ جۆری سێیەم کە کورت ناکرێتەوە ـــ لەپاڵ "ئیزدیواجییەتی نموونەکان"، هەموو ئەمانە وا دەخوازێت ئەسڵی جیهان وەکو جێکەوتێك ـ trace دیاری بکرێت، واتا هێڵ و وێنەو ڕەسمی خەیاڵی لەنێو قازانێکدا. قازانێکی لەهیچ شوێنێکدا بوونی نییە و هەرگیز هیچ وێنەیەکی ئامادەگی نییەو لەنێو ئامادەگی هیچ وێنەیەکیشدا نییە.

بەهــەرحاڵ، لێــرەدا دارِشــتنەکان بــەجۆرێك لەشــەرمەوە، پێیــان دەگوترێــت خوازەی ئەفلاتونی نووسراوو قبووڵی توانەوە ناکەن. با سەرەتا ئاماژە بـۆ یـەکێك لــەم هێمایانــەی شــەرمەزاری بکــەین لەپێشچاوخســتنێکی دیــاریکراوی دیــالۆگی تیماوسدا:

***" تاوەکو بتوانین وێنای شوێنەکە بکەین، بەردەوام پێویستە لەسـەرمان، لەمیانەی داماڵینێکی نیمچە ئەستەم لەسەر بەدیهاتنی بەشێوەی کردەیی، بێین شتەکان لەیەکتری جیا بکەینەوە، شتەکان لـەم شـوێنە دامـاڵین کـە گرتوویـانن. لەگـەڵ ئەوەشـدا، ئـەم داماڵینـە لەمیانـەی ڕاسـتی گـۆڕینی خودەوە بەسەرماندا سەپێنراوە، مادام دوو شتی جیاواز نـاتوانن پێکـەوە لەیەك شوێندا ئامادە بن، مادام شتێك دەتوانێت ببێتە یەکێکی تـر، بـەبێ ئەوەی شوێنی خۆی جێبێڵێت" .***

کەواتــە، ئەگــەر لەمیانــەی خــوازە نــەبێت، نــاتوانین بچــینە شــوێنی تــرو ببینــە نوێنەری شتی تر. ئـەفلاتونیش زۆر لەمانــەی بــەکارهێناوە، زۆر خــوازەی جیــاواز، بــەجۆرێك مۆدێرنخوازەکــانی شــەرمەزار کــردووە. زاراوەی وەکــو "شــوێنگە" و، "شوێن" و، ئەم شتانەی کە "تێیدا" بەرجەستە دەبـن، "لەسـەری" و "قـازان" و "دایك" و .... تاد، هەموو ئەم زاراوانە وامان لێ دەکەن بیر لەپانتاییـەك بکەینـەوە کە پڕە لەشت. لەشوێنێکی تریشدا کە مەسەلەکە پێوەندی هەیـە "هـەڵگری مـۆر" و "بۆن و بەرامە، لەگەڵ ئەو ماددانەی کـە بەتـەواوی بۆنیـان لێ دامـاڵراوە لەلایـەن عـەتاری بۆنەکانـەوە، بـەم زێـڕەی کـە تـەنیا زێڕینگر دەتوانێـت نەخشـی لەسـەر دروستبکات، وێنەی زۆری جیاوازیش" .

ئەوە گواستنەوەیەکە لەپشت هەموو ئەو دوالیزمانەدا هەیە کە بەئەفلاتونی ناو دەبرێن، ڕووەو دووڕیانی وتووێژی ئەسڵی:

*" ئەوکات ئێمە دوو جۆرکەینوونەتمان لەیەکتری جیا کردەوە. ئێستاش، پێویستە لەسەرمان جۆری سێیەم بدۆزینەوە. بەڕاستی، دوو جۆری یەکەم بەس بوون بۆ ئەم نمایشەی ئێمە. یەکەم، گریمانی ئەوەمانکرد کە نموونە، یا مۆدێل ـ paradeigmatos جۆرێکی ماقووڵ و جێگیرە، ئەویتریش کۆپییەکە لەنموونەو پەیوەستە بەلەدایکبوون و دەبینرێت. ئەوکات، جۆری سێیەممان جیا نەکردەوە، چونکە پێمان وابوو ئەم دووە بەسن. بەڵام ئێستا، پێدەچێت زنجیرەی بیرکردنەوەمان ناچارمان بکات هەوڵبدەین وشەکانمان ڕوونتر گوزارشت لەم جۆرەی سێیەم بکات، ئەم جۆرەش زەحمەت و ئاڵۆزە.*

*باشە ئەو تایبەتمەندییانە چین کە پێویست دەکات بەشێوەیەکی سروشتی خاوەنداریتیان بکات؟ پێش هەموو شتێك، ئەوە یەکێکە لەتایبەتمەندییەکانی: هەموو لەدایکبوونێك ـ pases geneseos سکپڕییە هاوشێوەی شوێنگەیەك ـ upodokhen auten oion tithenen ئەم شوێنگەیەش وا جوانە هەمیشە هەمان ناوی پێبدەینەوەو ناشێت هەموو تایبەتمەندییەکانی لەدەست بدات. بەڕاستی ئەم، پێشوازی لەهەموو شتێك دەکات، هەمیشە لەهەموو ڕەوشێکدا وێنەی هاوشێوەی خۆی وەرناگرێت لەهیچ یەکێك لەم وێنانەی دێنە ناوی، چونکە بەسروشتی خۆی هەڵگری مۆری ـ ekmageion هەموو شتەکانە. ئەم شتانەی دێن*

و دەیبڕن، دەیانخاتە بزاڤ و دەیانبڕێت و دەیان کات بەوێنە، بەهۆی چالاکی ئەم شتانەشەوە، جارێك بینراوەو جارێکیش ونە. بەڵام ئەم وێنانەی دێنە ناوی و لێی دەردەچنن وێنەی بوونەوەری سەرمەدین ـ ton onton aei mimemata کە ئەم بوونەوەرانە بەجۆرێك مۆری ـ tupothenta دەکەن، زەحمەتە شرۆڤە بکرێت، سەختە، دواتر وەسفی دەکەین.

بۆ چرکەیەك ئەوەندە بەسەر ئەم سێ جۆرە ئەنوگادە لەزەیندا بچەسپێنین، ئەوەی لەدایك دەبێت، ئەوەی ئەمی تێدا لەدایك دەبێت، ئەوەی لەسەر شێوەی ئەم لەدایك دەبێت. وا گونجاوە قازان بەدایك بەراورد بکەین، نموونەش بەباوك، سروشتیش وەکو نێوەندێك بەمنداڵ. لەوەش زیاتر، وا باشە زۆرباش لەوە تێبگەین کە دێت: مۆرەکان دەبێت زۆر فرەو جیاواز بن و هەموو شێوەیەکی مومکین بخەنە بەرچاو، ئەوەی لەمیانەی ئەم مۆرانەوە پێکدێت، بەباشی وەرناگیرێن ئەگەر بەتەواوی لەهەموو وێنەکان دانەماڵرابن کە لەشوێنی ترەوە وەریان دەگرێت. لێرەوە لەبارەی دایکەوە ناڵێین بریتییە لەقازانی هەموو شتێك کە لەدایك دەبێت، هەموو شتێکی بینراو، بەشێوەیەکی گشتی قازانی هەموو شتێکی هەستی، هەموو شتێك کە بریتی بێت لەخۆڵ و هەواو ئاگر، یا هەر شتێکی تر کە لەمانەوە لەدایك دەبێت، یا ئەوانە لێی لەدایك دەبن. بەڵام ئەگەر ئێمە بڵێین بریتییە لەجۆرێکی دیاریکراوی نەبینراوو بێ وێنە، پێشوازی لەهەموان دەکات و

*بەشێوەیەکی زۆر شەرمەزارو تێنەگەیشتراو، بەشداری لەماقووڵ دەکات، ئەوە ئێمە هەرگیز درۆ ناکەین".*

ئێستا دەگەڕێینەوە بۆ شوێنگەیەکی دوورتر، بۆ خەون، وەکو ئەوەی لەم دەقەی نێو دیالۆگی کۆماردا هەیە کە پێوەندی بەبینینی ئەم شتەوە هەیە کە ڕێگا نادرێت بەسادەیی لەمیانەی دوالیزمی هەستی و ماقووڵ، گریمانەیی و نا گریمانەیی بیری لێبکرێتەوە. جۆرێك لە ــ nothos کە پێمان وایە چەمکەکەی لەلای دیموقراتیس ناسراو بووە:

*" بەردەوام جۆرێکی تری سێیەم هەیە، جۆرێکە لەپێوەندی، نامرێت و شوێنگەیەك بۆ هەموو ئەم شتانە دابین دەکات کە لەدایك دەبن. هەر خۆیشی تەنیا لەمیانەی جۆرێك لەبیرکردنەوە نەبێت ناپشکنێرێت، هیچ هەستێك هاوشانی نییە، بگرە ناتوانین بڕوای پێبکەین. بێگومان ئەوەیە لەکاتی خەوندا دەیبینین کاتێك جەخت دەکەینە سەر ئەوەی هەموو بوونەوەرێك وەکو پێویست لەشوێنێکدا جێنشینە، لەشوێنگەیەکدا، شوێنگەیەکی دیاریکراو داگیر دەکات، ئەوەی لەسەر زەوی و لەنێو ئاسمانیش نەبێت، ئەوە هەر خۆی هیچ شتێك نییە. بەڵام، هەموو ئەم جۆرە پشکنینانەو کۆمەڵێك پشکنینی تری هاوشێوەی کە پێوەندییان بەسروشتی ئەم بوونە هەیە، وەکو ئەوەی بەحەقیقەت و لەدەرەوەی خەوندا هەیە، زۆرجار لەکاتی وشیاریدا دێنە بەرچاو، بەهۆی ئەوەش نازانین ئەوە خەونە یا خەیاڵەو زۆرتریش لەزیندە خەون دەچێت، بۆیە ناتوانین بەڕوونی جیای بکەینەوەو بڵێین چ شتێکی ڕاستەقینەیە".*

کەواتــە، نووســین یــا نــەخش، لەیــەك کاتــدا بەرهــەمی کــوڕەو دامەزرانــدنی بونیادێکیشە. پێوەندی نێوان بونیادی زاوزێی و پیتەکان بەتـەنیا لـەنێو گوتـاری کۆسمۆگۆنی پەیوەست بەدامەزراندنی گەردوون دەرناکەوێت، بەڵکو لەنێو گوتـاری سیایش دەردەکەوێت، لەنێو گوتاری زمانەوانیش دەردەکەوێت.

لـەنێو سیســتەمی سیاســیدا بونیــاد لەمیانــەی نووســینەوە خــۆی دەردەخــات. لەچرکەسـاتی زەحمـەتی زۆر گـەورەدا کاتێـك هـیچ سەرچـاوەیەکی فێرخـوازی تـر ئامادە نییە، ئەو کاتەی وتاری تیۆری هیچ شێوازێك نادۆزێتەوە بـۆ گوزارشـتکردن لەسیستەمی سیاسی و جیهانەکەی و گەردوونەکەی، ئـەو کاتـە دەگەڕێنـەوە سـەر خوازەی نووسراو. هاوشێوەیی پیتی نووسـراوی گـەورەو پیتـی نووسـراوی بچـووك تێکەڵاو دەبن، لـەنێو ئـەم برگـە نـاودارەی نێـو دیـالۆگی کۆمـاردا، کاتێـك بینینـی پەنجەرە پێویست دەبێت و ئێمەش "ئەم دەروازەیەمان نییـە". لـەو شـوێنەدا کـە تێیدا حەدسی ئامادەگی هەستی یا ماقووڵ کاتێك نا ئامادە دەبێـت، ئـەوە بونیـاد وەکو نووسینێك دەردەکەوێت.

ئەوەش هەمان بزاڤە لەنێو کایەی زمانەوانیدا. وەکو چۆن لەنێو "چەند وانەیەك لەبارەی زمانزانی گشتی" سۆسێردا، سەرچاوەی نووسراو دەبێتە پێداویستـییەکی ڕەها، لەم خاڵەدا پێویست دەکات چـەمکی جیـاوازی و جیاکـاری بەگشـتی، وەکـو مەرجێك بۆ دەلالەت دەستنیشان بکرێت. بەم شێوەیە دەرکەوتنی دووەمـی تـووت لەنێو دیمەنی ئەفلاتونیدا دەشێت ڕاڤە بکرێـت، چـونکە لـەنێو دیـالۆگی فیدرۆسـدا داهێنەری فارمـاکۆن گوتـارێکی درێـژ پێشـکەش دەکـات و تێیـدا پیتـەکانی خـۆی لەبەردەم پاشا نمایش دەکات و داوای ڕەزامەندی لێ دەکات. بەڵام دەرکەوتنەکەی

تری، کە ناڕاستەوخۆیە، وەکو ئەوەی پێشتر سەرنجڕاکێشە بۆ ئێمە لەلایەنی فەلسەفییەوە. ئەم دەرکەوتنە بەناوی داهێنانی نووسینەوە نییە، بەڵکو بەناوی داهێنانی سێنتاکسە، زانستی قەواعید وەکو زانستێك بۆ جیاوازی، ئەوەش لەدەسپێکی دیالۆگی فیلیپۆسدا دەردەکەوێت:

*" وتووێژێکی گەرم لەئارادایە لەبارەی پێوەندییەکانی کە چێژیان هەیەو ـ khairein حیکمەت و وریایی ـ phronein. لێرەشدا کێشە لەسەر سنوورەکانی ئەم چێژەیە. ئەنجامیش، هەر وەکو ئەوەی لەنێو دیالۆگی تیماوسدا هەیە، زەحمەتی بەیەکەوە هەڵکردنی خود لەگەڵ ئەویتر، یەکانەیی و فرەیی، تەناهی و نا تەناهی ..... باب وباپرانمان، کە پێگەیان لەئێمە بەرزتر بووەو لەنزیك خواوەندەکان ژیاون، ئەم تەقلیدەیان پێداوین، ئەویش بریتییە لەوەی هەموو ئەم شتانەی بوونیان هەیە، لەیەك سەرچاوەوەی یەکانەن، بەڵام فرەن، لەنێو خۆیدا سنوورو تەناهی ـ peras de kai apeirian بەشێوەیەکی ئەسڵی یەکانگین ـ en autois sumphuton".*

دیالیکتیك بریتییە لەهونەری ڕێزگرتن لەم نێوەندانە ـ ta mesa، سوقراتیش دەیخاتە بەرانبەر بەدیالۆگ ـ وەکو هونەر، کە پەلەیەتی لەوەی بگاتە کۆتایی. ئەمجارەیان بەپێچەوانەی ئەوەی لەنێو دیالۆگی فیدرۆسدا ڕوو دەدات، پیتەکان داواکراون تاوەکو ڕوونی ـ sapheia بەگوتار ببەخشن:

***" پروتارخۆس: ئەی سوقرات، بەشێك لەم شتانەی دەیانڵێیت، وا دەزانم کە تێیان دەگەم، بەڵام بەشێکیان هێشتا پێویستییان بەڕونکردنەوەی زیاتر هەیە.***

***سوقرات: ئەی پروتارخۆس، ئەم ڕوونکردنەوەیە پیتەکان پێتی دەبەخشن، داوا لە ئەمان بکە، کە بەمنداڵی فێریان بوویت.***

***پروتارخۆس: چۆن؟***

***سوقرات: ئەم دەنگەی لەدەممانەوە دەردەچێت هەمان شتە کە هەموومان هەمانە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە فرەیە کە بێکۆتاییە.***

***پروتارخۆس: بەدڵنیاییەوە.***

***سوقرات: لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوە مانای وا نییە ئێمە مەعریفەمان هەیە لەبارەی ئەم و ئەو، نە مەعریفەمان هەیە لەبارەی دەنگ وەکو ئەوەی کۆتاییە، نە مەعریفەشمان وەکو ئەوەی یەکە. بەڵام زانینی ئەوەی چەندەو، چەندە جیاوازە، ئەوەیە کە هەر یەکێك لەئێمە دروست دەکات لەلایەنی سێنتاکسەوە".***

دوای قسەکردن لەسەر نموونەی دابڕانە ـ diastemata مۆسیقییەکان، ئەوە دەگەڕێنەوە سەر شرۆڤەکردنی دابڕین و جیاوازی لەنێو دەنگە زمانەوانییەکاندا:

***" سوقرات: با جارێکی تریش بگەڕێینەوە بۆ پیتەکان، بۆ ڕاڤەکردنی ئەم قسانەی پێش کەمێك کردمان. کاتێك تێبینی ناتەنامی دەنگی مرۆڤ کرا، ئینجا لەلایەن خواوە بووبێت، یا لەلایەن مرۆڤی خوایی ـ کولتووری میسری باسی ئەوە دەکات کە تووت یەکەم کەس بووە تێبینی حروفی علەی***

***کردووه ـ ta phoneenta، لەنێو ئەم نا تەنامییەدا یەك دەنگ نییە، بەڵکو فرەیە، بگرە لەوەش زیاتر کۆمەڵێك دەنگی تر هەن دەردێن، دەنگ نین، بەڵام هاوڕەیان دێت، ئەوانەش چەند دەنگێکی دیاریکراون و خراونەتە نێو جۆرێکی تری سێیەم بەسەربەخۆ کە ئێستا ناویان دەنێین پیتە ڕاستەقینەکان، یا پیتە بێدەنگەکان ـ aphona. دوای ئەوە، یەك یەك ئەم پیتە بێدەنگانەی دابەشکرد ـــ aphtonga kai aphona، بەهەمان شێوەش لەگەڵ پیتەکانی تر، ئینجا دەستنیشانیکردن و هەموویانی ناونا توخمەکان ـ stoikheion.***
***کاتێك تێبینی ئەوەی کرد، هیچ کەسێك لەئێمە ناتوانێت هیچ یەکێك لەمانە فێربێت بەدابڕاوی لەئەمانی تر، ئەم پاشکۆیەتییە هاوبەشەی ـــ desmon نێوانیانی وا تەماشا کرد وەکو پێوەندییەك هەموویان دروست دەکات یەك بەیەکە و زانستێکی تایبەتی بۆ داناو ناوی نا هونەری سێنتاکس".***

بۆیە خوازەی نووسراو ئەو کاتانە دێت کە تێیدا جیاوازی و پێوەندییەکان توانای توانەوەیان نەبێت و نەتوێنەوە، هەر جارێکیش کە دێت لەگەڵ خۆیدا ئەویترێك دێنێت و بزاڤ دەست پێدەکات.

ئەفلاتون ناچارە دەستنیشانی گەمەی ئەویتر لەنێو خوددا بکات، دەستنیشانی بکات وەکو نووسین لەنێو گوتارێکدا کە سەرەتاو لەجەوهەرداو بەحەقیقەت، بەشێوەی زارەکی و ئاخافتن خۆی ئامادە دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەنووسرێت. ئەگەر لەمیانەی مەرگی سوقراتەوە دەنووسرێت، ئەوە بێگومان

هۆکارێکی زۆر قووڵە. لەمیانەی مەرگی سوقرات: مانای وایە لەمیانەی کوشتنی باوک لەنێو دیالۆگی سۆفیستەکانیشدا. خۆ ئەگەر ئەم هێرشە توونده نەبووایە بۆ سەر ڕوخساری بەڕێزو باوکانەی پارمنديس، هێرش نەکرابووایە سەر تێزەکەی لەبارەی یەکێتی بوون، ئەم دزەکردنە توندەی ئەویتر و نا ـ بوون، نەبووایە بۆ سەر نا ـ بوون وەکو ئەوەی دوایین یەکێتی بوون بێت، ئەگەر هەموو ئەمانە نەبووان، ئەوە نووسین و گەمەکەشی پێویست نەبوون.

نووسین باوك دەکوژێت. ئایا بەڕێکەوتە لەنێو دیالۆگی سۆفیستەکاندا، کەسی بێگانە پێویستی کوشتنی باوك و، حەتمییەتی کوشتنی باوك، وەکو شتێکی ئاسایی تەماشا بکات و وەربگرێت، وەکو ئەوەی شوێنێك بۆ نابینایەك باسبکرێت ـ tuphlo. (پێویستە بگوترێت: بەتایبەتی بۆ نابینایەك). دەڵێین وەکو مەرجێك تەماشای دەکات بۆ توانای دامەزراندنی گوتارێك لەبارەی ساختە، بت، وێنە، توخمی لاساییکەرەوە، خەیاڵکردن و ئەو هونەرانەی بایەخ بەمانە دەدەن؟ واتا مەرجەکانی نووسین؟ لێرە لەم خاڵەدا باسی نووسین ناکرێت، بەڵام ئەم درزە جگە لەوەی ڕێگر نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە، ڕێگاش خۆش دەکات تاوەکو پێوەندی لەگەڵ هەموو ئەم چەمکانە ڕێکخراو بێت و بخرێتە نێو سیستەمێك، ئێمەش هەر وا جیامان کردۆتەوە:

***" کەسی بێگانە: پێویستە تاوەکو خۆمان بێلایەن ڕابگرین، تێزەکەی باوکمان، پارمنديس بخەینە ژێر پرسیار ـ Ton tou patros Parmenidou logon، بەتوبزی بیچەسپێنین کە نا ـ بوون (-me***

***on) لەڕوخسارێك لەڕوخسارەكانیدا، بوونە، بوونیش خۆی بەشێوەیەك لەشێوەكان بوونی نییە.***

***تیماوس: بێگومان دەبێت ئێمە جەخت بكەینە سەر ئەمە كە جەوهەری وتووێژەكەیە ـ phainetai to toiouton diamakheteon en .tois logois***

***كەسی بێگانە: باشە چۆن ئەوە شتێكی ئاسایی نییە، ئاساییە تەنانەت بۆ كەسێكی نابیناش، مادام هیچ بەڵگەیەك و هیچ ڕەتكردنەوەیەك پێشكەش نەكرابێت، ئەوە ئێمە ناتوانین نە قسە لەبارەی ئاخافتن بكەین، نە قسە لەبارەی گوتاری ساختەو ڕاو بۆچوونی ساختە، نە لەبارەی وێنەو نە لەبارەی كۆپی، نە لەبارەی تەقلیدو نە لەبارەی هاوشێوەیی، نە لەبارەی هیچ هونەرێك كە پێوەندی بەهەموو ئەمانەوە هەبێت، بەبێ ئەوەی نەكەوینە نێو دژكاری گەمژانە بەجۆرێك لێیان دەرباز نەبین.***

***تیماوس: ئەوە بەتەواوی ڕاستە.***

***كەسی بێگانە: ئاخر لەبەر ئەم هۆیە، ئێستا كاتی ئەوە هاتووە خۆمان لەقەرەی ئەم تێزە باوكانەیە بدەین ـ to patriko logo، یا ئەوەتا بەیەكجارەكی پاشەكشە بكەین بەرانبەری، ئەگەر بەهەر هۆیەك نەتوانین لێی نزیك بینەوە.***

***تیماوس: هیچ شتێك ڕێگامان لێناگرێت بۆ ئەم كارە."***

ئەم كوشتنەی باوك، گەمەی جیاوازی و نووسین لەگەڵ خۆیدا دێنێت، بڕیارێكی مەترسیدارو تۆقێنەرە، تەنانەت بۆ كەسێكی نەناسراوو بێگانەش. ئەم كارە،

پێویستی بەهێزی سەروو مرۆڤانە هەیە، دەبێت سەرکێشی بکەین بەشێوەیەکی شێتانە، یا ئەوەتا ئێمە شێتین لەنێو کۆمەڵگەیەکی زیرەك و عاقڵدا دەژین، کۆمەڵگەیەك لەمنداڵی باش و بێگەردو پاك. لێرەوەیە کەسی بێگانە هەست بەهەندێك ترس دەکات لەوەی بایی ئەوەندە هێزی نەبێت بتوانێت شێتی بەرپا بکات، لەلایەکی تریشەوە قسەیەك بکات بێ سەرو پەل و کلك بێت. ئەم کوشتنەی باوك وەکو یەکلاکردنەوەی بڕیاری لەسێدارەدان وایە، وەکو ئەمیش تۆقێنەرە. هەر کات بڕیارەکە دەرچوو، تازە ناگەڕێتەوەو هیچ هیوایەك نامێنێت بۆ ژیان. لێرەدا مرۆڤ قومار دەکات، قومار بەسەرو پەل و کلکی خۆی دەکات. بۆیە کاتێك کەسی بێگانە بەبێ هیچ وەهمێك داوا لەتیماوس دەکات بەباوك کوژی دانەنێت — patraloian، ئەوە دێت ئەم داوایەشی پێشکەش دەکات:

***" کەسی بێگانە: بۆ جاری سێیەم، ناچارم داوای هەندێك یارمەتیت لێ بکەم.***

***تیماوس: فەرموو قسە بکە.***

***کەسی بێگانە: پێم وابێت پێش کەمێك بەڕاشکاوی دانم بەوەدانا کە ئەم جۆرە ڕەتکردنەوەیە لەهێزی من زیاترە.***

***تیماوس: بەڵێ دانت بەوە دانا.***

***کەسی بێگانە: بۆیە، دەترسێم ئەم قسانەی من وات لێبکات بەشێتم بزانی _ manikos کە بەلادادێت".***

لەم کاتەدا گوتار دەست پێدەکات. لۆگۆسی باوك سەراوژێر دەکرێت. ئایا ئەوە ڕێکەوتە کە لایەنێکی سێیەم بێتە بوون _ triton ti نەکرێت کورت بکرێتەوە بۆ

دوالیزمییەتی ئەنتۆلۆژی کلاسیکی تاوەکو جارێکی تر نموونەی سێنتاکس و پێوەندی نێوان پیتەکان وەربگیرێت بۆ ڕاڤەکردنی گرێچنێك کە سیستەمی جیاوازی نێوان شێوەکان بچنێت، لەسایەیانەوە "گوتار لەدایکبووە ــ s logos gegonen emin؟ هەروەها گرێچنی بوون و نەبوون؟ لەبارەی بنەمای گونجان و دابڕان، یەکێتی و دوورکەوتنەوەی نێوان جیاوازییەکانیش، ئەوە حاڵەتی ئەم گرێچنە هەر وەکو ئەوە دەبێت کە تێیدا پیتەکان دەبینین. (بڕوانە دیالۆگی سیاسی کە تێیدا "نموونە" گرێچن بەهەمان پیتگەراییە).

بێگومان زانستی سێنتاکس (علم النحو) دیالیکتیك نییە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەفلاتون دەیەوێت سێنتاکس ملکەچی دیالیکتیك بکات. ئەم پێی وایە ئەو جیاکارییە شتێکی هەڕەمەکییە، بەڵام لەم شیکردنەوەیەی دواییدا چ شتێك پاساوی ئەم بۆچوونەی دەداتەوە؟ هەردووکیان، بەشێوەیەك لەشێوەکان دوو زانستی زمانەوانینن چونکە دیالیکتیکیش ئەم زانستەیە کە ئاڕاستەمان دەکات ــ dia ton logon لەمیانەی گوتارو پاساوەکانەوە. ئەوەی دیالیکتیك لەسێنتاکس جیا دەکاتەوە، لێرە لەم ئاستەدا وا دێتە بەرچاو وەکو ئەوەی لەسەر دوو ئاستەوە بێت: لەلایەك، یەکە زمانەوانییەکان کە بایەخیان پێدەدات، لەوشە گەورەترن (بڕوانە دیالۆگی کراتیلیۆس). لەلایەکی تریشەوە بەردەوام مەبەستەکانی حەقیقەت ئاڕاستە دەکات، تەنیا ئەم دەتوانێت ئامادەگی ئایدیا پڕبکاتەوە کە لێرەدا هەم سەرچاوەیەو هەمیش مەدلولە، هەمان شت خۆی.

بۆیە، ناکرێت جیاکاری نێوان سێنتاکس و دیالیکتیك بەوردی دەستنیشان بکرێت، تەنیا لەم خاڵەدا نەبێت کە تێیدا حەقیقەت خۆی بەپڕی ئامادەیەو لۆگۆس

و گوتـاریش پـڕ دەکـات. ئـەوەی کوشـتنی بـاوك دەسـەلمێنێت لـەنێو دیـالۆگی سۆفیسـتەکاندا، هـەر ئـەوە نییـە کـە ئەسـتەمە بـوون بەشـێوەیەکی پـڕو ڕەهـا ئامادەیی هەبێت (هەبووی ـ ئێستا بوونی زیـاترە: خێـرو خـۆر ناکرێـت ڕوو بـەڕوو تەماشا بکرێن). بۆیە ئەستەمە حەدسێکی پڕ لەحەقیقەت بەدی بێت، یا حەدسێك بۆ حەقیقەت، ئەوەی کە مەرجی گوتارە، هەر گوتارێك بێـت حـەقیقی یـا سـاختە، ئەو بنەما جیاکەرەوەیەی گرێچنە. مـادام حەقیقـەت بریتییـە لـەئامادەگی ئایـدیا، بۆیە پێویستە لەسـەری بـەردەوام گونجـاو بێـت، تـەنیا لەحاڵـەتی ونبـوونی بکـوژ نەبێت لەپشت ڕووناکی خۆردا. دەڵێین دەبێت بگونجێت لەگەڵ ئەم پێوەندییەو نـا ــ ئامـادەگی و نـا ــ حەقیقەتـەدا. کەواتـە مـەرجی ڕەهـا کـە پێویسـتە بـۆ ئـەم جیاوازییەی نێوان سێنتاکس و دیالیکتیك، یا ئەنتۆلۆژیا، لـەنێو پێشـینەو بەرایـیدا وەکو پرنسیبێك ـ au principe بەدی نایەت. یا بەلایـەنی کـەم دەشـێت وەکـو پرنسیبێك لەخاڵی هـەبوونی ئەسـڵی و حەقیقـەتی ئەسـڵیدا بـوونی هـەبێت، بـەڵام لێرەدا بەلایەنی کەم، لەگەڵ پێویستی کوشتنی باوکدا، سڕاوەتەوە، واتا پێویستی لۆگۆس خۆی. ئەوەش ئەم جیاوازییەیە کە ڕێگا نادات جیـاوازی کردەیـی لـەنێوان سێنتاکس و ئەنتۆلۆژیادا بێتە ئارا.

بەڵام بۆچی مەحاڵە حەقیقەتێك بێتە بوون؟ یا ئامـادەگی پـڕ لـەبوون هـەبێت؟ بوونێکی پڕ؟ یا بەپێچەوانەوە؟ مادام حەقیقەتێکی لەم شـێوەیە بریتییـە لەمـەرگ لەنێو کوێرەوەریدا، ئەی باشە مەرگ خۆی حەقیقـەت نییـە؟ یـا حەقیقـەت نییـە؟ مادام شێوەی ئەم پرسیارە ئەنجامی ئاخافتن و بەقسەخستنی ئەمە، وەکو ئەوەی دەنووسرێت، چۆن پـڕ بـوونی ئامـادەگی ڕەهـای "بـوونی ڕەهـا ــ on ontos"

دەنووسرێت؟ چۆن پێویستی فرەیی جۆرو هزرو پێوەندی و جیاوازی دادەڕێژرێت؟ ئەریٚ دیالیکتیك چۆن وێنە دەکێشرێت؟

نەبینروای ڕەهای ئەسڵی بینراوی (خێر، خۆر، باوك، سەرمایە، ... تاد) و شاردنەوەی وێنەی ئامادەگی یا ئەنوگاد، هەر هەموو ئەمانەو ئەو زێدەیەی ئەفلاتون ئاماژەی بۆ دەکات وەکو پشت ئەنوگاد یا ئامادەگی ــ epekaina tes ousias، ئەگەر بشێت بڵێین، دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی بونیادێك بۆ نوێنەرایەتیکردن ــ suppleance، بەجۆرێك هەموو ئامادەبوونەکان دەبنە زیادەو شوێنی ئەسڵی نا ئامادەبوو دەگرنەوە، بەجۆرێك هەموو جیاوازییەکان لەنێو سیستەمی ئامادەبوودا، دەبنە ئەنجامێك کە قابیلی تووانەوە نییە لەپشت ئەنوگاد یا ئامادەبوونەوە.

وەکو چۆن سوقرات دەبێتە نوێنەری باوك، بەهەمان شێوە دیالیکتیك دەبێتە نوێنەری ئیدراکی ــ noisis ئەستەم و حەدسی قەدەغەکراوی ڕوخساری باوك (خێر، خۆر، سەرمایە). بە پاشەکشەو کشانەوەی ڕوخسار، مومارەسەی دیالیکتیك هەم دەست پێدەکات، هەمیش دەوەستێت. بەبیٚ ویستی خۆی کۆدەبێتەوە لەگەڵ ئەم جۆرە مومارەسە ئاستنزمانە بە بەراورد بەخۆی کە بریتین لەهونەرەکانی لاساییکردنەوە، گەمەکردن و سێنتاکس، نووسین، ... تاد. ونبوونی ڕوخسار بریتییە لەبزاڤی جیاوازی کە دێت زۆر بەتووندی نووسین دەکاتەوە، یا ئەگەر دەتانەوێت، نووسین دەکرێتەوە لەبەردەم خۆیدا کە نووسینە.

هەموو ئەم بزاڤانە، بەهەموو ئاڕاستەو ڕووەکان و ماناکاندا، بۆ هەمان سیستەم دەگەڕێتەوە. ئەم گوتەیەی نێو دیالۆگی کۆماریش بۆ هەمان سیستەم دەگەڕێتەوە

کە تێیدا بەزاراوەی نا ــ تووندوتیژانە باسی توانای ڕۆچوونە نێو باوك دەكات وەكو بوونەوەرێك كە لەپشت ئامادەگییەوە بوونی هەیە ــ epekeina tes ousia، بۆ ئەم پێشنیارەی پیاوە بێگانەكە لەبارەی كوشتنی باوك وەكو هەڕەشەیەك لەلۆگۆسی باوكانە. تاوەكو لەنێو هەمان بزاڤدا هەڕەشە لەناوەی ماڵیكراوو ڕێزبەندی دەرمانخانەیی بكات، لەسیستەمی باش، ڕێڕەوی باش، بەڕێوەچوونی باشی بەرهەمەكانی و پۆلینكراوەكانی و پێوەرەكانی، بۆ ڕێكخستنی باش و جیاكردنەوەی پوختی دەرمان و ژەهرەكانی، تۆی ژیان و تۆی مەرگ، جێكەوتی باش و جێكەوتی زیانبەخش. بۆ یەكێتی میتافیزیكاو تەكنیك، دوالیزمی ڕێكخراو.

ئەم باڵادەستییە فەلسەفی و دیالیكتیكییە بەسەر توخمەكانی دەرمانخانە كە پێویستە بۆماوە بمێنێتەوە لەباوكێكی شەرعییەوە بۆ كوڕێكی ڕەسەن، دیمەنی خێزان دەخاتە ژێر پرسیاری بێ كۆتایی، بەوەش لەیەك كاتدا، دێت دەروازەیەك دەكاتەوە بۆ بەیەكەوە بەستنەوەی دەرمانخانە بەماڵ. ئەفلاتونیزم خۆی، لەهەمان كاتدا، دووبارە كردنەوەی گشتی ئەم دیمەنە خێزانییەیەو، ئەم هەوڵ و كۆششە بەهێزانەیە بۆ ملكەچ پێكردنی، بۆ بێدەنگكردنی ئەم ژاوە ژاوەی، بۆ شاردنەوەی لەپشت پەردەی داخراو لەبەیانییەكی خۆرئاواییدا.[1]

---

(1) دریدا لێرەدا مەبەستی سەرهەڵدانی میتافیزیكای ئامادەگی خۆرئاوایە لەمیانەی لۆگۆسێنتڕالیزمی ئەفلاتونی، ئەم سەرهەڵدانەی لێرەدا وەكو بەرەبەیانی خۆرهەڵاتن تەماشای دەكات، لەگەڵ ئەم بەیانییەدا میتافیزیكای ئامادەگی خۆرئاوا دەسەڵاتی خۆی دەسەپێنێت.

ئایا ئێمە دەتوانین بچین بەدوای شەونخوونییەکی تردا بگەڕێین، کاتێك سیستەمی دەرمانخانەیی لەبزاڤێکدا بەتەنیا ئاڕاستەی دیمەنی نێو دیالۆگی فیدرۆس ناکات، بەتەنیا ئاڕاستەی دیمەنی نێو دیالۆگی کۆمارو سۆفیستەکان و دیالیکتیك و لۆژیك و سەرتاپای میتۆلۆژیای ئەفلاتونی ناکات، بەڵکو، وەکو ئەوەی دیارە، دێت ئاڕاستەی هەندێك بونیادی نا یۆنانییانەی میتۆلۆژیاش دەکات؟ ئەگەر لەناوەڕۆکدا شتێك نەبێت بەناوی میتۆلۆژیای نا یۆنانی، مادام دوالیزمی (میتۆس ـ لۆگۆس) لەمیانەی ئەفلاتونەوە هەرگیز ڕێگا بەمە نادات، ئەوە ئێمە بەرەو چ پێویستییەکی گشتگیر دەڕۆین کە ناکرێت ناوی لێ بنرێت؟ بەگوزارشتێکی تر، ئەفلاتونییەت مادام بریتییە لەدووبارە بوونەوە، ئەوە مانای چییە؟

با دووبارەی بکەینەوە. ونبوونی خێر، باوك، سەرمایە، خۆر، مەرجی گوتارە، ئەوەی کە ئەمجارە وەکو چرکەساتێك تەماشا دەکرێت، نەوەك وەکو پرنسیبێکی گشتی نووسین. ئەم نووسینە بریتییە لەپشت ئامادەگی. ونبوونی حەقیقەت وەکو ئامادەگی، یا شاردنەوەی ئەسڵی ئامادەی ئامادەگی، کە مەرجی هەموو بەرجەستەبوونێکی حەقیقەتە. نا ـــ حەقیقەت، بریتییە لەحەقیقەت. نا ـــ ئامادەگی، بریتییە لەئامادەگی. جیاوازی، بریتییە لەونبوونی ئامادەگی ئەسڵی، ئەمیش لەهەمان کاتدا مەرجی توانای حەقیقەتە و مەرجی نەبوونی حەقیقەتە. لەیەك کاتدا، مانای وایە ئەوەی بوونی هەیە ـ ئامادەیە لەنێو حەقیقەتی خۆیدا، لەنێو ئامادەگی ناسنامەو ناسنامەی ئامادەگیدا، هەر کاتێك دەردەکەوێت وەکو دوالیزمێکە، هەر کات دەرکەوت، دووانەیە. بەجەوهەری خۆی دەردەکەوێت وەکو توانای دوانەیی خۆی. واتا بەزاراوەی ئەفلاتونی دەبێتە توانای نا ـــ حەقیقەتی

زۆر تایبەت و نیمچە حەقیقەتی ئاوەژوو بووەوە لەنێو وێنەدا، لەنێو خەیاڵکردن، لەنێو هاوشێوەییدا. نابێتە خودی خۆی، واتا هاوشێوە نابێت، هاوشێوەی خودی خۆی نابێت، دەگمەن نابێت، تەنیا بەمیوانداریکردنی توانای دووبارە بوونەوەی خۆی نەبێت وەکو ئەوەی کە هەیە. ناسنامەکەی ڕۆدەچێتە نێو ئەم زیادەیە.

بۆیە، ونبوونی ڕوخسار یا بونیادی دووبارە بوونەوە، ڕێگا نادەن لەمیانەی بەهای حەقیقەتەوە کۆنترۆڵبکرێت. بەپێچەوانەوە، بەرانبەر یەکتربوونەوەی حەقیقەت و نا حەقیقەت هەر بەتەواوی لەنێو خۆیدایە، نووسراوەتەوەو دەستنووسە لەنێو ئەم بونیادەدا، لەنێو ئەم نووسینە گشتگیرەدا. حەقیقی و نا حەقیقی، دوو جۆری دووبارە بووەوەن. هیچ دووبارە بوونەوەیەك مومكین نابێت ئەگەر لەنێو زیادەدا نەبێت، کە وا دەکات یەکێکی تر بێت جێگای بگرێتەوە، چونکە لەهەمان کاتدان هاوشێوەیەو جیاوازیشە بەجۆرێك بتوانێت جێگای ئەم یەکێتییە بگرێتەوەو زیادەشی بخاتە سەر.

بەم شێوەیە، لەلایەك دووبارە بوونەوە ئەم شتەیە کە بەبێ بوونی ئەم حەقیقەت بوونی نابێت، حەقیقەتی هەر شتێك کە بوونی هەیە لەمیانەی شێوەی ئایدیالییانەدایە، ئەوەش لەنێو ئایدیادا ئاشکرا دەبێت، ئەوە دەکرێت دووبارە بکرێتەوە کە دێت، شتێك، ڕوون، جێگیر، دەکرێت دەستنیشان بکرێت لەنێو خودی خۆیدا. تەنیا ئایدیا دەتوانێت زاڵ بێت بەسەر دووبارە بوونەوە وەکو ئەوەی بیرخستنەوەیە، یا میتۆدی بەهەمهێنان و لەدایکبوونە، دیالیکتیك، یا فێرکاری. لێرەدا دووبارە بوونەوە پێش دەکەوێت وەکو ئەوەی بریتییە لەدووبارە بوونەوەی ژیان. حەشوو بریتییە لەم ژیانەی لەخودی خۆی دێتە دەرەوە تاوەکو

جارێکیتر بۆی بگەڕێتەوە. لەنزیك یادەوەرییەکەی جێنشین دەبێت ـ mneme، لەنێو لۆگۆسەکەی ـ logos، لەنێو دەنگەکانی ـ phone.

لەلایەکی تریشەوە، دووبارە بوونەوە بریتییە لەبزاڤی نا ـ حەقیقەت بەخودی، کە تێیدا ئامادەگی بوون دەفەوتێت، پەرت دەبێت، لەمیانەی کۆمەڵێك لاساییکردنەوەدا فرە دەبێت، لەمیانەی کۆمەڵێك وێنەو خەیاڵکردنەوە، لەمیانەی هاوشێوەییەوە، .... تاد. ئەم دووبارە بوونەوەیە توانای ئەوەیە کە شتێك ببێتە هەستناك و هەستی پێبکرێت، نا ـ ئایدیالی، نا ـ فەلسەفی، یادەوەری خراپ، بیرکەوتنەوە، نووسین. لێرەدا حەشوو دەبێتە دەرچوون لەژیان، لەدەرەوەی خود، دەرچوونێك بەبێ گەڕانەوە. دووبارە بوونەوەی مەرگ، خەرجکردنێکی بێ سنوور، زێدەڕۆییکردن لەمیانەی گەمەی زیادەوە کە چیتر کورت ناکرێتەوە بۆ هەموو خودگەراییەکی زیندوو، بۆ خێر، بۆ حەقیقەت.

ئەم دوو دووبارە کردنەوەیە، یەکتری ئاراستەی یەکتری دەکەن بەپێی پلانێك بۆ زیادە. واتا ناکرێت لەیەکتری جیایان بکەینەوە، یا بیر لەیەکێکیان بکەینەوە بەبێ ئەویتر، وەکو چۆن لەنێو دەرمانخانەدا ناکرێت دەرمان و ژەهر لەیەکتری جیابکرێنەوە، خێرو شەڕ، حەقیقەت و ساختە، ناوەو دەرەوە، زیندوو مردوو، یەکەم و دووەم، ... تاد. فارماکۆنیش کاتێك لەنێو ئەم هەڵگەڕانەوەیەدا بیری لێ دەکرێتەوە، هەمان شتە، چونکە ئەمیش ناسنامەی نییە. هەمان شتە کە زیادەیە، هەمان شتە لەنێو زیادەدا، هەمان شتە لەنێو جیاوازی، لەنێو نووسین. هەر وای دەگوت، ئەگەر گوتاری تووت لەبەردەم پاشا بیویستبووایە شتێك بڵێت، کاتێك ئەم دیارییە دەگمەنەی پێشکەشی پاشا کرد، نووسین وەکو فارماکۆنێك.

***"بەڵام تووت، بەتایبەتی، قسەی نەکردەوە.***

***بڕیاری خواوەندی گەورەی بەبێ وەڵام هێشتەوە."***

دوای ئەوەی ئەفلاتون دەرمانخانەکەی داخست، کشایەوە بەر سێبەر. هەندێك هەنگاوی نا لەنێو تاریکیدا، ڕووەو قووڵایی دەرمانخانەکەو، خۆی بەسەر فارماکۆندا شۆڕ کردەوەو بڕیاریدا شیبکاتەوە.

هەموو دەرمانخانەکە لەنێو قووڵایی ئەم عەقارەدا دەلەرزی، خەیاڵی داڕمانی دووبارە دەکردەوە.

لێرەدا شیکەرەوە دەیەوێت دوو جۆرە دووبارە بوونەوە لەیەکتری جیا بکاتەوە.

دەیەوێت جیاکاری بخاتە نێوان "دووبار بوونەوە"ی باش و "دووبارە بوونەوە"ی خراپ، حەقیقی و ساختە. جارێکیتریش دادێتەوەو شۆڕ دەبێتەوە، دەبینێت هەردووکیان خۆیان لەنێو یەکتریدا دووبارە دەکەنەوە.

بەدەستێك فارماکۆن، بەدەستەکەی تریش قەلەم، ئەفلاتون دێت بەهێمنی و بەدەنگێکی نزم گەمەی دەرمانەکان دەنووسێتەوە. کەش و هەوای دەرمانخانە داخراوەکە زیاد لەپێویست ئەم مۆنۆلۆجە ناوخۆییە گەورە دەکەن. وشەکان دەردەپەڕن، ڕستەو زاراوەو گوزارشت بەنێو پانتایی دەرمانخانەکەدا بڵاو دەبنەوە، بەنێو ڕاڕەوەکاندا تێدەپەڕن و کات دەگرنەوە بۆ زەمەنی گەشتێك بەنێو پانتایی دەرمانخانەدا. هەندێکیان خۆیان دووبارە دەکەنەوەو، هەندێکی تریشیان بەریەك دەکەون و دەنگیان لێوە دێت، دژ بەیەك دەوەستنەوە، چیرۆکی تازە دروست دەکەن، دەبنە وەڵام و دێنەوە، لەنێوان خۆیاندا دێن و دەچن.

هەندێکیان خۆیان لەپەنای هەندێکی تریاندا دەشارنەوە، پێوەندییەکی جەوانی دروست دەکەن وەکو ئەوەی لەوتووێژدا بن، وتووێژێکی پڕ لەمانا. چیرۆکێکی تەواوە، تەواوی فەلسەفە.

"e eke touton ton logon"[1] دەنگی ئەم وشانە لەناوەوەمدا دەزرنگێنەوەو ڕێگا نادەن گوێبیستی هیچ شتێکی تر بم.

لەنێو ئەم دەنگە زرنگاوانەدا، لەکاتی تێپەڕین بەم بڕگە فەقیهی و زمانەوانییانەدا، خەریکە ئەم شتانە لەیەکتری جیا دەکاتەوە کە دێن، بەڵام دووبارە دەنگێکی پڕ لەژاوەژاو دێت و بەتووندی دەڵێت:" لۆگۆس خودی خۆی خۆش دەوێت. لۆگۆس واتا لێدان ...". بەم شێوەیە زاراوەی فارماکۆن دەلالەت دەبێت لەلێدانی شەیتانانە، یا ئەوەی بەکاردێت بۆ بەرگرتن لەم لێدانە، لێدانێکی بەهێز، پرۆسەیەکی بەزۆری، لێدانێکی سەرکێشانە، لێدانێکی پیلان بۆ دانراو، پیلان و خیانەتکاری، لێدانێکی پووچ و بەتاڵ، لێدان لەئاو ــ کە بەلاش دەڕوات، لێدانێکی خۆوبەختانە.

تووت نووسینی داهێنا، ڕۆژنامە، زار ــ kubeia، لێدانی ڕۆژنامەگەرییانە، لێدانی شانۆگەرییانە، ڕووداوێکی لەناکاو، لێدانی نووسین، لێدان و فرێدانی زار، لێدانێکی دووانە ـ kolaphos ... gluph ... colpus، لێدان، مووس، تیغ،

---

[1] ) وەکو ئەوەی هەر لەرەسەتاوە پێڕەومان لێکردووە، ئێمەش وەکو دریدا لەم شوێنانەدا کە پێویستبوو، دەقی نووسراوی یۆنانی وەکو خۆی دەنووسینەوە، بەڕەچاوکردنی هەندێك گۆڕانی پیتەکان کە ئێمە نەمانتوانیوە وەکو خۆی پێڕەوی بکەین، بەڵام بێگومان ماناکەی دەگەیەنێت.

لێکردنەوەی پێستی سەر ــ khryse, khrysolithe, khrysologie، زێر، بەردی زێڕین، زێڕین.

ئەفلاتون گوێیەکانی خۆی دادەخات تاوەکو باشتر قسەکانی خۆی ببیستێت، باشتر ببینێت، باشتر شیبکاتەوە. دەیەوێت جیاکاری بکات لەنێوان دوو دووبارە بوونەوە.

بەدوای زێڕدا دەگەڕێت. Pollakis de legomena kai aei akoumena، پێویستی بەگوتەزای زۆری دووبارە بۆوە هەیە، وانەی بەردەوام، چەندین ساڵ، ئینجا هەر ئەوەتە، دوای هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆر زۆر، ڕەنگە مرۆڤ بتوانێت پاکیان بکاتەوە، وەکو چۆن زێڕ لەنێو ئاودا پاك دەکرێتەوە. بەدوای بەردی فەلسەفەکاراندا دەگەڕێت، بەدوای "پرنسیپێکی زێڕین".

پێویستە دوو جۆرە دووبارە بوونەوە لەیەکتری جیا بکرێتەوە.

- بەڵام ئەمانە بەردەوام یەکتری دووبارە دەکەنەوەو شوێنی یەکتری پڕ دەکەنەوەو دەگرنەوە.
- نەخێر، ئەوانە نمایندەی یەکتری ناکەن، مادام یەکێکیان دەبێتە زیادەو دەچێتە سەر ئەویتریان ....
- بەتەواوی ...

پێویستە ئەوەش تۆمار بکرێت. تەواوبوونی ئەم نامەیەی دووەم:" کەواتە جوان بیر لەوە بکەرەوەو ئاگات لەخۆت بێت و وریا بە لەوەی نەوەکو ڕۆژێك پەشیمان بیتەوە لەم کارەی ئیمڕۆ وەکو شتێکی عەیبدارانە ناوی دەرکردووە. گەورەترین وریا بوون بریتییە لەنەنووسین، بەڵکو پاراستن و ئەزبەرکردنە لەنێو

دلّدا ـ to me graphein all ekmanthanein، چونکە ئەستەمە دەقی نووسراو نەکەونە بەردەستی ڕای گشتی. بۆیە من خۆم، هەرگیز ئەم شتانەم نەنووسی ـ oudestin sungramma Platonos ouden oud oudestai، هیچ نووسراوێکی ئەفلاتون بوونی نییەو هەرگیز بوونیشی نابێت. ئەوەی ئیمڕۆ لەژێر ئەم ناوە دەردەکەوێت ـ Sokratous estin kalou kai neou gegonotos ئەوە هی سوقراتە لەکاتی لاوی و خۆشیدا. ماڵئاوا، بەقسەم بکە، هەر کات ئەم نامەیەت خوێندەوەو جارێکی تریش خوێندتەوە، بیسووتێنە...".

– هیوادارم ئەمە نەفەوتێت، ئەم کۆپییە، بەخێرایی. گرافیتا،[1] کاربۆن، هەر کات ئەم نامەیەت خوێندەوە ... بیسووتێنە. خۆڵەمیش هەیە لێرەدا. ئێستاش پێویست دەکات لەنێوان دوو دووبارە بوونەوە جیاکاری بکەین...

شەو تێپەڕ دەبێت، لەگەڵ بەیاندا، گوێبیستی دەنگی دەرگا دەبێت، پێدەچێت ئەمجارەیان کەسێك بێت لەدەرەوە لەدەرگا بدات، دەنگی دەرگا دێت ....

دووجار ..... چوارجار .....

– بەڵام ڕەنگە ئەوە هەر زیندە خەون بێت، خەونێك، بەشێك لەخەون، دەنگدانەوەی شەو بێت، ئەم شانۆیەی تر، دەنگی دەرگای دەرەوە ...

# کۆتایی

[1] جۆرێکە لەکاربۆن، ڕەشەو قەڵەمی ڕەساسی لێ دروست دەکرێت.

# پاشکۆ

## نامە بۆ هاوڕێیەکی ژاپۆنی[1]

## لەبارەی زاراوەو چەمکی هەڵوەشاندنەوە

[1]) پرۆفیسۆر ئۆزتسۆ کەسێکی ژاپۆنییەو سەرسام بوو بەهەڵوەشاندنەوەگەرایی جاك دریداو هەولێدەدا هەڵوەشاندنەوە بەکۆمەڵگەی ژاپۆنی بناسێنێت، چەند نامەیەك بۆ دریدا دەنووسێت تاوەکو باشتر تێبگات لەهەڵوەشاندنەوە، ئەو نامەیەی جاك دریدا بەیەکێك لەباشترین شرۆڤەکانی خودی جاك دادەنرێت لەبارەی هەڵوەشاندنەوە بۆیە لەسەر ڕەزامەندی خۆی ئەو نامەیە لەنێو دەقی عەرەبی کتێبی "نووسین و جیاوازی" دانراوەو جێگای بۆ کراوەتەوە. ئێمەش لەڕوانگەی گرنگی ئەو نامەیەو جوانی شرۆڤەکانی جاك دریدا لێرەدا وەکو خۆی دایدەنێینەوە.

ئازیزم پرۆفیسۆر ئۆزتسۆ

کاتێك یەکترمان بینی، بەڵێنم پێدای هەندێك تێڕامانی سەرەتایی خۆمت بۆ بنووسم لەبارەی وشەی هەڵوەشاندنەوە ـــ deconstruction. مەسەلەکە بەگشتی پەیوەستبوو بەهەندێك تێبینی سەرەتایی لەبارەی ئەگەری وەرگێڕانی ئەو زاراوەیە بۆسەر زمانی ژاپۆنی و، هەوڵدان بەلایەنی کەم بۆ پێشکەشکردنی دەستنیشانکردنێکی نێگەتیڤانە بۆ ئەو دەلالەت و مانایانەی کە هاوشانی ئەو زاراوەیەن و پێویستە ئەوەندەی بکرێت خۆیان لێ بەدوور بگیرێت.

کەواتە پرسیارەکەمان بەو شێوەیە دەبێت:" هەڵوەشاندنەوە چ شتێك نییە؟"، یا بەمانایەکی تر:" دەبێت چی نەبێت؟". من لێرەدا جەخت دەکەمە سەر ئەو دوو گوزارشتە:" ئەگەر بکرێت" و "نابێت"، چونکە ئێمە ئەگەر بمانەوێت سەرەتا لەسەر ئاستەنگ و زەحمەتییەکانی بەردەم وەرگێڕان بووەستین ــ پرسیاری هەڵوەشاندنەوەش لەوسەر تا ئەوسەر پرسیاری وەرگێڕانە، پرسیاری زمانی چەمکەکان و ناوەڕۆکی چەمکگەرایی ئەو میتافیزیکایەیە کە ناونراوە خۆرئاوایی ــ ئەوە ڕەنگە وا پێویست بکات بەبڕواهێنان دەست پێنەکەین بەوەی ــ ئەوەش دەبێتە شتێکی زۆر ساکارانە ـــ کە زاراوەی هەڵوەشاندنەوە لەنێو زمانی فەرەنسیدا دەلالەتێکی زۆر ڕوون و ئاشکراو بێ کێشەی هەیە.

لەنێو زمانی پێشتری مندا کێشەیەکی گەورەو ئاڵۆزی وەرگێڕان هەیە، لەوەی کە ئێمە چیمان مەبەستە لێرەو لەوێ لەمیانەی ئەو وشەیەداو ــ مەبەستی زاراوەی هەڵوەشاندنەوەیە ــ لەمیانەی بەکارهێنانی ئەو وشەیە خۆی و سەرچاوەی سەرهەڵدانیدا. دیارە شتەکان لەنێو زمانی فەڕەنسیدا لەسیاقێکەوە بۆ سیاقێکی تر دەگۆڕێن، هەر خودی خۆیان دەگۆڕێن. بگرە لەوەش زیاتر، ئەو وشەیە خۆی ئێستا لەنێو نێوەندی ئەڵمانی و ئینگلیزی و بەتایبەتیش ئەمریکیدا پەیوەستبووە بەکۆمەڵێك دەلالەتی هاوشان و سرووش و بەهای سۆزدارییانەی زۆر جیاواز. بێگومان شیکردنەوەی ئەو بەهایانە زۆر بەسوود دەبێت، ڕەنگە حەقی کارێکی تری تەواوو جیاوازیشی هەبێت.

من کاتێك ئەو زاراوەیەم هەڵبژارد، یا بابڵێین کاتێك ئەو زاراوەیە خۆی بەسەرمندا سەپاند ــ پێم وابێت ئەو کاتە بوو کە خەریکی نووسینی کتێبی (لەبارەی گراماتۆلۆژیا De la grammatologie)[1] بووم ــ هەرگیز پێشبینی ئەوەم نەدەکرد ڕۆژێك دێت بەو شێوە سێنتەرییە دانی پێدابنرێت لەبارەی گوتارەوە، چونکە ئەو کات هەر من بایەخم پێدەدا. ئەو کات لەنێو کۆمەڵێك شتدا، سەرقاڵی ئەوە بووم بزانم چۆن هەردوو زاراوەی تایبەتی هایدگەری ــ Destruction و Abbou ــ بۆ نێو وتاری تایبەتی خۆم وەربگێڕم.

---

[1]) یەکێکە لەکتێبە هەرە ناودارەکانی دریداو لەوێدا زیاتر لەهەموو کتێبەکانی کار لەسەر چەمکی نووسین و ئاخافتن دەکات، ئێمە نابێت ئەوەش لەبیر بکەین کە دریدا لەنێو کتێبی "دەرمانخانەی ئەفلاتون" یشدا بەوردی کار لەسەر ئەو چرکەساتەدا دەکات.

هـەردوو زاراوە لـەنێو ئـەو سـیاقەدا دەلالـەتی كردەكیـان دەبەخشـی بەسـەر بونیاد، یا تەلارسـازی تەقلیـدی چەمكە دامەزرێنـەرەكانی ئـەنتۆلۆژیا، یا بەسـەر میتافیزیكـای خۆرئـاوایی پراكتیـك دەكـران. بـەڵام Destruction لـەنێو زمـانی فەرەنسـیدا بەشـێوەیەكی زۆر ڕوون و ئاشـكرا دەلالـەت بـوو لەڕووخانـدن وەكـو كورتكردنـەوەو لـەناوبردنێكی نێگەتیڤانـە كـە ڕەنگـە نـزیكتر بووبێـت لـەزاراوەی demolition ـ واتا ڕووخانـدن لـەلای نیچـە، زیـاتر لـەو ڕاڤەكردنـە هایدگەرییـەو جۆرە خوێندنەوەیەی من پێشـنیارم كردبـوو، بۆیـە بـەلاوەم نـا. بیرمـە زۆر گـەڕام تاوەكو بزانم ئایا ئەو زاراوەیە Destruction ـ هەڵوەشاندنەوە كـە لەڕووكەشـدا بەشـێوەیەكی زۆر ڕێكـەوت بەخەیاڵمـدا هـات، دەڵـێم بـۆ زانینـی ئـەوەی كـە ئایـا بەڕاسـتی لەڕەگوڕیشـەدا زاراوەو وشـەیەكی فەرەنسـییە؟! بۆیـە هەڵسـام بـەنێو فەرهەنگەكانـدا گـەڕام و لـەنێو فەرهـەنگی لـیترێ دۆزیمـەوە، بینـیم لەلایـەنی سێنتاكس و زمانەوانی و ڕەوانبێژیـدا پەیوەسـتە بـەئامرازێكی میكانیكییانـە. ئـەو جـۆرە ڕاڤـەكردن و لێكنزیكییـە لـەئامێرو میكانیـك خۆشـحاڵی كـردم و بینـیم زۆر گونجاوو تەبا دێتـەوە لەگـەڵ ئـەوەی بەلایـەنی كـەم مـن دەمویسـت ئامـاژەی بـۆ بكەم.[1]

---

١) ئەو میكانییەتەی دریدا ئاماژەی بۆ دەكات نزیكە لەیاری میكـانۆی منـداڵان، چـونكە یـاری میكانۆ بریتییە لەكۆمەڵێك پارچە منداڵ دەتوانێت بـەئارەزووی خـۆی گەمـەیان پێبكـات و ئەرك و ڕۆڵ و فرمانی پارچەكانیش لەگەمەیەكەوە بۆ گەمەیەكی تر دەگۆڕێن، بۆیـە دریـدا ئاماژە بۆ ئەو چەمكە دەكات چونكە مەبەستییەتی بنـەماكانی گوتـارو پارچـەكانی گوتـار لەیەكتری دابڕێنێت و جارێكی تر شرۆڤەیان بكاتەوە لەدەرەوەی سیستەمی باوی گوتـاری داڕێژراودا.

ڕێگام بدە با پێناسەی زاراوەکەت بۆ بگوازمەوە وەکو ئەوەی لەنێو ئەو فەرهەنگەدا هاتووە:" Deconstruction ـ کردەی هەڵوەشاندنەوە، زاراوەیەکی سێنتاکسییە. بریتییە لەشێواندنی بونیادی وشەسازی گوزارشتێك. لومار Lemere:" لەبارەی چۆنییەتی فێربوونی زمانەکان" بەشی ١٧ لەوانەکانی فێربوونی زمانی لاتینی Deconstruire:

١) بریتییە لەهەڵوەشاندنەوەی شتێکی یەکگرتوو بۆ سەر چەند پارچەیەك. هەڵوەشاندنەوەی پارچەکانی ئامێرێکە لەمیانەی گواستنەوەیدا بۆ شوێنێکی تر.

٢) زاراوەیەکی سێنتاکسییە، بریتییە لەهەڵوەشاندنەوەی ڕستەو نیشاندانیان وەکو پەخشان لەمیانەی ئیلغاکردنەوەی کێش و سەروادا.

٣) se deconstruite: هەڵوەشاندنەوەو لێککردنەوە، بریتییە لەوەی شتێك بونیادی خۆی لەدەست بدات. لێکۆڵینەوە تازەکانی زمانزانی پێمان دەڵێن گوایە زمانێك هەبووە لەیەکێك لەوڵاتەکانی خۆرهەڵات زۆر پێگەیشتوو بووە، ئینجا هەر لەخۆیەوە بەهۆی یاسای گۆڕانی سروشتی شیبۆتەوەو هەڵوەشاوەتەوە.

بێگومان بۆ ئەوەی گەیشتنی ئەو چەمکە مانابەخش و دەلالەتداربێت، پێویستە هەموو ئەوانە وەربگێڕدرێتە سەر زمانی ژاپۆنی، ئەوەش کێشەکە گەورەتر دەکات. دیارە پێویستیش ناکات ئەوەت پێبڵێم کە ئەو دەلالەتانەی لیترێ باسیان لێوە دەکات، لەلای من گرنگن بەهۆی پێوەندی توونـدوتۆڵیان لەگەڵ ئەوەی کە من دەمەوێت بیڵێم. دیارە بۆ من ئەگەر بەشێوەیەکی مەجازییانە بدوێم، هەر تەنیا لەهەندێك ناوچەو نموونەدا گرنگبوون، نەوەکو هەموو ئەوەی کە من حەزم دەکردوو دەمخواست لەهەڵوەشاندنەوەدا.

ئـەو داخوازییـەی مـن تـەنیا بەنموونەیـەکی زمانـەوانی ــ سێنتاکسـی کۆتـایی نایەت، بگرە نموونەیەکی هێماگەراییانەش لەخۆی ناگرێت، ئـەوە لـەپاڵ نموونـەی ئامێرگەراییدا. خودی ئەو نموونانە خۆیان دەبووایە بخرێنە ژێر باری بەقسەهێنانی هەڵوەشـاندنەوەخوازانە. ڕاسـتە ئـەو نموونانـە دواتـر بوونـە هـۆی زۆر خـراپ تێگەیشتن لەبارەی زاراوەی هەڵوەشاندنەوەو ئەو چەمکەی کە هەندێك کەس پێـی خۆشبوو بۆی چڕ بکاتەوەو تێیدا کورتی بکاتەوە.

دەبێت ئەوەش بڵێم کە وشەکە خۆی پێشتر لەفەڕەنسا زۆر کەم بەکاردەهێنراو ناسـراو نـەبوو، بۆیـە دەبووایـە سـەرلەنوێ بەشـێوەیەك لەشـێوەکان لێکبـدرێت و دروسـتبکرێتەوە. تەنانـەت بـەهای بەکارهێنانیشـی دەستنیشـانکراو بـوو بـەو گوتارەی ئەو کات ئەزموون دەکرا "لەبارەی گڕاماتۆلۆژیا"و لێرەوە دەستیپێکرد. ئـەو بـەهای بەکارهێنانـەی ئێسـتا مـن دەمـەوێت دەستنیشـانی بکـەم، نـەوەکو مانایـەکی بەراییانـە بـۆ هـەڵهێنجراوێك دەگەڕێتـەوە لـەدەرەوەی هـەموو ستراتیژییەتێکی سیاقیدایە.[1]

لێرەدا مـن دوو وشـەی تـر لـەبارەی سیاق context دەخەمـە ڕوو. ئـەو کاتـە بونیادگەری تەواو باڵادەستبوو،[2] هەڵوەشاندنەوەش بـەو ئاڕاسـتەیەدا دەڕۆیشـت

---

[1]) سیاق Contexte لەڕوانگەی دریدا بریتییە لەتـەواوی ئـەو نێوەنـدەی کـە دەقێکـی تێدا سەرهەڵدەدات کە بەتەنیا ڕەوشی کولتووری و کۆمەڵایـەتی و سیاسـی ناگرێتـەوە، بـەڵکو کۆی گشتی هەموو دەق و هێما جولاوەکانی دەوروبەریشـی دەگرێتـەوە، تەنانـەت ئـەوەی دواوەشی دەگرێتەوە، بۆیە دریدا هەندێکجار بەمانای سیاق باسی دەقی فراوان دەکات.

[2]) مەبەست ساڵانی شەستەکانی سـەدەی بیسـتەمە کـە دریـدا تێیـدا خـەریکی داڕشتنی ئـەو چەمکە بوو.

زاراوەکــە ئاماژەیـــە بــۆ سەرنجڕاکێشـــانێکی دیـــاریکراو لـــەبارەی بونیادەکـــان structures کە زۆر بەسادەیی نە هـزرو نـە شـێوەو نەلێکدراوو نەسـەمتە. بۆیـە ئەوکاتـە هەڵوەشـاندنەوەش بزوتنەوەیـەکی بونیادگەرییانـە بـوو. یـا بەهـەرحاڵ، بزوتنەوەیـەك بـوو دەیویسـت ڕۆڵێکـی دیـاریکراو ببینێـت لـەنێو ئیشـکالییەتی بونیادگەریدا.

بـەڵام لەهــەمان کاتیشــدا بزوتنەوەیــەکی دژە بونیادگــەری بــوو، یــەکێك لەبنەماکانی سەرکەوتنیشی بۆ ئەو خاڵە ئاڵۆزە دەگەڕێتەوە. ئەو کاتە مەسـەلەکە پەیوەسـتبوو بەکردنـەوە، لێککردنـەوەی پاشمـاوەی بونیادەکـان، هـەموجۆرە بونیادێك: زمانەوانی، لۆگۆسێنترالیستی،[1] فۆنۆسێنترالیستی.[2] چونکە ئـەو کاتـە بونیادگەری چوو بووە ژێر باری نموونەی زمانـەوانی، زمـانزانی یـا زمانـەوەری کـە ناسراو بوو زمانزانی بونیادگەری، هەندێکجاریش بەزمانزانی سۆسـێری نـاودەبرا ــ فردیناند دو سۆسێر زمانزان و سیمیۆلۆژستێکی سویسری بوو.[3]

---

[1]) لۆگۆسێنترالیزم بەمانای گرنگیدان بەعەقڵ دێت بەڕادەیەك عەقڵ دەبێتە سێنتەری هـەموو شتەکان، ئەو زاراوەیە لەدوو بەش پێکدێت: لۆگۆ، بەمانای لۆگـۆس لـەزمانی یۆنـانی واتـا عەقڵ، سێنترالیزمیش بەمانای چەقگیری و ناوەنـدێتی. سـێنترالیزم سـەمتێکی کولتـووری بارگـاویکراوە بەکۆمـەڵێك مانـای ئـایینی و هـزری و ئـەتنی و لـەباروددۆخێکی مێـژوویی دیاریکراودا سەری هەڵداوە.

[2]) فۆنۆسێنترالیزم بەمانای گرنگیدان دێت بەدەنگ بەڕادەیەك دەنگ دەبێتە سێنتەری هـەموو شتەکان. ئەو زاراوەیە لەدوو بەش پێکدێت، فۆنۆ بەمانای دەنگ، سێنترالیزمیش بـەمانای چەقگیری و ناوەندێتی.

[3]) بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەو چەمکانە بڕوانە کتێبی" جاك دریداو هەڵوەشاندنەوە، ڕێـبین ڕەسوڵ ئیسماعیل، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، چاپی یەکەم، ٢٠١٠.

لێرەوە لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا جۆرە ئاوێتەو تێکەڵاوبوونێك دروستبوو لەنێوان بابەتی هەڵوەشاندنەوەو پۆست بونیادگەریدا Post-structuralisme. با ئەوەشت پێبڵێم، ئەو زاراوەیەی دوایی لەفەرەنسا ناسراو نەبوو، مەگەر ئەو کاتە نەبێت کە لەئەمریکاوە گەڕایەوە بۆ فەرەنسا. بەڵام لێکردنەوەی بونیادەکان و هەڵوەشاندنەوەیان و داماڵینیان لەپاشماوەکان، ئەو بزاڤە بەمانایەك لەماناکان مێژوویکی ترە لەبزاڤی بونیادگەری کە خۆی بینییەوە لەناکاو خراوەتە ژێر پرسیار، چونکە هەموو ئەو ڕێوشوێنانە نێگەتیڤانە نەبوون. لەبری ڕووخاندن دەبووایە لەوە تێبگەین کە چۆن دەکرێت کۆی گشتی شتێك پێکبێت و دروستبێت. واتا لەپێناو ئەوەدا، لەپێناو سەرلەنوێ دروستکردنەوەدا. لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا ڕوخساری نێگەتیڤی ئەو بزاڤە ئەستەمە بسڕێتەوە، بەتایبەتیش کاتێك لەکاتی خوێندنەوەی سێنتاکسی وشەکەدا لەمیانە "de"،[1] ئەگەرچی دەتوانێت دەلالەت بێت لەمانای هەڵکشانێکی ڕێژەییانە ــ هەڵکشان لەدرەختی نەسەبی وشە ـ زیاتر لەوەی کاری ڕووخاندن بێت.

بۆیە ئەو زاراوەیە، بەلایەنی کەم بەتەنیا پێم وابوو هەرگیز بەس نییە ــ بەڵام پێم بڵێ هیچ وشەیەك هەیە بەتەنیا بەس بێت؟ کاتێك بەردەوام لەنێو گوتاردا گەمارۆ دەدرێت. ئینجا ڕوخساری نێگەتیڤانەی زاراوەی هەڵوەشاندنەوە بەردەوام

---

[1] ) ئەو (de) یە کاری نەفیکردن دەکات و مانای وشەکە پێچەوانە دەکاتەوە لەنێو زمانی فەرەنسیدا، چونکە خۆی ئەسڵی وشەکە بریتییە لە ( construction) واتا بونیادنان، بەڵام کاتێك ئەو (de) یەی دەکەوێتە پێش دەبێتە (deconstruction) واتا هەڵوەشاندنەوەو ڕووخاندن.

زەحمەتـــە بســـڕێتەوە، چـــونکە لـــەکاتی مومارەســـەکردنی هەڵوەشـــاندنەوەدا پێویســـتبوو لەســـەرم وەکـــو ئـــەوەی لێـــرە دەیکـــەم، زۆرتـــر وریـــاو وشـــیاربم و بەشێوەیەکی یەکجارەکیش هەموو چەمکەکانی کولتووری فەلسەفی بـەلاوە بنـێم، لەگـەڵ جەختکردنـەوەی بـەردەوامم لەسـەرئەوەی کـە دەبێـت لەمیانـەی کـردەی بەلاوەناندا بگەڕێمـەوە سـەریان. ئـەوکات زۆر بەپەلـە دەگـوترا گوایـە ئـەوەی مـن دەیکـەم جۆرێکـە لـەلاهوتی نێگەتیڤانـە: ئـەو قسـەیەش نـە ڕاسـتەو، نـە هەڵەیـە، منیش بانگەشەی ئەوە ناکەم گوایە ئامادەم بچمە نێو ئـەو وتووێـژە، بۆیـە لێـرەدا بەلاوەی دەنێم و پێویست ناکات بچمە سەری.(١)

بەهەرحاڵ، هەڵوەشـاندنەوە سـەرەڕای ڕوخسـاریش، کەچـی نـە شـیکردنەوەیە analyse، نـە ڕەخنەیـە critique، بۆیـە پێویسـتە لەسـەر وەرگێـڕان ڕەچـاوی ئەوەش بکات. شیکردنەوە نییە، چونکە بەتایبەتی هەڵوەشاندنەوەی توخمـەکانی

١) هەندێك کەس هەڵوەشاندنەوەگەرایی دریـدایان وەکـو لاهـوتێکی نێگـەتیف تەماشـا دەکـرد بەلایـەنی کـەم لەڕوانگـەی بونیـادی سـێنتاکس و داڕشـتنی زمانەوانییـەوە، چـونکە چـۆن کەسێکی سەر بەڕەوتی لاهوتی نێگەتیف ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە خـوا نـە ئەوەیـەو نـە ئەوەیترە، ئـەوە دریـداش ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکـات کـە هەڵوەشـاندنەوە نـە ئەوەیـەو نـە ئەوەیترەو ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات کە جیاوازی نە ئامادەگییەو نە نـا ئامـادەگی. دریـدا ئاماژە بـۆ ئـەوە دەکـات کـە ئەگـەر لایـەنگرانی ڕەوتـی لاهـوتی نێگـەتیف لەمیانـەی ئـەو کارەیاندا بیانەوێت بەشێوەیەکی تر نمایشی سیفەتەکانی خوا بکەن بەرزتر بێت لەوەی تـا ئێستا باسکراوەو پێیدراوە لەلایەنی لاهوتی پۆزەتیڤەوە، ئـەوە هەڵوەشـاندنەوە نایـەوێت لەپەنای ئـەو کارەیـدا میتایـەکی تـر بـۆ فەلسـەفەی میتـافیزیکی خۆرئـاوا بونیـاد بنێـت و نازانێـت ئـەو میتایـەش چـییە. هـەر ئەوەنـدە کارییـەتی تـاوەکو بونیـادە ئامادەکـان هەڵبوەشێنێتەوە.

بونیادێك مانای گێڕانەوەی نییە بۆ توخمی سادەو ساكاری سەرەتایی، بۆ ئەسڵێك كە بێ چارەسەرە. ئەو بەهایە خۆی لەگەڵ بەهای شیكردنەوەدا بریتین لەو توخمە فەلسەفیانەی دەچنە ژێر باری هەڵوەشاندنەوە. ڕەخنەش نییە، نە بەمانا گشتییەكەی، نە بەمانا كانتییەكەی ـــ مەبەست كانتی فەلسەفەكاری ئەڵمانییە. دەستەی krinein، یا krisis بڕیارو هەڵبژاردن و وحوكمدان و دەستنیشانكردن خۆی وەكو ئامرازی ڕەخنەی ترانسندتالی یەكێكە لەو بابەت و شتە بنچینەییانەی هەڵوەشاندنەوە دەیانكاتە ئامانج.

هەمان شتیش لەبارەی میتۆدەوە methode دەڵێم. هەڵوەشاندنەوە میتۆد نییەو نابێت بكرێتە میتۆدیش، بەتایبەتی ئەگەر جەختمان كردە سەر ئەو زاراوەیە لەلایەنی دەلالەتی ئیجرائی و تەكنیكییەوە. ڕاستە لەنێو هەندێك نێوەندی زانكۆیی و كولتووریدا ـ لێرەدا من بیر لەویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەكەمەوە ـــ خوازەی تەكنیكی و میتۆدگەرایانەی ئێستا وا دەردەكەوێت وەكو ئەوەی پەیوەستبن بەزاراوەی هەڵوەشاندنەوە، ئەوەش خەڵك بەهەڵەو لاڕێگادا دەبات. ئالێرەوە ئەو وتووێژە سەری هەڵداو لەنێو هەندێك نێوەندا گەشەیكرد: ئەرێ باشە دەكرێت هەڵوەشاندنەوە بكرێتە میتۆدێك بۆ خوێندنەوەو ڕاڤەكردن؟ دەتوانێت ڕێگا بدات بەو شێوەیە لەخۆ بگیرێت و ماڵی بكرێت لەلایەن دامەزراوە ئەكادیمییەكانەوە؟

هەر ئەوەندە بەسە كە بڵێم هەڵوەشاندنەوە ناكرێت كورتبكرێتەوە بۆ ئامرازێكی میتۆدی، یا كۆمەڵێك بنەماو ڕێساو ڕێوشوێن كە توانای كۆپیكردن و گواستنەوەیان هەبێت. ئەوەندە بەسە بڵێم هەموو ڕووداوێكی

هەڵوەشاندنەوەخوازانە ڕووداوێکی دەگمەنەو گرمۆڵەبوونە لەنێو زمانێکی تایبەت و واژووێکی تایبەتدا. بۆیە دەبێت دەستنیشانی ئەوەش بکەین کە هەڵوەشاندنەوە تەنانەت کردەو کاریش نییە. لەبەرئەوەنا کە ڕەنگە هەندێك نێگەتیف بێت، یا هەڵچوونێکی پێوە دیار بێت، ـ نێگەتیڤتر لەخودی نێگەتیف وەکو ئەوەی بلانشۆ دەیگۆت، نێگەتیف لەبەرانبەر هەڵچوون دادەنرێت. لەبەرئەوەش نا کە ناگەڕێتەوە بۆ لای خودێکی کارای دیاریکراو ـ تاك بێت یا کۆ، کە خێرا دەسپێشخەری بکات و بەسەر دەقێك یا شتێکی تردا پراکتیکی بکات.

هەڵوەشاندنەوە هەر ڕوودەدات، ڕووداوێکە پرس بەکەس ناکات، چاوەڕوانی هیچ وشیارییەك و ڕێکخستنێك ناکات لەلایەن کەسێکی کاراوە، یا لەلایەنی مۆدێرنەوە. شتەکان لەهەڵوەشاندنەوەدان، شتەکان خۆیان هەڵدەوەشێنەوە، ئەو شتەش لێرەدا شتێکی ناشەخسی نییە تاوەکو بکرێت بخرێتە بەرانبەر خودێکی ئێستایی دیاریکراو. ئەو شتە وا هەڵدەوەشێتەوە، لیترێ دەڵێت:" هەڵدەوەشێتەوە، بونیادی خۆی لەدەستدەدات se deconstruire ...perde sa construction، ئەو "se" یە لەنێو کرداری "se deconstruire" دا دەلالەت نییە لەئاوەژوو بوونەوەی "من" یا وشیاری، بەڵکو ئەوە هەموو مەتەڵەکە لەخۆ دەگرێت.

تێبینی دەکەم هاوڕێم، کاتێك دەمەوێت وشەکەت بۆ ڕوونتر بکەمەوە تاوەکو یارمەتیت بدەم لەوەرگێڕانیدا، ئەوە لەڕاستیدا من ئەرکی تۆ قورستر دەکەم و زەحمەتییەکان زیاتر دەبێت:"کارە زەحمەت و ئەستەمەکەی وەرگێر" وەکو ئەوەی بنیامین باسی دەکات، ئەوەش هەر مانای هەڵوەشاندنەوەیە.

ئەگەر هەڵوەشاندنەوە ئەو کاتە ڕوویدات کە شتێك ڕوودەدات، ئەو کاتە دێتە بوون کە شتێك دێتە بوون ـ کەواتە ئەوە بەماناو دەق وەکو شێوە بەکارهێنانە باوەکەی نایەت ـ ئەوە پێویستە لەسەرمان بیر لەو شتانە بکەینەوە کە ئەمڕۆ لەنێو جیهاندا ڕوو دەدەن، ئەو شتانەی لەنێو مۆدێرنەدا ڕوو دەدەن، لەو چرکەساتەی کە تێیدا هەڵوەشاندنەوە دەبێتە "بابەت" لەگەڵ زاراوەو بابەت و ستراتیژییەتە بزوێنەرەکەی و ... تاد. من خۆم بەرسڤێکی سادەم لەلا نییە بۆ ئەو پرسیارە قورسە. هەموو ئەوانە نیشانەن، لەهەمان کاتیشدا هەوڵێکن بۆ ڕاڤەکردنی.

ئەگەر بەشێوەی وێناکردنێکی هایدگەرییانەش بێت، ئازایەتی ئەوە ناکەم بڵێم ئێمە ئێستا ئەمڕۆ لەسەردەمی "بوون ـــ لەبارەی ـــ هەڵوەشاندنەوەداین"، "سەردەمێك ـ بۆ بوون ـ لەهەڵوەشاندنەوەدا"، کە ڕەنگە ئەو سەردەمە خۆی ئاشکرا کردبێت، یا خۆی لەنێو سەردەمی تردا شاردبێتەوە. ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە سەردەمییە، بەتایبەتیش ئەو بیرۆکەیەی بڕوای وایە چارنووسی بوون و یەکێتی و فەنابوونی خەریکە خۆی کۆ دەکاتەوە، هەرگیز ئەو بیرکردنەوەیە ناتوانێت جێگەی بڕواو گرێنتی بێت.

تاوەکو زۆر وردبم، دەڵێم زەحمەتە زاراوەی هەڵوەشاندنەوە دیاری بکرێت، کەواتە زەحمەتە وەربگێڕدرێت، لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە هەموو چەمکە دەستنیشان و دیاریکراوەکان و هەموو دەلالەتە فەرهەنگییەکان و بڕگە سێنتاکسییەکان کە لەچرکەیەکی دیاریکراودا خۆیان بەو دەستنیشانکردن و

وەرگێڕانـــە دەبەخشـــن، هـــەر هـــەموویان ملکەچـــی هەڵوەشـــاندنەوەن و هەڵدەوەشێنرێنەوە، ئینجا ڕاستەوخۆ بێت، یا بەشێوەیەکی پێچاوپێچ.

ئەو قسەیە بەسەر وشەی هەڵوەشاندنەوەو یەکێتییەکەشیدا هـەر ڕاستە وەکـو ئەوەی بۆ هەر وشەیەکی تریش هـەر وایـە. کتێبـی "لـەبارەی گڕاماتۆلۆژیا" دێـت بەگشـتی یـەکێتی وشـە دەخاتـە ژێـر پرسـیار لەگـەڵ هـەموو ئـەو ئیمتیازاتانـەی دراوەتـە ئـەو وشـەیە، بەتایبـەتیش لەشـێوەی ناوەکەیـدا. کەواتـە گوتارێـك، یـا بەمانایەکی تر نووسینێك، بەتەنیا دەتوانێت نەداری ئەو وشەیە لەنێو هەر هزرێکدا بـەلاوە بنێـت. هـەموو ڕسـتەیەکی جـۆری هەڵوەشـاندنەوەخوازانەی وەکـو "هەڵوەشاندنەوە ئەوە نییە"، یا "ئەوە هەڵوەشاندنەوەیە" دەبێتـە دەسـپێکێکی نـەگونجاو، یـا بەلایـەنی کـەم بـا بڵـێین سـاختە. تـۆ دەزانـی یـەکێك لـەگرەوە بنچینەییەکانی ئەوەی لـەنێو دەقـدا پێـی دەگوترێـت "هەڵوەشـاندنەوە" سـەرەتا بریتییە لەدەستنیشانکردنی لۆژیکی ئەنتۆلۆژی، لۆژیکی بنـەمای کەسـی ئامـادەی سێیەم یا نا ئامادە:" سین دەبێتە صاد".

وشەی هەڵوەشاندنەوە وەکو هەر وشەیەکی تر بـەهای خـۆی لـەوە وەرناگرێـت کـە بەشـێکە لەزنجیرەیـەك ئەلتـەرناتیڤی مـومکین، یـا ئـەوەی هەنـدێك کـەس زۆر بـەهێمنی نـاوی دەنێـت سـیاق. مـن خـۆم وەکـو ئـەوەی هەوڵمـداوەو هێشـتاش هەوڵدەدەم بنووسم، ئەو زاراوەیـە بەهایـەکی نییـە تـەنیا لەسیاقێکی دیـاریکراودا نـەبێت کـە تێیـدا جێگـای وشـەی تـر بگرێتـەوە، یـا ڕێگـا بەوشـەی تـر بـدات کـە دەستنیشانی بکەن، بۆ نموونە:"نووسین ـ ecriture، یا جێکـەوت ـــ trace، یـا جیاوازی ـ differance، یا زیادە ـ supplement، یـا پـەراوێز ـــ marge، یـا

دەسپێك ـ entame، یا چوارچێوە ــ parergon ... تاد. بێگومان لیستەکە زۆر دوورو درێژەو کۆتایی نایەت، منیش لێرەدا تەنیا هەندێك چەمکم ڕیز کردووە، ئەوەندەش بەتەنیا بەس نییە. دەبووایە ڕستە، یا زنجیرەیەك ڕستە بێنمەوە کە ئەو چەمکانە لەنێو نووسینەکانی مندا دیاری بکات.

ئێستاش: چ شتێك هەڵوەشاندنەوە نییە؟ هەموو شتێك!

ئەی چ شتێك هەڵوەشاندنەوەیە؟ هیچ شتێك!

لەبەر هەموو ئەو هۆیانە، پێم وانییە ئەو وشەیە باش بێت، بەتایبەتیش کاتێك دەزانین زاراوەیەکی جوانیش نییە. ڕاستە هەندێك خزمەتگوزاری پێشکەشکردووە، بەڵام لەنێو ڕەوشێکی زۆرباش دیاریکراودا.

بۆ زانینی ئەوەی کە چ شتێکی سەپاندووە لەنێو زنجیرەیەك ئەلتەرناتیڤی مومکیندا، ئەگەرچی هەر ئەوەندەش بەس نییە، ئەوە پێویستە ئەو ڕەوشە دیاریکراوە شیبکرێتەوەو هەڵبوەشێنرێتەوە، ئەوەش کارێکی سەختەو من لێرەدا ناتوانم ئەو کارە بکەم.

وشەیەکی تر لەکۆتایی ئەو نامەیەدا کە ئێستا وا خەریکە درێژ دەبێت، ئەوەیە کە من پێم وانییە وەرگێڕان ڕووداوێکی لاوەکی بێت لەئاست زمانی ئەسڵی و دەقی ئەسڵیدا. وەکو ئەوەی پێش کەمێکیش باسمکرد، ئەوە هەڵوەشاندنەوە la deconstruction زاراوەیەکە دەکرێت بگۆڕدرێت بەوشەیەکی تر، دەکرێت کۆمەڵێك ئەلتەرناتیڤی ترمان هەبێت لەنێو زمانەکانی تردا. دەکرێت کارێکی وا لەنێو زمانێك و زمانێکی تردا بێتەدی. دیارە هەڵوەشاندنەوە شانسی هەیە ئەگەر لەنێو زمانی ژاپۆنیدا زاراوەیەکی تری هاوشێوەی هەبێت، خۆی بێت، یا شتێکی

تر، تاوەکو بکرێت گوزارشتی لێبکرێت بۆ قسەکردن لەبارەی هەڵوەشاندنەوەو ڕاکێشانی بۆ نێو شوێن و پێگەی تازەو نووسینی لەنێو گوزارشت و وشەیەکی جوانتردا.

کاتێك باسی ئەو جۆرە نووسینەی تر دەکەم کە ڕەنگە جوانتر بێت، ئەوە من وا لەوەرگێڕان دەگەم وەکو ئەوەی سەرکێشی هۆنراوەو دەرفەتی دەرکەوتنییەتی بەزمانێکی تر. چۆن زاراوەی هۆنراوە وەردەگێڕین؟ چۆن هۆنراوەیەك وەردەگێڕین؟

ئازیزم پرۆفیسۆر ئۆزتسۆ، ڕێزو خۆشەویستی زۆرم بفەرمووە.

جاك دریدا

# پێرست

دەرمانخانەی ئەفلاتون،
شۆڕبوونەوەیە بەنێو قووڵایی
مێژووی هزرو فەلسەفەی
یۆنانی، خوێندنەوەیەکی تازەیە
بۆ فەلسەفەو تێزێکی فەلسەفی
کۆن کە زیاتر لەدوو هەزارو
پێنج سەد ساڵی بەسەردا
تێپەڕیوە. بەرهەمهێنانی
تێگەیشتنێکی تازەیە بۆ کۆمەڵێک
بۆچوونی ئەفلاتونی لەبارەی
کێشەی نێوان نووسین و
ئاخافتن، بەرز ڕاگرتنی ئاخافتن
و بەکەم سەیرکردنی نووسین
و نووسەران.

# Plato's Pharmacy

نرخ: ٧٠٠٠ دینار

